سەلام ناوخۆش

ڕەخنەی (ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلامی) -2

# کوردستانی ساسانی و کوردستانی ڕۆمی



لە سەردەمی پێغەمبەرو خەلیفەکانی ڕاشیدین دا




بەرگی یەکەم

التفسير

منتدى إقرأ الثقافي

کوردستانی ساسانی و
کوردستانی ڕۆمی
لە سەردەمی پێغەمبەر و
خەلیفەکانی ڕاشیدین دا

- بەرگی یەکەم -

سەلام ناوخۆش

**بڵاوکردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
**نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ**
زەردەشت کاوانی
جمعە صدیق کاکە
**خـەتی بـەرگ**
نـەوزاد کۆیـی
**قەبارەی کتێب**
١٧×٢٤- ( ٤٤٨ ) لاپەڕە
**نۆرە و ساڵی چاپ**
یەکەم ١٤٣٨ ك - ٢٠١٧ ز
**تـــیراژ**
١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپاردنی (١٧٦) ی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ڕەخنەی :
{ ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلامی } (٢)

# کوردستانی ساسانی
# و
# کوردستانی ڕۆمی

## لە سەردەمی
## پێغەمبەر و خەلیفەکانی ڕاشیدین دا

ئەم کتێبە هەر تەنیا گێڕانەوە نییە، بەڵکو توێژینەوەیەکی
مێژوویی و شرۆڤەکردنیشە بە پێوەری قورئانی

- بەرگی یەکەم -

نووسینی
سەلام ناوخۆش

# چەمکی ڕەخنەی
# ( ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلامی )

نزیکەی بە قەد سەدەیەك دەبێت، گەر زیاتر نەبێ، قەڵەمداری کورد قسە لە سەر پرۆسەی فتوحات دەکات و دەکات . ئەو قسەکردنە هەندێك جار بە ئاقار و تخوبی دەقی قورئانیش دادەچێت!

لە دوای ڕاپەڕین ئەو تەوژمە هەر لە دەرەوە نەمایەوە، بەڵکو سنوری زانکۆشی بڕی، بە تایبەتی لە ژێر ئیدارەی کوردی، فتوحات بووە بابەتی چەند ماستەرنامەیەك.

بەندە لە ساڵی (١٩٩٣) بە وتارێك دەرگای ڕەخنەی ( ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلامی )-م کردەوە، هەتا (٢٠٠٣) شتێکم لە سەر ئەو بابەتەوە نەنووسی، هەتا لەو ساڵەوە بە کتێبێك هاتمەوە مەیدانەکە، هەندێ مامۆستا لە پێش و دوای منەوە، لەو ڕەخنانەی لە فتوحات دەگیرا بە جواب هاتن، بەتایبەتی مامۆستا: (حەسەن مەحمود و فازل قەرەداغی و کەسانی دی ...)، بە جۆرێك چەندان کتێبیان لە سەر ڕەخنەی ( ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلامی ) بڵاوکردەوە، بە تایبەتی کتێبی: (کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی )ی مامۆستا حەسەن،کە پرۆسەی ڕەخنەی ( ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلامی )بە کورد ئاشناتر کرد.

ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلامی، پشت ئەستوور بوو بە بزاڤی ڕۆژهەڵاتناسی و کەلتووری کوردی، وەك هەبوونی: دۆڵی کافران و دۆڵی شەهیدان و گۆڕی سەحابەکان!!

بەڵام هەرچی ڕەخنەی ( ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلامی )یە، لە دوای ڕاپەڕینەوە دەرکەوت.
ئەم کتێبەش بەرهەمێکی دی ئەو تەوژمە ڕەخنەکارییە، لە ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلامی.

لە لایەکیتر، لە پرسی فتوحاتدا،ئێمە( تێکست )و(کۆنتێکست)مان هەیە. تێکستی وەك: (قورئان ) و (فەرموودە ) و(وتەی ئەبوبەکر ) و (وتەی عومەر)، هەموو جەخت لە سەر ئەوە دەکەن: ( ئیمان بە زۆر و خورتی لە دڵی تاکەکان ناچەسپێ، بۆیە گرینگە بە گوفتار و ڕەفتار دڵیان بگرن، نەك خاکیان) ...(لە پرۆسەکەدا منداڵ و ژن و پیرەمێرد و قەشە و مالم و موغەکان مەکوژن، هەتا دار مەبڕنەوە) ..(خودایە من تەمەنام دەکرد لە بەینی ڕەشەخاکی عیراق و کوردستاندا چیایەك لە ئاگر هەبوایە..).
کەچی لە کتێبی مەسیحییەکان، دەربارەی دژەکانیان هاتووە : "پەرستگاکانیان لەنێوبەرن، پایەکانیان بشکێنن، دارەکانیان لە ڕەگەوە دەربهێنن، بتەکانیان بسوتێنن، گەلەکان لە نێوبەرن، بە تایبەتی ئەو گەلانەی( یەهوە) ئامۆژگاریت کە بەبێ بەزەیی لە ناویان بەرن(زیگفرید ٢٠٠٩،ل٨٦ )."

زۆربەی کۆنتێکستە مەکانیەکانی شەڕگە، ڕەنگدانەوەی ئەو تێکستەتانەی سەرەوە بووە، بەڵام لێرە و لەوێ، بۆ نموونە: وەك ڕوداوەکەی: (الاشجعی و کوردەکان ) ڕوویداوە، بەهیچ جۆرێك گوزارشت لە گوتاری مرۆڤانەی ئیسلام ناکەن، ڕوداوی لەم جۆرە، لە نێوان خودی عەرەبەکانیش ڕویداوە، ئەوەتە کوشتنی کەسێك لە جەنگدا، کە وتی: (لا الە الا اللە) پێغەمبەری زوێرکرد، هەروەها زویربوونی (ئەنصار) لە دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگ، یا ئەو کۆچەرییەی بە پێغەمبەری وت : موحەممەد! لە دابەشکردنی داهاتی جەنگ دادگەربە!! ئەمانە هەمووی لە کۆمەڵگای عەرەبی ڕویداوە.

## بەناوی خوای گەورە

## دەروازە

پرسی فتوحات، پرسێکە زۆر ڕەهەند و خوێندنەوەی جیا لە خۆدەگرێت. لە دوای شیعری کلاسیکی کوردی، تەرزە عەلمانیەتێك دروست بوو، لە ئەدەب و سیاسەت و هزر، وەك تەنێکی نامۆ لە جەستەی کوردی، مامەڵەی لەگەڵ دەقی قورئان دەکرد. ئەو بە غەوارە دیتنەی ئیسلام، بە تایبەتی فتوحاتی ئیسلامی لە هەرێمە کوردییەکاندا، تەواوی مێژووی سەدەی بیستەمی گرتبۆوە.

## تایتل - ناونیشانی توێژینەوە

کوردستانی ساسانی و کوردستانی ڕۆمی و کوردستانی ئەرمینی لە ماوەی (٩ك-٤٠ك)، تایتلی توێژینەوەکەمە، کە گوزارشت لە کاتێکی هەستیار لە بزاڤی ئیسلام و مێژووی کورد دەکات ، ئیسلام لە زەمەنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، بە دروستی لە ساڵی (٩ك)، هەڕەشەی دەرەکی ( ڕۆمی ) لێکرا، هەروەها لە ماوەی (١٦-٤٠) دا، کورد شوناسی قەومی خۆی دۆزیەوە و بووە ژمارەیەك لە ژمارەکان.

## ئامانجی توێژینەوەکە

**توێژینەوەکە زۆر ئـامـانـجـی لـە خـۆگرتووە، لـەوانە:**

١- دۆزینەوەی هۆکاری دروسبوونی فتوحاتی ئیسلامی، لەوانە: فتوحاتی هەرێمە کوردییەکان،

٢- دیاریکردنی ماهیەتی ئایەتی: ( لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ).

٣- دۆزینەوەی بەرایی شوناسی کوردی لە نێو کەلتوری فارسیدا.

٤- ساخکردنەوەی چەمکی:"وڵاتی کوردان"، کە تەنیا لە ماوەی (٩ك-٤٠ك) بۆتە وڵاتێکی یەکگرتوو .

## گریمانی توێژینەوە

**لە پرسـی فتوحـات، یا بردنـەدەرەوەی ئیسـلام بۆ دەرەوەی نیمچـەدوورگەی عەرەبیدا، چەند گریمانیەك ئامادەگیان هەیە:**

١- ڕەوشی داگیرکراوی وڵاتی کوردان، پێش هاتنی ئیسلام وەك: کۆلۆنیالێکی نێونەتەوەیی وابووە، بە دەست: (ساسانی و ڕۆمی و ئەرمەنی)، لەولاوەش گوتاری پڕ ئینسانی قورئان و کاراکتەری قورئانی، هارمۆنیەتێکی تەبایی بە ماوەکە دەدەن.

٢- ماوەکە، ماوەی ئیسلامی عەقیدەیی بوو، بۆیە پاش ڕوخانی دەسەڵاتی عەباسی، کورد وازی لە ئیسلام نەهێنا.

٣- باوەڕمان وایە، کە قورئان هەڵگری پەیامی عالەمیبوونە، لە سەر بنەمای یەکتر خوێندنەوە، نەك سڕینەوەی (ئەویتر).

٤- جۆری دین، پەیوەندی بە ڕەوشی ئاشتی و شەڕەوە هەیە، توێژینەوەکە گریمان دەکا، کە هەرێمەکانی کوردستانی ساسانی زەردەشتی، زیاتر بەرەنگاری ئیسلام-ی کردووە، هەرچی کوردستانی بندەستی ڕۆمییە، ئەوا زۆربەی هەرە

زۆری، هەر تەنیا لە خەلیفایەتی عومەر کوڕی خەتتاب (١٣-٢٤) بە صوڵح و ئاشتی فەتح کراون.

## میتۆدی توێژینەوەکە

زۆر میتۆد لە بارەی نووسینی ئەکادیمی لە زانکۆ هەن، میتۆدی ئەم توێژینەوە، دوورە لە میتۆدی (طبری) و ئەوانەی بەر خۆی، بەڵکو میتۆدێکی شرۆڤەکارییە، کە لە سەر وەسفی ڕوداو و شرۆڤەکردنی ڕوداو، بەپێوەری پرانسیپەکانی قورئان دامەزراوە، هەروەها لە بارەی شێوازی نووسینی ئەکادیمی لە سەر مەتن نووسی و ژێدەر نووسی (هارڤارد) دامەزراوە .

# دەروازەی
# بەشی یەکەم

کوردستان، تەنیا لە سەردەمی میدییەکان یەکگرتوو بووە، گەرنا، هەر لە کودەتای ئەخمینیەکانەوە لە (٥٤٩پ.م)، هەتا (٦٥١)ی میلادی، ڕوەتی ڕوداوەکان بە زیانی کورد تەواوبووە .

( ئەخمینی ) و (سلوکی ) و (ئەشکانی ) و (ساسانی )، جگە لە بەردەوامی داگیرکردنی کوردستان، ماڵوێرانی جەنگەکانیشی بەدوای خۆیٰ دەهێنا، چونکە شەڕگەی ئەو هێزانە، و هێزی ڕۆمی بوون.

ئەخمینی و ئەشکانی و ساسانی، نەتەوەی دەوروبەر بوون، بەڵام (سلوکی )، یۆنانی بوون، بۆیە هەر داگیرکەری خاکی (ئێران)ی نەبوون، بەڵکو داگیرکەری ئایینی (ئێران)یش بوون.

پرسەکە هەر پرسی خاك نەبوو، بەڵکو (کەلتوور)یش فاکتەرێکی دی پرسەکە بوو، لەو هاوکێشەیەدا کورد لە دەرەوەی مێژوو بوو، چونکە شوناسی لەدەست دابوو.

بەشی یەکەم لە چەند سەرباسێکدا تاوتویٰ دەکەین، لەوانە:

# کاریگەری شەڕی ئەشکانی - ڕۆمی لەسەر کوردستان

زۆربەی سەرچاوەکان جەخت لە سەر ئەوە دەکەن، کە ئەشکانییەکان لە ڕۆژهەڵات، کۆتاییان بە دەسەڵاتی سلوکیەکان هێنا. پاش سەرکەوتنی ئەشکانییەکان بە سەر سلوکییەکان، ئیمپراتۆریەکی ئێرانی لە ڕۆژهەڵات دروستبوو.

ئەشکانییەکان لە سەرچاوە عەرەبیەکان دا، بە (فیرسیەکان) ناسراون، (تەها باقر)( ١٩٨٠، ل١٩١-١٩٣) باس لەوە دەکات، کە لە ماوەی (٢٤٧ پ.م)، هەتا (٢٢٦) ی میلادی (٣٧) پاشا حوکمی دەڤەری ڕۆژهەڵاتیان کردووە .
بە قسەی (تۆفیق وەهبی) لە بنەچەی کوردان، دوا پاشای ئەشکانی:(ئەردەوانی پێنجەم) بووە، کە (ئەردەشێر)ی دامەزرێنەری فەرمانڕەوایی فارسی، لە (٢٢٦) کوشتی و کۆتایی بەو دەسەڵاتە هێنا .
( تەها باقر) و ئەوانی دی (١٩٨٠)، لە (ل١٩٣) کتێبی:( تاريخ ايران القديم) و قەحتان و صلاحەدین حەیدەری(١٩٨٦) لە (ل١٣٥) ی کتێبی: (دراسات في التاريخ الساساني)..ناوی دوا پاشای ئەشکانی بە :(ارطباني) پێنجەم دەبەن.

هەرچەندە (ئەسکەندەری مەکدۆنی) تەنیا( ١٣) ساڵ حوکمی کرد، بەڵام توانی دارای سێیەم، پاشای ئەخمینییەکان (٣٣٥-٣٣١پ.م) لە شەڕی (ئەربێلا) لە (٣٣١ پ.م) ببەزێنی و کۆتایی بەحوکمی :(ئەخمینی - هیخامەنشینی ) بێنێ، بەڵام ئەو هێخستنە پرسی ململانێی( فارسی - ڕۆمی ) بە جۆرێك قووڵتر کردەوە، ئەو دوو بەرەیە نزیکەی (٩٠٠) ساڵێك دژی یەك بن.

ئەو دەرکەوتنەی (ئەشکانی)، بەبێ باج لە سەر کورد تێنەپەڕی، خەسرەو گۆران (٢٠٠١) لە (ل١٢٠-١٢٣) باس لەوە دەکات، کە بە هۆی دابەشبوونی کورد لە نێو (سلوکی و ڕۆمی و ئەشکانی)دا، زیانێکی زۆری لێکەوتوە، بۆ نموونە: لە شەڕی: (ڕۆمان و سلۆکی) لە (١٩٢-١٨٨) تیرە و هۆزەکانی دیکەی (ماد) و کورد دایانە پاڵ پاشای (سلۆکی).

لە شەڕی (١٩٠ی پ.م)، لەشکری (سلۆکی) لەگەڵ کورد لە بەرانبەر ڕۆمانەکان شکان، کەچی (ماد)ە کوردەکان لە شەڕی (١٧١ پ .م) دژی پاشای (سلوکی) بوون، هەروەها لە سەردەمی فەرهاد دا (١٣٨-١٢٥) ئەشکانییەکان بە سەر هەرێمی: (فارس و عیراقی عەجەمی و ئەقلیم جیبال و بەشێك لە ئەقلیم جەزیرە .....)زاڵ بوون" پاش ئەو هەموو سەرکەوتنەی (ئەشکانی) بە سەر (سلۆکی) و (ڕۆمی)، شەڕی: ئەشکانی و ڕۆمی دروستکرد. لەو شەڕانەدا، (ئەشکانی) ویستی سنوورێك لە نێوان هەردوولا دروست بکات .

تەها باقر (١٩٨٠)، لە (ل٩٧)ی (تاریخ ایران القدیم) دەڵێت : "ئەشکانییەکان ( فورات )یان کردە خەتی یەکلاکەرەوەی دەوڵەتی (ئەشکانی) و ڕۆژئاوا، هەروەها بۆ دەستبەسەرداگرتنی هێڵی بازرگانی گرینگ لە ئەقلیمەکانی ڕۆژهەڵات و عیراق ....، شاری ( حەزەر ) لە بادیە لە وڵاتی نێوان دوو زێ وەك لەمپەرێك دروست کرد بۆ ڕێگرتن لە پێشوەچوونی ڕۆمی لە (بادیە) ."

سەلامەتکردنی ئەو لایەی دەوڵەتی (ئەشکانی) بەس نەبوو، پێویست بوو، سنووری ڕۆژئاوا زامن بکات . (ئەشکانی) دەڤەری ڕۆژهەڵات و عێراقی، تەواو لە (سلۆکییەکان) پاککردەوە، بۆیە پێویست بوو سنووری ڕۆژئاوا لە هەڕەشەی هێزەکانی (ڕۆم) بپارێزێت، ئەو نێوەندەش، باکووری کوردستان دەگرتەوە .

تەها باقر (١٩٨٠)، (ل٩٧) دەڵێت : "زۆربەی شارەکانی:( ئەقلیم جەزیرە و نصێبین، حەران، ڕەها، ئامەد..) ببوونە شوێنی تەڕاتێنی ئەشکانی و هێزەکانی ڕۆژئاوا ."

شەڕی ڕۆمان و ئەشکانی لە ڕۆژئاوا، هەتا بەرایی سەدەی (سێی) میلادی

درێژەی هەبوو .تەها باقر لە (ل١٠١) دەڵێت : "دوا شەڕی نێوان ئەردەوانی پێنجەم و ئیمپراتۆڕ (مکرنیوس) لە (نصێبین) ڕوویدا، ئەویش بە پەیمانی ئاشتی کۆتایی پێهات ."

## شەڕی ساسانی - ڕۆمی

شەڕی نێوان ئەشکانی و ڕۆمی، دەرگای لە سەر چەند کێشەیەکی ناوخۆوە دروست کرد، بنەماڵەی زەردەشتی ساسانی، لە هەناوی ئیمپراتۆریەتی ئەشکانی دووبارە دروست بوونە، کە خۆیان بە میراتگری ئەخمینییەکان، دوژمنی باوەکوشتەی (مید)ی و (ئەشکانی) دادەنا .

ئەردەوانی پێنجەم، پاشای ئەشکانی وەك: (طبری) دەگێڕێتەوە لە مێژووەکەی، هێرشی توندی کردۆتەوە سەر (ئەردەشێر بابەکان) دەڵێت : "ئەی کوردی گەورەبووی ناو ڕەشماڵی کوردی ."

ئەفسووس هەندێ نوسەری کورد، ئەو قسەی طبری دەکەنە بەڵگە بۆ کوردیبوونی (ئەردەشێر) ! چەندان بەڵگە هەن، کە (ئەردەشێر) فارس بووە :

١- خودی (ئەردەشێر) باسی شەڕ لەگەڵ (مید)یە کوردەکان دەکات.

٢- لە ڕێگای وەرگێڕانی کتێبەکەی (ئەردەشێر) لە لای (بەلازری)، ناوی کورد لە دنیا بڵاوبۆوە !

٣- تۆفیق وەهبی لە (١٩٦١) لە نامیلکەیەکدا بەناوی: (بنەچەی کوردان) باس لەوە دەکات، کە (ئەردەشێر) لە ماوەی (٢٢٤-٢٢٦) زیاتر لە هەزار (مید)ی و پاشاکەی کوشتوون، هەروەها هەر لەو کتێبەدا ئاماژە بەوە دەکات، کە (ئەردەشێر) مەبەستی بووە "فەرمانڕەوایەکی فارسی" دابمەزرێنێت.

٤- لەو هەموو پاشایەی ساسانی، ئەردەشێر، تا یەزگورد (٢٢٦) هەتا (٦٥١)

یەکێکی کورد نەبووە.

٥- ئەو قسەیەی (ئەردەوانی پێنجەم)، جوێن و کەمکردنە، چونکە زۆربەی کورد لە دوای کودەتای (کۆرش)( ٥٤٩ پ .م) - هوە بوونەتە ڕەوەند و دوورخستنەوە لە دەسەڵاتی شار، بۆیە بە کۆچەری فارس ناسراوبوون !

دەسەڵاتی ساسانیش، وەك دەسەڵاتی ئەشکانی، بە جۆرێك لە زەمەنی ئەردەشێری دامەزرێنەرەوە، هەتا زەمەنی: (پوران شا) (٦٢٨) هەر بەردەوام لەگەڵ ڕۆمەکان لە شەڕ بوو .

خەسرەو گۆران (٢٠٠١)، لە (ل ١٥٠) باسی شەڕێکی ساسانی لەگەڵ ڕۆم دەکات، کە توانی کوردستان لە (ڕۆم) پاکبکاتەوە : " لەگەڵ دەسپێکی (٢٣٧) ی میلادیدا، فارسە ساسانەکان هەڵیان کوتایە سەر کوردستان و (میسۆپۆتامیا) هەر چ سەنگەر و مەتەرێزی ڕۆمانی هەبوو لە ناوچەکەدا، هەموویان ڕامالّی و پاك کردەوە ." (نرسی) کودەتاچی لە سەر برازای شکۆیەکی پێدا و لە باشووری کوردستان و لە شوێنێکی سەرەڕێ لە نەقشێکدا سەرکەوتنی خۆی لە پەیکۆلی هەڵکۆڵی، ئەو سەرکەوتنە ناوەکیە، پەلکێشی شەڕی دەرەکی کرد - کەلسومە، نەقشی پەیکۆلی، بۆیە لە (٢٩٧) لە بەرانبەر ڕۆمەکاندا زۆر شوێنی ستراتیژی کوردستانی لە دەستدا .

گۆران لە (ل١٥٩) باسی شەڕێکی نێوان ساسانی و ڕۆمی دەکات، کە زۆر کاریگەری لە سەر کوردستان هەبووە: " (تزار یولیان) لە( ٣٦٣) ویستی لە ڕێگای دەریاوە دربێکی کوشندە لە شاپووری دووەمی ساسانی بدات، بەجۆرێك نزیك شورای (تەیسەفۆنی) پایتەختی ساسانەکان بوونەوە، بەڵام سەختی شوراکان نائومێدی کردن، بۆیە بەرەو عیراقی عەجەمی ( باشووری کوردستان) هاتن و، لە کفری شەڕێکی گەرم هەڵگیرسا، تێیدا (تزار یولیان) کوژرا و شەڕەکە بە کەوتنی ڕۆمەکان تەواو بوو، ناچاربوو ملکەچ بێ بۆ مەرجەکانی ئاشتی، لەوانە:

١- پێنج ویلایەتە داگیرکراوەکەی فارس بگەڕێنێتەوە.

٢- هەردوو قەڵای (نسێبین) و (سنجار) بە دەوڵەتی ساسانەوە بلکێندرێن.

٣- (ئەرمینیا) چی تر بەشێك نەبێ لە قەڵەمڕەوی ڕۆم ."

ئەو هەموو سیاسەتی ڕەقکاری نێری ساسانی (٢٢٦-٦٢٨)، کە زیاتر لە چوار سەدە بوو، تەواو دەوڵەتی ماندوو کرد، بە جۆرێك ڕەگەزی نێر لە نێو بنەماڵەی ساسانی نەما، (موغ)ە ڕەق و توندهاژۆکان، ناچار بوون دەقی (ئاوێستا) بگۆڕن هەتا (پورانی خەسرەو پەروێز) کچی شیرینی مەسیحی ببێتە پاشای ساسانی . لێرەدا درزێکی گەورە لە دەسەڵات دروست بوو :

١- مێیەك بووە پاشا، کە پێچەوانەی دەقی (ئاوێستا) بوو.

٢- ئافرەتێکی دایك مەسیحی، بووە پاشا.

گۆران لە (ل١٦٢) لە حوزنی موکریانی دەگوازێتەوە: ئازاد، کە لە سەرچاوە ئێرانییەکان ناوی: (یەزگوردی کوڕی شاپووری سێیەم) بە گوناهکار دێت کە:

١- لە ئاستی ئایینەکانی غەیرە زەردەشتی نەرم بووە.

٢- سنوورێکی بۆ ڕەقەکاریی زەردەشتی دانا.

٣- ئازادی ئایینی لە ئیمپراتۆریەت بڵاوکردۆتەوە."

بۆیە هەرزوو پیاوانی کۆشك، هەردوو خوشك: (پوران شا ) و ( ئازەرمیدۆخت) یان تیرۆر کرد .

شەڕی ساسانی و ڕۆمی، هێندە قورس و ئایدیۆلۆژی بووە، قورئان لە سوڕەتی - الروم -دا ئاماژەی پێداوە .

ئەو هەموو شەڕەی ساسانی لەگەڵ ڕۆم، بە پێچەوانەش نەیانتوانی یەکتر بشکێنن و کۆتایی بەیەکتر بێنن، کەچی لەشکری ئیسلام لە ماوەی (١٦)ی کۆچی، تا (٣٥)ی کۆچی کۆتایی بە دەسەڵاتی هەردووکیان هێنا .

# حوکمڕانیەتی ساسانی

دوای سەرکەوتنی ئەردەشێر بابکان بە سەر ئەردەوانی شای ئەشکانییەکان و میدییەکان، لە ماوەی ساڵی (٢٢٤-٢٢٦)، ئیمپراتۆریەکی زەردەشتی دامەزراند، کە زیاتر لە چوار سەدەی خایەند لە (٢٢٦-٦٥١)ی میلادی . چەندان سەرچاوەی وەك: (طبری و تەها باقر و نەصر کعێبی) - (١٧٣-١٧٤) ئاماژەیان بە ناوی پاشایەکانی ساسانی کردووە، بەڵام هەموویان لە هەندێ قۆناغدا، وەك یەك نیین، بۆیە ئێمە هەوڵمانداوە بە پاڵشتی هەندێ سەرچاوەی ترەوە، ناوی پاشاکان دروستر وەك خوارەوە ڕیز بکەین، هەروەها لەم ناوهێنانەش، مەبەستی خۆمان هەیە:

١- ئەردەشێری بابکان - ئەردەشێری یەکەم (٢٢٤-٢٤١) میلادی.
٢- شاپووری یەکەم (٢٤١-٢٧٢).
٣- هورمزی یەکەم (٢٧٢-٢٧٣).
٤- بەهرامی یەکەم (٢٧٣ - (٢٧٤ )-٢٧٦) .
٥- بەهرامی دووەم (٢٧٦-٢٩٣).
٦- بەهرامی سێیەم (٢٩٣-٢٩٣) .

پاش نزیکەی (٧٠) ساڵ ململانێکانی ناو بنەماڵەی دەسەڵاتی ساسانی، بەرەو کودەتا و شۆڕش دژی یەکتر چوو، بەجۆرێك (نرسی شاپوور) شۆڕشی دژی بەهرامی سێیەم کرد، کە برازای بوو . ئەو خۆ بە شەرعی زانیەی، لە نەقشی پەیکۆلی لە عیراقی عەجەم گوزارشت لێکرد.

٧- نرسی شاپوور (٢٩٣-٣٠٢).

٨- هورمزی دووەم (٣٠٢-٣٠٩).

٩- شاپووری دووەم (٣٠٩-٣٧٩).

١٠- ئەردەشێری دووەم (٣٧٩-٣٨٣).

١١- شاپووری سێیەم (٣٨٣-٣٨٨).

١٢- بەهرامی چوارەم (٣٨٨-٣٩٩).

لێرەوە وشەی: (کەرمانشاه) دروست بوو، چونکە پێشتر بەهرامی چوارەم، شای (کرمان) بوو، ناوی شارەکە بووە کەرمانشاه !

١٣- یەزگوردی یەکەم (٣٩٩-٤٢١).

١٤- بەهرامی پێنجەم(٤٢١-٤٣٩).

١٥- یەزگوردی دووەم (٤٣٩-٤٥٧).

١٦- هورمز سێیەم (٤٥٧-٤٥٩).

١٧- فەیرۆزی یەکەم (٤٥٩-٤٨٤).

١٨- بلاش (٤٨٤-٤٨٨).

١٩- قوبادی یەکەم (٤٨٨-٤٩٧).

لە دوا ساڵەکانی حوکمڕانیەتی (قوباد) لە ماوەی: (٤٩٧-٤٩٩) کورسی دەسەڵات داگیرکرا و دوو کەس بەناوی: (جاماسپ) (٤٩٧-٤٩٩) و (بەهرام چۆپی) دەستیان - بەسەر دەسەڵاتی (ساسانی) داگرت .

٢٠- جاماسپ (٤٩٧-٤٩٩).

٢١- قوبادی دووەم (٤٩٩-٥٣١).

٢٢- نەوشێروان کیسرا (٥٣١-٥٧٩).

٢٣- هورمزی چوارەم (٥٧٩-٥٩٠).

٢٤- پەروێزا، یان کیسرای دووەم (٥٩٠-٦٢٨).

٢٥- بەهرامی شەشەم (٥٩٠-٥٩١).
٢٦- بیستام (٥٩١-٥٩٥).
٢٧- بەهرامی شەشەم (٥٩١-٥٩٢).
٢٨- قوبادی دووەم (٦٢٧-٦٢٨).
٢٩- ئەردەشێری سێیەم (٦٢٨-٦٢٩).
٣٠- بوران خەسرەو (٦٢٩-٦٣٠).
٣١- فیرۆزی دووەم (٦٣٠-٦٣٠).
٣٢- ئازرەمی دۆخت (٦٣٠-٦٣١).
٣٣- کیسرای چوارەم (٦٣١-٦٣٢).
٣٤- فیرۆزی چوارەم (٦٣١-٦٣٢).
٣٥- یەزگوردی سێیەم (٦٣٢-٦٥١).

**دەپرسین ئەوانەی بانگەشەی کوردیبوونی ئیمپراتۆریەتی ساسانی دەکەن، وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە :**

١- لەو (٣٥) پاشایە، ناوی تەنیا پاشایەکی کوردم پێ بڵێن؟!!

٢- ئەو ئەردەشێرەی، کە ئیمپراتۆریەتی ساسانی دامەزراند، ئەدی سەدان کوردی نەکوشت و ئەسیر کرد، هەروەها پاشای کوردیشی نەکوشت؟! گەر باوەڕناکەن نامیلکەی بنەچەی کوردی....تۆفیق وەهبی، بخوێننەوە؟

٣- بە کوردی خوێندنەوەی ئیمپراتۆریەت بە قەد گەردیلەیەك، بەڵگە و ڕەفتاری ساسانی نایخوێنێتەوە، هەبوونی ئەو هەموو پەیکەرەی ساسانی، لە کوردستانی بندەستی ساسانی، تەنیا یەکیان گوزارشت لە کورد دەکات ؟!
فەرموو، ئەوە پەیکەری پەیکۆلی ...

# جیاوازیی زەردەشتیەت و مەجوسیەت
# بە بەڵگەی شوێنەواریی

بەر لەوەی قسە لە سەر فتوحات بکەین، با بزانین ڕەوشی ئایینی کوردی چۆن بووە؟

ئایا ڕاستە کورد هەموو زەردەشتی بوونە؟.

ئەو سێ ڕیفۆرمەی لە هەناوی حوکمڕانی زەردەشتیەت دروستبوو، پشکی کورد تێیاندا چەند بوو؟.

وەڵامی ئەو پرسیارە، لە کۆتایی شرۆڤەکردنی ڕەوشی ئایینی کوردی وەڵام دەدەینەوە، جارێ هەر تەنیا جیاوازی لە نێوان پرسی: (زەردەشتییەت) و (مەجوسییەت) دەکەین، چونکە لێرە و لەوێ بەمەبەست زۆر تێکەڵ یەك دەکرێن.

ئەو تێکەڵکردنە لە دوو ڕەهەندەوە سەرچاوە دەگرێ:

١- ڕەهەندی ئایدیۆلۆژی.

٢- ڕەهەندی نەزانیی.

لەم کورتە نووسینەدا هەوڵدەدەین لەسەر بنیاتی دوو بەڵگەی شوێنەواریی دوو ماوەی جیاواز، کە ڕاستەوخۆ لە زمانی شوێنەوارەکە تەرجەمەی ئینگلیزی کراون، بەندەش لە زمانی ئینگلیزی وەرگێڕاون.

## بەرایی پرسەکە

لەم دواییەدا خەریکی نووسینەکانی (شاخی بێستوون) و نووسینی نەرسی شاپوور لە (پەیکۆڵیی) بووم،کە یەکەم: نزیك شاری (کرمەشان) و، ئەوی دووەم: لە باشووری کوردستانە.

ئەو دوو نووسینە شوێنەوارییە، ڕاستەوخۆ لە یونیفۆرم (مێخەکی) و (فارسی ناوەند و پارسی) تەرجەمەی ئینگلیزی کراون.

لە نووسینێکدا پێشبینی ئەوەم کردبوو، کە زەردەشتی تێکستیی (دەقیی)

لە سەردەمی حوکمڕانی میدیاکان سەریهەڵداوە، ئەوەشم تەنیا بۆ ئەوە بوو: شکۆمەندی بۆ (میدیەکان) بگەڕێنمەوە. لە لایەکی تریش هێدمە گرتمی، کە نووسینی (پەیکۆلیی)م بە ئینگلیزی بینی، چونکە نووسینەکە لە بریتی زەردەشتی (مید)ی، باس لە زەردەشتی ساسانی، بە فۆرمی (فرە خوایی) نەك (تاك خوایی) دەکات، هەروەها باس لە (دەسەڵاتی ساسانی) لە (خاکی میدیا) وەك: (شارەزوور) و (گەرمیان) دەکات.

## زەردەشتیەت و حوکمڕانی میدییەکان :

ماوەی دەرکەوتنی ( زەردەشت) بە هەقایەت و چیرۆکی بەرئاگردان و، کتێبی بێ (دۆکیومێنت) قسەی زۆری لەسەر کراوە . هەندێ کتێب مێژوویێکی زۆر دوور بۆ دەرکەوتنی (زەردەشت) دیاریدەکەن، وەك زانیارییەکانی ناو کتێبی: (ماری بۆیس )(مێژووی زەردەشتیەت)، هەندێکی تر ئەو مێژووە زۆر نزیکیدەکەنەوە، وەك بەرگی یەکەمی کتێبەکەی صدیق بۆرەکەیی: (مێژووی وێژەی کوردی) وەك دەڵێت: " - هرتل -لای وایە: زەردەشت لە دەوری - ویشتاسپی هەخامەنشیدا لەدایك بووە و( لمان و هاوپت) بیروڕای ئەوەیە، کە زەردەشت لە زەمانی داریووشی هەخامەنشیدا سەری هەڵداوە ". بە واتای لە (٥٢٢)ی پێش میلاد.

دوای وردبوونەوە لە نووسینی کۆنی ئەخمینییەکان لە شوێنە جیاجیاکانی: (میدیا) و (فارستان)، بەوە گەیشتووم: ئەوەی لە (مێژووی بێ ئارگیومێنت) هەڵێنجاومە لە (نووسینی شوێنەواری فارسی) بە ئاشکرا ئامادەبوونی هەیە، بە تایبەتی نووسینی شوێنەواری: (لەوحەی زێڕ) فارسی لە ماوەی حوکمڕانی (مید)ی هەبووە.

(ڕالف نۆرمان شارپ) لە (ل٢٠)ی( چاپی ئینگلیزی ) کتێبی: "نووسینە هەڵکۆڵینەکانی فارسی کۆن بە زمانی (مێخی) لە ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی" وێنەیەکی (مێخی) و ئینگلیزی، ئاماژەی بە نووسینێکی شوێنەواری ( ئاریارامنێس شای ئەخمینی) سەردەمی حوکمڕانی (کەی خەسرەو)ی (مید) ی کردووە.

## بەڵگەی شوێنەواری یەکەم:

ئەم بەڵگەیە دوو شت ساخ دەکاتەوە، دەقەکە زۆر کۆنترە لە نووسینی شوێنەواری شاخی (بێستوون)، ئەوەش واتای ئەوە دەگەیەنێت، کە (ئاهورامەزداپەرستی) زۆر لەپێش (ئاهورامەزدا پەرێسی) داریوشی ئەخمینی بوونی هەبووە.

تەها باقر و هاوەڵانی (١٩٨٠) لە (ل٣٧)ی (تأریخ ایران القدیم) دەنووسن، کە لە کاتی هەڵمەتەکانی ئاشووری، لە سەدەی نۆی پێش میلاد بۆ سەر ئێران، فارسەکان لە ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژئاوای دەریاچەی (ئورمێ) نیشتەجێ بوون.

میدیەکانیش لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ناوچەی هەمەدان." لە کاتی دروستکردنی دەوڵەتی میدی لە بەرایی سەدەی (هەشت)ی پێش میلاد، بەشی عیراقی عەجەمی و ئەقلیم (جیبال) کەوتە بەردەستی حوکمی ڕاستەوخۆی میدیەکان، فارسەکانیش دەڤەری (فارستان)یان بەرکەوت، بەو مەرجەی دان بە سەروەری میدیەکان بنێن. (خەسرەو گۆران (٢٠٠١) کوردستان لە مێژوودا، ل٧٠)

**ئەم لەوحەیە، لەوحەیەکی پاشای فارسی سەردەمی حوکمڕانی کەی خەسرەوی میدییە، لە دەقە شوێنەواریەکەدا هاتووە:**

Ariaramnes, the great king, the king of kings, the king in Persia, 1.4" the son of Teispes the king, the grandson of Achaemenes.

" ئاریارامنێس پاشای مەزن میری میران پاشای فارستان، کوڕی تێسپس پاشا حەفیدی ئەخمینییەکان.

Ariaramnes the king says:" this country Persia, which I hold, 2.9 which is possessed of good horses, good men, on me the great God Ahuramazda bestowed (it).By favour of Ahuramazda I am the king (in) this country.

Ariaramnes the king says : May Ahuramazda bear me aid !" 9.11

ئاریارامنێس پاشا دەڵێ: وڵاتی (فارستان)، کە من پۆستەکەم وەرگرتووە، خاوەنی ئەسپی باش و مرۆڤی باشە، (ئاهورامەزدا) بە منی خەڵات کردووە، بە چاکەی (ئاهورامەزدا)، من پاشای ئەم وڵاتەم .

ئاریارامنێس دەڵێ : ئاهورامەزدا هاریکارم بێ."

(ئارنۆلد ویلسن) و (دیاکۆنۆف)..باس لەوە دەکەن، کە حوکمڕانی میدیەکان، زۆر دیموکراسی بووە، چەندەها نەتەوەی لە خۆ گرتووە.

دکتۆر (ستیفن مانسفیلد) و (دۆگلاس لەیتۆن) لە (ل١١)ی کتێبی: Searching for Democracy from Media to America.

دەنووسن: "میدییەکان دەرفەرتێکیان بە عەشیرەتە هاوسێکانیان دا، کە هاوبەشی لە بەڕێوەبردنی ئەو زەویەی لەسەری دەژین، بکەن."

بەپێی ئەو شوێنەوارەی لە (نەمرود) لەلای نێردەیەکی بەریتانی لە (١٩٥٥) دۆزرایەوە: دەوڵەتی میدی، لەسەردەمی (فراوەرتیسی یەکەم) زۆر بەهێز بووە بە جۆرێك (ئەسەرحەدونی پاشای ئاشووری) نێردەی هاوڕێیەتی بۆ لای ناردووە ... قەبائیلی فارسی یەکێك لەو قەبیلانە بوونە، کەبەشێك بوونە لە حوکمڕانی

میدی - (تەها باقر، ل٣٩-٤٠).

(مانسفیلد) و (لایتۆن) لە (دیاکۆنۆف) دەگێڕنەوە: کە میدیەکان لەنەزەر ئاشووریەکان، هێزێکی زۆر ئازا بوونە.

(تەها باقر) و (ئەنیدی) لە (ل٣٩-٤٠)ی کتێبی: (مێژووی کۆنی ئێران)، تەمەنی حوکمڕانی (فراوەرتیسی یەکەم) بە (٦٥٥-٦٣٣ پ.م) و تەمەنی حوکمڕانی کەی ئەخسار (کەی خەسرەو ) بە (٦٣٣-٥٨٤) دادەنێن.

پاش زانینی ئەم ڕاستیانە، با بزانین لەوحەکەی (ئاریارامنێس) لە چ سەردەمێك بووە. (شارپ) لە (ل١٨) دەنووسێت: (ئاریارامنێس) لە ماوەی (٦٤٠-٦١٥ پ.م)، کە حەفیدی ئەخمینییەکان و باپیرە گەورەی (داریوش)، حوکمڕانی لە دەڤەری فارسی کردووە." ئەم لەوحەیە لە ساڵی (١٩٢٠) دۆزرایەوە و ئێستا لە مۆزەخانەی (بەرلین)ە.

**کەواتە لێرەدا چەند خاڵێکمان بۆ ڕوون دەبێتەوە :**

١- دەڤەری فارسی لە ماوەی حوکمڕانی (ئاریارامنێس)، بەشێك بووە لە حوکمڕانی (میدی).

٢- (ئاریارامنێس) لە سەردەمی حوکمڕانی (کەی ئەخسار) بووە، بە شاهێدی: (تەها باقر و دکتۆر فەوزی رەشید و رەزا جەواد)، (ل٤٠) (کەی ئەخسار) بەهێزترین پاشای میدی بووە، بە جۆرێك هەر لە سەردەمی ئەودا، کۆتایی بە حوکمی ئاشووری هات!!

٣- بەپێی لەوحەکە، (ئاهورامەزدا پەرستی) لە سەردەمی حوکمڕانی (کەی ئەخسار)ی میدی بووە، نەك (داریوش)ی ئەخمینی یەکەم ئاهورامەزداپەرێسی بێت.

بەکورتی و کرمانجی بە (ئارگیومێنتی)، شوێنەواری تەواو ساخ دەبێتەوە، کە حوکمڕانی (میدی) و (ئەخمینی) تەواو ئاهورامەزدا پەرست بوونە، ئەم ڕاستیەش لە (لەوحەی زێڕ)ی (ئاریارامنێس) و نووسینی شوێنەواری شاخی

(بێستوون) ڕوون دەبێتەوە:

کەواتە: چۆن (ئاریارامنێس) لە لەوحەکە باسی " چاکەی ئاهورامەزدا" لەسەر ئەو دەکات، بەهەمان شێوەش، داریوشی گەورە، پاش زاڵبوونی بەسەر (فراوەرتیسی دووەم) (شازادە)، سەرکەوتنەکەی ئەو بە "چاکەی ئاهورامەزدا" ناو دەبات.

(دیاکۆنۆف) باس لەوە دەکات، کە میدیەکان زۆر ئەهلی یاسا بوون، هەر ئەوان بوون ئاهورامەزداپەرست بوون، ئەو ئاهورامەزداپەرستیە لە (میدی) گواسترایەوە بۆ ئەخمینییەکان!

## بەڵگەی شوێنەواری دووەم :

پەیکۆلیی شوێنەوارێکی ساسانیە لە خاکی کوردان، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەرایەکانی نەوەدی سەدەی سێیەمی میلادی، بە تایبەتی سەرکەوتنی (شا نەرسی) بەسەر (بارامی سێیەم).

جگە لە پەیکۆڵیی، چەندەها شوێنەواری نا - کوردی لە کوردستان هەن وەك بتخانە و ...دەربەندی گاور... هەروەها چەندەها شوێنەواری ئاگرپەرستی، لە بەهدینانی باشووری کوردستان لە خاکی کورد هەن.

زۆر گەڕیدە باسی پەیکۆڵیان نەکردووە، بەڵام زۆر گەڕیدەش هەن، کە بەگرینگیەوە باسیان لەو پاشماوە کردووە .

گەڕیدە (جاکسۆن)ی ئینگلیز لە کۆتایی سەدەی (هەژدە) هاتۆتە باشووری کوردستان، بەڵام هیچ ئاماژەی بە پاشماوەی پەیکۆڵیی نەکردووە، هەروەها گەڕیدەیەکی وەك (ریچ) لە ساڵی (١٨٢٠) دا گەشتێك بۆ کوردستان دەکات، ناوی هەندێ پاشماوەی ساسانی لە باشووری کوردستان بردووە، بەڵام ناوی پەیکۆلی ناهێنێت. (کلۆدیس ریچ ٢٠٠٢، ل٥٥).

(فریزەر) تەنها چەند ساڵێك دوای (ڕیچ) هاتۆتە کوردستان، کە قسەی لە سەر پەیکۆلی کردووە. (ج.ب.فرەیزەر) لە باسی شارەزوور دا، ئاماژەی بەو شوێنەوارەی پەیکۆلی کردووە، بە جۆرێك، کە لە یەکی تشرینی دووەم لە ساڵی (١٨٣٤) ز دا بە ناوچەکە ڕەت دەبێت و دەڵێ: پیاوێکی بەتەمەن باسی بتخانە، یان پەرستگایەکی پەیکەی بۆ کردم، کە لە دەشتاییەکەدا هەیە و بەردی نوسراوی تێدا هەیە، بەڵام کەس ناتوانێت بیانخوێنێتەوە. ( ئەدمۆنز : کرد، ترك، عرب، ل١٥١).

(ڕاولەنسن) لە پێشەنگی ئەو گەڕیدانە دێت، کە لە هاتنی بۆ کوردستان بەدرێژی باسی پەیکۆلیی کردووە و، وتوویەتی: پەیکەری پەیکۆلیی لەوپەڕی ڕووباری سیروان، لە دووری سێ فەرسەخ دەبێت( کریستنسن :ئێران لە سەردەمی ساسانی، ل٦٧-٦٨).

هێرزفیلد لە دوو ماوەی جیاوازدا (١٩١١ و ١٩٢٣) سەردانی ئەو پەیکەرەی کردووە و نووسینەکەی شیکردۆتەوە .

بە ڕای من، کوردی باشوور لە ڕێگای کتێبەکەی: (ئێدمۆنز) (کرد، ترك،عرب) دا بەو پەیکەرە ئاشنا بووە، ( ل١٥١) لەساڵی (١٩٥٤) (کریستینسن) دەربارەی زمانی ئەو پاشماوە دەنووسێت "بەردەنووسەکە بە دوو زمانی ڕەسمیی ئەو چاخە، واتە (پەهلەوی ئەشکانی و پەهلەوی ساسانی) "نوسراوە" ((ل٦٧-٦٨).

پەیکەری پەیکۆلیی، دەرخەری ئەوەیە، کە زەردەشتییەتی ساسانی لەسەر چەوساندنەوەی: (میدی و پارسییەکان و دوالیزم) دامەزراوە، تۆفیق وەهبی(١٩٦١) باسی ستەمی ئەردەشێر دەکات بەرانبەر میدیەکان، کە لە پێناو دامەزراندنی فەرمانڕەوایی فارسی لە (٢٢٤ م) هەم کوردان پاشای میدی کوشتووە، هەروەها چەندان میدی کوشتووە و بەدیل گرتووە.

لەولاوەش ئەردەلان (ئەرتبان) پاشای پارسی بە ئەردەشێر دەڵێت: هەی گەورەبووی ژێر دەواری کوردی. (طبری بەرگی دووەم).

ناسیونالیستی کورد بێ ئاگابوون لە واتای ئەم قسەیە، بانگەشەی ئەوەیان بڵاوکردەوە، کە دەسەڵاتی ساسانی، دەسەڵاتێکی کوردی بووە، ئیسلام ڕووخاندوویەتی.

ئەوەی لە مێژووی ساسانی ئاگادار بی، هەر زوو دەزانێ، دەسەڵاتێکی دژە - میدی بووە، هەر لە ئەردەشێرەوە، هەتا یەزگورد (٢٢٤-٦٥١ م) واتە: زیاتر لە (٤٠٠) ساڵ فەرمانڕەوایی، یەك پاشای میدی نەبووە.

دکتۆر ئەحمەد مەحموود ئەلخەلیل لە (ل٨٤)ی کتێبی: (مێژووی کورد لە شارستانی ئیسلامدا) دەربارەی جوێنەکەی ئەردەلانی پێنجەم بە ئەردەشێر دەڵێت : ئەم وتەیە پەندێکی کۆنی فارسیە بە کەسێك دەوترێت، کە دڵڕەق و مامەڵە زبر بێت ."

(پرۆد سکاڤا) کە لە (١٩٨٣) دەقی نووسینەکەی پەیکۆلی کردۆتە ئینگلیزی، دوو شتی گرینگ دەردەخات: یەك: زەردەشتیەتی ساسانی دوور لە یەکتاپەرستی نییە، بۆ نموونە: لە (ل٥)ی کتێبی: (The Sassanian Inscription of Paikuli) لە هێڵی یەکەمی بەردنووسی پەیکۆلیی دەگوازێتەوە، کە (نەرسی) ئینقلابچی ئاوا پێناسەی خۆی و باوکانی دەکات :"

I am Mazdaean Majesty Narseh king of king Iran and Aneran whose " whose origin is from the gods son of the Mazadean majesty sabur king of king iran and Aneran whose origin ( is ) from the gods grandson of majesty Ardaxser king of kings.

- من مازدایی خاوەنشکۆ (نەرسەم) پاشای پاشایەکانی ئێران و دەرەوەی ئێران، کە لە خواوەندەکانەوە پاش کەوتووم، کوڕی مەلیك شاپووری پاشای پاشایەکانی ئێران وو دەرەوەی ئێران، کە سەرچاوەی لە خواوەندەکان وەرگرتووە، کوڕی ئەردەشێری پاشای پاشایەکانە."

لەم دەقەی پەیکۆڵیی ئاشکرا دەبێت، کە زەردەشتیەتی: (نەرسی و ئەردەشێر) لە سەر خواپەرستی دانەمەزراوە .عبداللە قەرەداغی ناسراو بە (مەلا عەلی) لە (ل٢٥١)ی کتێبی: (ئاینی کۆن و کۆچکردن لە کوردستاندا) دەربارەی ئاڤێستای سەردەمی ساسانی دەنووسێت:" ئەم (یەسنا)یەی (گاتەکان) کاتی ئێستا، هەر ئەو (یەسنا)یەی کاتی ساسانیەکانە،لەگەڵ (یەسنا)ی کاتی هەخامەنشینییەکاندا -ئەخمینییەکاندا- کەمێك جیاوازی هەیە، بەشێك لەم

پەرتوکە لە کاتی ئەسکەندەردا لەناوچووە."

گاتەکانی سەردەمی زەردەشت: (میدیەکان + ئەخمینییەکان) لەگەڵ گاتەکانی سەردەمی ساسانییەکان هەر جیاوازی وشەکاریان نییە، بەڵکو جیاوازی عەقیدەییان هەیە، هەروەها هەر خودی گاتەکانی سەردەمی حوکمڕانی:( میدی و ئەخمینیەکان) بەشێکی زۆری بووە خۆراکی ئاگر .

لێرەدا ناسیۆنالیستی توندڕەوی کوردی، کار لەسەر گاتەکانی سەردەمی ساسانی دەکات، بەوەش تەواو کەسایەتی کوردی دەشێوێنن!

(پرۆد) هەر لە (ل٢٢)ی هەمان کتێب، دەربارەی: بە (ساسانی و پارسی) کردنی خاکی میدی، وەك: (عیراقی عەجەمی) و (ئەقلیمی جیبال) لە هێڵی (١٥)ی پەیکۆڵیی دەگوازێتەوە:"

likewise the princes and grandees and nobles and householders and satraps and accountants (and) storekeepers (? not Pa) and the remaining Persians and Parthians who were in Asōrestān [and Xūzestā?]n and Garamaea and Syārzūr, all together they came to Xāyānī Nīkatrā to meet me. And here they came into my presence where this monument has been made.

بەهەمان شێوە، میر و خانەدان و خاوەن ماڵان و ژمێریاریاران و خەزنەدار و، هەروەها پاشماوەی فارس و پارسیەکانی لە (ئاشوورستان - عیراقی عەجەم) و (خوزستان - ئەهواز)، هەروەها گاراما‌یا (گەرمیان ) سیازور (شارەزوور)، ئەوانە هەموو پێکەوە هاتن بۆ (خایانی نیکاترا)، تا من ببینن، هەروەها لێرە (پەیکۆڵیی ) لەو شوێنەی ئەم مۆنیومێنتەی لێ دروستکرا لەبەردەم ئامادەبوون."

سەیرکە! (نەرسی) لە مۆنیومێنتی پەیکۆڵیی ناوی لێپرسراوە:( فارسی و پارسەکانی عیراقی عەجەم و ئەقلیم جیبال) دەبات، هەتا ئاماژەش بە میدیەکان ناکات، چونکە باپیر و باوکی میدیەکانی بە کێوی ناودەبرد، کەواتە: ئەو سەرکردە و خانەدانانەی هاریکاری (نەرسی) کرد، دژ بە بەهرامی سێیەم فارس و پارس بوون، نەك (میدی)!!

# هەڵوێستی
# ئەخمینی ئاهورامەزدا پەرست و
# ساسانی مەجووسی
# دەربارەی میدیەکان

ڕاستە لە بنەڕەتدا ڕەچەڵەکی: (ئەخمینی) و (ساسانی) ڕەچەڵەکی (فارسی) ئەوڕۆ پێکدێنن. یەکەم پاشای ئەخمینی (ئاریارامنێس)ی سەردەمی حوکمڕانی (میدی) لە (لەوحەی زێڕ) بانگەشەی ئاهورامەزداپەرستی دەکات.

داریوشی ئەخمینیش لە نووسینی (شاخی بێستوون)، هەمان قسەی باپیری دووپات دەکاتەوە، بەوەی (ئاهورامەزدا) هاریکاری بووە لە بەسەرکەوتنی (فراوەرتیسی دووەم)، یا شازادەی (میدی).

نووسینی (شاخی بێستوون) بەتایبەتی ئەو بەشەی تایبەتە بەشەڕی (داریوش) لەگەڵ فراوەرتیسی دووەم، کە لوتکەی دڕندەیی داریوشی ئاهورامەزدا پەرێس بەرانبەر فراوەرتیسی ئاهورامەزداپەرێس پیشاندەدا.

بۆ نموونە: شارپ بەشێکی تەرجەمەی ئینگلیزی کردووە :

13-17Dariush the king says : One man، fravartish ( Phraortes) by name، a Mede –he rose up in Media . To the people thus he said “ I am Khshathrita، of the family of Uvakhshatra (Cyaxares ) After that، the median force، which –was- in the palace، became rebellious from “. me –and – went over to that Phraortes.He became the king in Media Darius the king says : The Persian and Median army، which . 18-28 was under me، this was a small force. After that، I sent forth an army . Vidarna –Hydarnes – by name، a Persian . my subject –him I made

their chief . Then I said to them : Go forth، smite that median army، which does not call itself mine . After that Hydarnes with the army went off .when he reached Media- there is a town، Marrush by name، in media، there he fought that battle with the Medes . He who was chief among the Medes، he was not there then . Ahuramazda bore me aid، by the favour of Ahuramazda my army severely defeated that rebellious army .27 days of the month Anamaka were past، then the battle was fought by them . After that، the army of mine –there is a district، kampada by name، in media –there –it- waited for me until I arrived in Media."

70-78Dariush the king says : After that، this phraortes with a few horsemen fled . There is a district، Raga ( Ray) by name، in media – along there he went off . After that I sent an army in pursuit، phraortes، having been seized، was brought to me .I cut off his nose and ears and tongue . And I put out one eye . At my door he was kept bound، all people saw him . After that، at Hamadan I impaled him، and the men who were his foremost supporters، them I hanged at Hamadan in fort."

**تەرجومەکەی:**

(١٣-١٧)" پیاوێکی (میدی)، کە ناوی: فراڤارتیش (فراوتێس )بوو لە میدیا ڕاپەڕی. بە خەڵکەکەی وت : من (خشاساریتا) م لە ماڵباتی: یوڤاخشاترا (کەی ئەخرێس). لە پاشان هێزی (میدی)، کە لە کۆشك بوون و دژی من یاخی بوون و بەگەڵ (فراوەرتێس) کەوتن، ئەویش جاڕی دا، کە پاشای میدیایە."

(١٨-٢٨)" (داریوش) دەڵێت : ئەو سوپا فارسی و میدیەی، لە ژێر دەسەڵاتی من بوو، ئەویش هێزێکی بچووك بوو . لەپاشان من سوپاکەم بۆ سەر (فراوەرتێس) بە سەرۆکایەتی ڤیدارنا (هیدارنێس) فارسی، کە یەکێ لە ڕەعیەتەکانم بوو، هەنارد و وتم : بڕۆن بەرەو پێشەوە، ئەو سوپایەی (میدی)، کە وەلای خۆی بۆ من پیشان نادات، تەمبێ بکەن و سزای بدەن.

( هیدارنێس) پێشڕەوی کرد، کاتێك گەیشتە (میدیا)، لە شارۆچکەیەك بەناوی: (ماروش) لە میدیا لەگەڵ میدیەکان بەیەك گەیشتن : ئەو کەسەی خۆی بە ڕابەر (ریش سپی )ی میدیەکان دەزانی، ئەوکاتە لەوێ نەبوو.

(ئاهورامەزدا) یارمەتی دام هەر بە پشتیوانی ئەویش، سوپاکەم دڕندانە سوپای یاخیبوونی تێکشکاند.(٢٧) رۆژی مانگی (ئاناماکا) بەسەرچوو، شەڕەکە لە تەرەف ئەوانەوە دەستپێکردەوە، سوپاکەی من لە قەزای: (کامپا)دا چاوەڕێی منیان کرد، تا دەگەمە میدیا."(ل٤٢).

لە (ل٤٨) یش هاتووە:

(٧٠-٧٨)" (داریوش) دەڵێت : لە پاشان (فراورتێس) بەخۆی و چەند ئەسپ سوارێك ڕایکرد، لەوێ قەزایەك لە (میدیا) هەبوو بەناوی: ڕاگا (ڕەی)، ئەویش بەرەو ئەوێ چوو، منیش سوپایەکم بە دوای هەنارد، سوپاکە (فراوەرتێس)ی گرت و بۆ منیان هێنا .

منیش لوت و هەردوو گوێ و زمانم بڕی، .چاوێکم دەرهێنا، لە دەرگاکەی خۆم بەستمەوە، هەموو خەڵك بینیان، لە پاشان لە (هەمەدان) تێلاترێنم کرد، هەروەها ئەو پیاوانەی لایەنگری (فراوەرتێس) بوون لە بەرەی شەڕ، هەر هەموویم لە حامیەی هەمەدان لە سێدارەدا." (بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە وتاری: کێ نووسینی شاخی بێستوونی نەبینیوە؟ لە سایتی مێژوو و سایتی خاڵ-کوردان...).

# ساسانیە مەجوسیەکان و چەوساندنەوەی میدیەکان

لەم دەقەی خوارەوەش دەردەکەوێ: ساسانیەکان بەرانبەر میدیەکان، لە ئەخمینیەکان باشتر نەبوون.

تۆفیق وەهبی لە (ل١٥-١٦) ی نامیلکەی: ( بنەچەکەی کوردان و بنچینەی زمانی کوردی) دەنووسێت: "ئەردەشێر بابك (٢٢٤-٢٤١ م) میدیەکانی بە (مادی کێوی!) نێودەبرد، هەمان شت لای (شاپوور)ی کوڕی (٢٤٢-٢٧١) دووبارە بۆتەوە، هەر بۆیەش (نەرسی) پاشای ناو پەیکۆڵیی لەو سیاسەتە دوورنەکەوتەوە .

(ئەردەشێر بابك) بۆ دروستکردنی فەرمانڕەوایی فارسی، زاڵبوونی بەسەر مادە(میدی)یەکان بە گرینگترین ئامانجی خۆی دەزانی.

" ئەردەشێر لە کتێبی: (کارنامەك )، کە بە زمانی: (پەهلەوی) بوو، ئاوا باسی کوشتنی میدیەکان دەکات: "ئەردەشێری بابەکان، پاش کوشتنی ئەردەلانی پێنجەم - پاشای پارسەکان - قۆشەنێکی قورس و گەورەی لە (زابول)ەوە پێك هێنا و، ڕۆیشت بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ کوردان - پاشای مادەکان - بکات.... (ئەردەشێر) چوار هەزار شەڕکەری پێکەوەنا و خوت و غافڵ بەسەر کوردانی دادا و، هەزار کەسی لێکوشتن ، ئەوەی مابوونەوەشەوە، یان بەدیلی گرتن، یا برینداری کردن و تفاق و دانەوێڵێکی زۆری لە کوردان، پاشای مادەکان و کوڕەکانی، زەوت کرد."

هەروەها لە سەردەمی (شاپووری یەکەم)، جێنیشینی ئەردەشێر لە ساڵی (٢٤٢)ی میلادی، ساسانیەکان لە هەولێر شەڕێکی قورسیان لەگەڵ " مادە کێوی"یەکان کرد، ( تۆفیق وەهبی، ل١٦).

لە تاوتێکردنی پرسی زەردەشتیبوونی کورد، زۆر جار لای بەشێك لە توێژەری

ناسیۆنالیستی کورد، ئاماژە بە دینی: ( ئێزیدی / یەزیدی ) دەکرێت .

لە ڕاستیدا (ئێزیدی)، هیچ پەیوەندی بەزەردەشتیەتەوە نییە، هەروەها ناسیۆنالیستبوونی (کوردبوونی ئایینی ئێزیدی) هیچی لە خزمەت و ڕاژەی دۆزی کورد نەبووە.(١)

---

(١) ئێزیدیەت: یەهودیەتی کوردی.

ئێزدیاتی کۆمەڵەیەکی (ئەتنۆ)-(دینین) بە واتای: ئینتیما بۆ ئەم دینە لە سەر بنەمای ویراسی و بۆماوەیی دامەزراوە، دایك و باوك ئێزیدی بن . ئەم داخراوییە، هەر چیەکی لە پشتەوە بێت، بۆتە شوناسێکی نەتەوەیی و دینی.

ئەم دینە بە پێچەوانەی یەهودیەتەوە، لە پارادۆکسیەکی ئاڵۆز دەژی، بۆ نموونە. دکتۆر (خانا نۆمەر خالی) (٢٠١١) لە (ل١٧)ی چاپی کوردی کتێبی: (ئیزیدیاتی) دەنووسێت :" ئێزیدی ب زاراڤێ باکورێ زمانی کوردی، ئان کو ب کورمانجی دئاخڤن و قەول و بەیتێن وان ب ڤی زاراڤەیی هاتنە چێکرن ." کەچی ئەوی هەردوو نامیلکەی: (جیلوە) و ( مەسحەفا ڕەش )ی دیتبێ، هێدمە دایەگرێ، چونکە ئەو دوو نامیلکە چەند پەڕییە، لای توێژەری سۆرانی: (شاکر فەتاح) لە یەزیدیەکان و ئایینی یەزیدی (١٩٦٩)، دکتۆر جەمال نەبەز لە المصتضعفون الكرد و اخوانهم المسلمون (١٩٩٧).

هەژار موکریانی لە: (چێشتی مجێوەر) (٢٠٠٠)، دکتۆر ڕەشاد میران لە (ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا) دەڵێن: (جیلوە و مەسحەفا ڕەش) دوو " کتێبی " پیرۆزی ئیزیدیەکانن.

ئەو دوو نامیلکەیە، بە زاری کرمانجی نین بەڵکو بە بن- زاری سۆرانی نووسراون، لە نێو ئێزدیەکانیش سۆرانی نییە! یا عەباس عەزاوی وتەنی: (جیلوە) بە دیالێکتی عەرەبی عیراقی نووسراوە!!

زۆر لە توێژەرانی ئێزیدی، باوەڕیان بەو دوو نامیلکەیە نییە، کەچی نووسەرێکی وەك جەمال نەبەز دەڵێت : (مەسحەفا ڕەش و جەلوە) (سروش ) وەحی —ن هەندێ ئایەتی پیرۆزیان تێدایە، پێیان دەوترێ: " ئەقوال" هیچ ئێزدیەك نییە بڵێت: ئەو دوو نامیلکەیە وەحی ئیلاهین، چونکە پڕ پارادۆکسن. بۆ نموونە: (مەسحەفا ڕەش) دەڵێت : تاوسێ مەلەك سەر مەلەکی فریشتەکانە.(خانا، ل١٩) کەچی (جیلوە) دەڵێت : مەلەك تاوس خودێ یە.

هەرچەندە دکتۆر (خانا) لە (ل١٦) دەڵێت : وشەی ئێزید، وشەیەکی (ئاڤێستا)ی یە، لە قەولی ئێزدیەکان هاتووە : ئێزید پادشێ منە ." بەڵام لە لایەك لە ئاڤێستا ئاهورامەزدا، یا مەزدا ناوە بۆ خودێ، لە لایەکی تر " هەکاریی و تەواوی بەهدینیەکان، هەر وشەیەك بە (ی-) دەستپێبکات وەك: (یەزیدی) دەیگۆڕن بۆ هەمزە و وشەکە دەبێتە (ئێزیدی)!" شاکر فتاح —یش لە کتێبی: (یەزیدی)...دەڵێت : " هەردوو وشەی: (یەزیدی و ئێزیدی) وشەی کوردین، بە واتای یەزدان پەرست دێت ."

لە لایەکی تر فۆرمی ئێستای ئێزیدیاتی، هێندە کۆن نییە، بەڵکو (ڕیچارد فۆلتز) لە توێژینەوەی " ئایینی ئەصڵی کورد " دەڵێت : بۆ هەشت سەد ساڵێك بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە، ئەگەر بەراوردی

بە سەردەمی دەرکەوتنی شێخ (ئادی) بکەین، یادەوەری مێژوویی ئێزیدیەکان، بەر لەو مێژووە زۆر (لێڵ)ە،چونکە بە کرداری بەوێین هەر بوونی نییە.

Yezidism in its
present form dates back only some eight hundred years، to Shaykh Adi's time، and the -historical memory of Yezidis prior to that is so vague as to be practically speaking non existent.

کەواتە: دەتوانین بێژین: ئێزیدیاتی لە ململانێی: (ئەمەوی) و (عەباسی) دروستبووە و " خودی قەولی ئێزدیەکان( قەولی ناو سینگ) لە سەدەی (یازدە) و (دوازدەی) میلادی سەریهەڵداوە، چونکە قەولەکان پڕن لە ناوی پێغەمبەری ئیسلام و خەلیفەکانی !!

مەبەست لەم سەردە مێژووییە، جیاکردنەوەی ( زەردەشتیەت)-ە لە (ئێزدیاتی)، چونکە بە مەبەست و بێ مەبەست، ئەو دووە تێکەڵ یەك دەکرێن.

بنەمای جیاوازی: (زەردەشتی) و (ئێزدیاتی)، چەندان جیاوازی بنەڕەتی لە نێوان ئەم دوو دینە هەیە، لەوانە:

١- زەردەشتی، پێغەمبەری خۆی هەیە بەناوی (زەردەشت)، کەچی (ئێزدیاتی) هیچ پێغەمبەری خۆی نییە، لەم بارەوە نزیکترە لە (سیخی)، نەك زەردەشتی!

٢- لای زەردەشتناسەکان ( ئاڤێستا) کتێبی ئاسمانییە، هەرچی (جیلوە و مەسحەفا ڕەش ) و (ئەقوال)، ڕەگی ئاسمانیان نییە.

٣- زەردەشتیەت ئاینێکی (کراوە)یە، هەروەها (ویراسی ) نییە، هەرچی ئێزدیاتیە، ئاینێکی (داخراو) و ( ویراسی و بۆماوەیی )-ە.

(ڕیچارد فۆلتز) لە زانکۆی (کۆنکۆردیا) لە (مۆنتریال) لە توێژینەوەیەك بەناوی:( پرسی ئایینی ئەصڵی کورد و ناسیۆنالیزمی کوردی تێکەڵاوی هەڵەی ترادسیۆنەکانی یەزیدی و زەردەشتی ").

The Original Kurdish Religion?
Kurdish Nationalism and the False Conflation of the Yezidi and Zoroastrian Traditions

ئەو تێکەڵکردنە، بەکاری ناسیونالیزمی کوردی دەزانێت و دەنووسێت :"

حکومەتی هەرێمی کوردستان بەشی: (ئەنتیکخانە-شوێنەوار) هەموو دەڤەرێکی شوێنەواری پێش ئیسلام بەشێوەیەکی سیستیماتیکی بە " پەرستگای زەردەشتی " ناودەبات، کەچی لە ڕاستیدا ئەمە تێکەڵکردنی کوردیە.

بزاڤی ناسیونالیستی کوردی، کە لە نێو کوڕانی (بەدرخان) وەك: (جەلادەت و کامیران) لە ڕۆژئاوای کوردستان، لە گۆڤاری( هاوار) هەر لە سیەکانەوە زەردەشتی و ئێزدیاتیان تێکەڵ یەك کرد.

(کریستن ئالیسن) دەڵێت : ئەو ناسیونالیستە کوردانە، باوەڕیان وابوو، کە کوردەکان لە سەردەمی پێش ئیسلام (یەزیدی) بوون، یەزیدی بوونیش، فۆرمێکە لە زەردەشتیبوون."

کەواتە ئێزدیاتی، ئایینێکی تەواو کوردییە، وەك ئایینی جوولەکە بۆ جوو وایە، بەڵام ئێزدیاتی، بەپێچەوانەی جوولەکایەتی، وەك ئایینێکی قوربانی دەردەکەوێت، بۆیە بە حوکمی داخراویی و بێ

# بــۆچی
# قورئـــــان ئاماژەی
# بە زەردەشتیەت و مەسیحییەت نەکردووە؟

تەمەنی دابەزینی قورئان(٦١٠-٦٣٣) میلادی تەواو بڕیار لەسەر ونبوونی هەردوو ئایینی: (زەردەشتیەت) و (مەسیحییەت) ساخ دەکاتەوە.

زەردەشتییەت، یا ئاڤێستا، وەك کەلتوورێکی مەعنەوی ئێرانی، هەر لە سەردەمی ئەسکەندەری مەکدۆنییەوە، هەم بووە خۆراکی ئاگر، هەم تەواو لە حوکمڕانی ئێرانی دوور خرایەوە، بە واتای: لە ماوەی کەوتنی ئەخمینی زەردەشتی (٣٣١ پ.م) هەتا "زەردەشتی" ساسانییەکان (٢٢٦) ی میلادی، ناوچەکە بە(هیلینی) و (سروشتپەرستی) داچوو.
لەو ماوەی (٥٥٧) ساڵیە، شوێنەواری پەیکۆڵیی (٢٩١) پێماندەڵێت: زەردەشتیی بەرەو فرەخوایی چووە، نەك ئاهورامەزدا پەرستی. ئەو گۆڕانکاریەش بە دەستی (موغ)ەکانی زەردەشتی بوو.
بەڵگەش بەوەی، کە ئاهورامەزدا پەرستی لە نێو زەردەشتیەتی ساسانی باری کردبوو، شوێنەواری ئاگرپەرستییە لە کوردستانی ساسانیدا، ئەقلیم جیبال و عێراقی عەجەمی و بەشێك لە ئەقلیمی جزیرە، شوێنەواری چەندە پەرستگای ئاگری لێبووە، هەر بۆ نموونە: (قەزوینی) لە (ل٤٥١) (اثار البلاد)، (ابن الفقیە) لە (ل٢٢٦)ی (مختصر کتاب البلدان ...).
(کریستینسن) و (طبری)، ئاماژە بە هەبوونی ئاگرپەرستیی لە چەندەها ناوچەی کوردستانی ساسانی دەکەن، لەوانە: (دهۆك و هەولێر و شارەزوور

---

- هەژموونداریی، توانای نییە هیچ ڕۆڵێکی سیاسی و کەلتووریی لە بزاڤی کوردینیی ببینێت.

و حلوان). زیاتر لەوە، (ئیبن فەقیە) لە (ل٢٢٦) ئاماژە بەوە دەکات، هەتا هەشتاکانی سەدەی سێیەمی کۆچی - سەردەمی خەلیفە (المعتضد بالله) (٢٧٩-٢٨٩ ك) ئەو پەرستگایانە هەر مابوون". ئەو هەموو زانیاریانە، لە دوای فەتحی کوردستان ئاشکرابوون.

لە سەر ئەو بنیاتە، قورئانی پیرۆز ئاماژە تەنیا بە مەجوسی (ماگی: پیاوانی ئایینی زەردەشتی : ئاگرپەرستی) دەکات، نەك زەردەشتی ئاهورامەزدا پەرست، بۆیە زەردەشتی لە قورئان نییە، بەڵکو مەجوسی هەیە، هەر بۆ نموونە لە ئایەتی (١٧)ی (الحج)دا باسی مەجوس دەکات:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ ﴾

واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە و جوولەکە و صابیئین (ئەستێرە پەرست) و گاور و مەجوس و هاوبەشپەیدارەکان، خوای گەورە لە ڕۆژی پەسڵان لەیەکیان جیادەکاتەوە، خوا خۆی ئاگادارە بەکاری هەموان."

لەلایەکی تریش، مەسیحییەت بە هەمان دەردی زەردەشتییەت چووە، بە واتای لە خواپەرستی بەرەو چەندخوایی چووە .

(عیسا)(سەلامی خوای لێ بێت) دوا پێغەمبەری تایبەت بە نەتەوەیەك بوو ! (عیسا) تەنیا بۆ جوولەکە بوو، نەك بە نەتەوەکانی جیهان . خوای گەورە لە دەقێکی قورئاندا دەفەرموێت:

﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُواْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾ ﴾

ئەو تایبەت بوونەی (عیسا) بۆ بەنی ئیسرائیل، لە دەقێکی قورئانی ڕاشکادا،و تەواو پرسی بەمەسیحیکردنی نەتەوەی غەیرە جوولەکە پووچ دەکاتەوە. مەسیحییەت لە نێو زۆر نەتەوە بڵاوبۆتەوە، ئەمەش لە خۆڕا نییە، چونکە ماوەی هەردوو پێغەمبەر: عیسا(سەلامی لێ بێت) - موحەممەد(صلی

الله علیە وسلم) (٣٠-٦١٠) میلادی زیاتر لە (٥٨٠) ساڵ هەیە، لەو نێوەش نەتەوە هەن، کە نە بە عیسا و مەسیحییەت گەیشتوون، نە بە پێغەمبەر موحەممەد و ئیسلام.

بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت و نەصرانییەت لە نێو کورددا، مێژوویێکی کۆنی هەیە. لە پەیمانی نوێی (کتێبی پیرۆز)دا هاتووە: کە هەر لە مەلۆتکەبوونی (عیسا)وە هەندێ (موغ)ی زەردەشتی هاتبوونە (بەیت لەحم) بۆ ئەوەی هەواڵی (عیسا) پشتڕاست بکەنەوە. لێرە چەندان نووسەر و توێژەری کورد و نا - کورد، لەوانە: (ئەدی شیر، جرجیس فتح الله، سرکیس ئاغا جان، سمکۆ، بەهرۆز، عبدالله قەرەداغی، کەلسومە جەمیل...)باس لە بڵاوبوونەوەی هەردوو فۆڕمی مەسیحییەت و نەصرانییەت کردووە.

(سرکیس ئاغا جان) لە لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی بە ناوی: " (کوردە مەسیحی یەکان لە سەردەمی ساسانییەکان دا) " لە (ل٣٣)دا هەمان قسەی (پەیمانی نوێ) ئاوا دووبارە دەکاتەوە "چۆنیەتی گەیشتنی پەیامی مەسیحییەت بەکوردەکان و بوونیان بە مەسیحی.

حەزرەتی مەسیح لە سەردەمی: (هیرۆدیس) پاشا لە خاکی فەلەستین لە شارۆچکەی: (بیت لحم) ی یەهودیە لە دایك بوو، لەو کاتەدا ئەستێرەیەکی گەش لە ئاسماندا پەیدابوو، پیاوە ئایینیەکانی زەردەشتی لە ناوچەی دەریاچەی (ورمێ)ەوە، ڕێگای فەلەستنیان گرتەبەر و شوێنی ئەو ئەستێرە کەوتن، تا گەیشتنە (ئۆرشەلیم) و هەواڵی شوێنی لەدایك بوونی پاشای یەهودیەکان(مەسیح) پرسی...".

هەروەها ئاغاجان لە (ل٤) دەنووسێت: "(ماری) کە پاتریاکی ڕۆژهەڵات بوو لە ساڵی (٣٥-٤٩) زایینی لەگەڵ چەند کەسێك، مزگێنی پەیامی حەزرەتی مەسیحی گەیاندووە شاری ئەربێلا (هەولێر) و دەوروبەری..."

(باسیل پیدرویچ) (١٩١٧) لە (وتاری کورد و مەسیحییەت) باس لەوە دەکات، کە شاری (ئەربیلا - هەولێر) لە دوو قۆناغی مەسیحیبوون ژیاوە:

١- لە (٤١٠) بۆ (٧٩٠) واتە ماوەی (دانیال) و (نەستوری).
٢- لە (٧٩٠) بۆ (١٩١٧).

لەو ماوەی دووەم ،(٤٠٠) ماڵی مەسیحی لە گوندێکی گەورەی نزیك هەولێر هەبوونە."

مەسیحییەکانی: (ئەقلیم جیبال و عیراقی عەجەمی و بەشێك لە جەزیرە)، هەتا هاتنی ئیسلام (٦٣٨-٦٥١) مەسیحی بوونە، هەرچی مەسیحییەکانی کوردستانی: (بیزەنتی و ئەرمینیان) بە حوکمی ئەوەی (قوستەنتین) لە (٣١٣) ەوە، مەسیحییەتی کردە ئایینی ڕەسمی دەوڵەت و بیرۆکەی ( باوەڕی سێینە ) ی هێنا ناو مەسیحییەت و کردی بە (نەصرانی)، بۆیە بەشێکی زۆری کوردی باکوور و ڕۆژئاوا بەپێدانی (جزیە) لە سەر دینی خۆیان مانەوە .

هەبوونی ئەو دوو ڕەوتە مەسیحییە لە کوردستان، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە مەسیحی کوردستانی ساسانی بە عەقیدە مەسیحی بوون، پاش کوشتنی چەندان سەرکردە و چەوساندنەوەی (شاپووری دووەم) و (یەزگورد) لە ئایینی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە.

هەرچی مەسیحی کوردستانی بیزەنتی بوون لە ،ماوەی نێوان( ٣١٣-٦٤٠ )مەسیحییەتیان بە ویراسە و دینی ڕەسمی دەوڵەت وەرگرتبوو، بۆیە مەسیحی کوردستانی ساسانی، زۆر ئاسانتر بوونە موسڵمان، هەرچی نەصرانیەکانی کوردستانی بیزەنتی بوون، زۆربەیان بە دانی (جزیە) لە سەر دینی خۆیان مانەوە.

(مەسیح) بە دەقی ئایەت، هیچ پەیوەندی بە باوەڕی کوردەوە نییە، چونکە پێغەمبەری جولەکە بوو . لە نێوان (زەردەشت) پێغەمبەر و (موحەممەد) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ماوەی زیاتر لە (دە) سەدە هەیە، کەواتە کورد لە سەردەمی حوکمڕانی ساسانی و بیزەنتی، لە قۆناغی (أهل الفترة) دەژیا.

(ئەهلی فەترە) پێناسەی جیاوازی هەیە، لەوانە: دەگوترێ: زاراوەیەکە سەبارەت بەو کەسانەیە، کە پێغەمبەریان بۆ نەهاتووە، ئەم بۆچوونەش پێچەوانەی

دەقی قورئانە!

بڕوا عبدالله (٢٠١٦) لە (ل٣)ی توێژینەوەیەك بە ناوی: (اسئلة الصحابە العقدیة للنبی في الصحیحین عن اهل الفترە) لە (ئالوسی) دەگوازێتەوە، کە (ئەهلی فەترە) ئەو ماوەیە لای هەموو ڕاڤەکاران بریتییە اە پچڕان لە نێوان دوو پێغەمبەر، کە ئەوەی یەکەم بۆ ئەوان نەهاتووە، بە دووەمیش ڕانەگەیشتوون."

کورد لە کوردستانی ساسانی و کوردستانی بێزەنتی دا، ئەم پێناسەیەی بەسەردا دەسەپێت: دەوڵەتی ساسانی لە (٢٢٤) دروستبوو، کەچی زەردەشت، پێغەمبەری کوردان لە سەردەمی حوکمڕانی (خەسرەوی میدی) پەیدابووە.
ئەو ماوەیەش بە (٨) سەدە مەزەندە دەکرێت، هەروەها ماوەی نێوان زەردەشتی پێغەمبەری قەومی کوردوە و موحەممەد پێغەمبەر، پێغەمبەری جیهانیی، زیاتر لە (١٢) سەدە هەیە...
کەواتە: کورد چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەرێك بوو بۆ ئەوەی لە مەجوسیەت و نەصرانیەت ڕزگاری بکات...

ئەم خۆ جیاکردنەوەی کورد لە مەجوسیەت و نەصرانیەت، ماوەیەکی زۆری ویست، بە جۆرێك دوای چەند سەدەیەکیش، هەردووك بەڕێژەیەکی کەم، هەر مابوون.

# مانەوەی مەجووسیەت و نەصرانیەت لە وڵاتی کوردان دوای فتوحاتی ئیسلامی

پاش بزاڤی فتوحات و کۆتاییهێنان بە حوکمڕانی ساسانی لە (٦٥١) میلادی، بە ساڵێك و دوان کۆتایی بەزەردەشتییەتی دەوڵەت نەهات، بەڵکو هەتا چەند سەدەیەکیش دوای فتوحات، ئاگردانی زەردەشتی لە وڵاتی کوردان هەر مابوون، بۆ نموونە: (براون) لە (ل٣١)ی (تأریخ الادب...)دەنووسێت: پاشماوەی ئاگری پەرستگا ساسانییەکان، هەتا سێ سەدە دوای فتوحات لە ناوچەکە هەر مابوون، چونکە پەرستگاکان ناوەندی پەرستنی ئاگری پیرۆز بوون، هەروەها ئەو پەرستگایانە هەر تەنیا بۆ پەرستن نەبوون، بەڵکو شوێنی پێشکەشکردنی قوربانی بوون بۆ خوداوەند."

(کریستنسن) لە کتێبی: (ئێران لە سەردەمی ساسانیدا) ناوی کۆمەڵێك ئاگردان لە میدیای کۆن (وڵاتی کوردان) دەهێنێت، ئەو ئاگردانانەش، هەتا سەدەکانی یەکەمی ئیسلامی مابوونەوە، بۆیە لە (ل٦٢٨) دەنووسێت:" لە ساڵی (٧٢٨-٧٢٩)دا (خوسرەو) ناوێك لە نەوە و نەتیژەکانی (یەزگوردی سێهەم) لەگەڵ (ترکان) یەکی گرت، هەتا دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتی وەچەنگ بێنێتەوە، بەڵام بە مراد نەگەیشت ...لای زەردەشتیەکان حوکمڕانی یەزگوردی بە تأریخی یەزدگردی".

گەڕیدەیەکی وەك: (ئیب ڕستەش) (لە ساڵی ٢٩٠ کۆچی/٩٠٢ی میلادی مردووە) ناوی گوندێك دەهێنێت بەناوی: (ئاخرین )، کە نزیك بە شارۆچکەی (حلوان)، لەو گوندەدا، ئاتەشگایەك هەیە، کە خەڵك لە سەرانسەری وڵات بۆ پەرستن بۆی دێن."

هەرچی (ئیبن فەقیە)ی خەڵکی ناوچەکەیە لە (ل٢٢٦)ی کتێبی: (مختصر کتاب البلدان) ئاماژە بەگوندێکی دی دەکات بەناوی: (فردجان)ی سەر

بە(فراهان) نزیك ( هەمەدان).

لەو گوندەدا چەند"ئاتەشگا"یەکی لێ بوو، کە ساسانیە مەجووسەکان زۆر بایەخیان پێدەدا، وەك ئاتەشگای: (ئازەرخرە) و (جەم شیز) ."

(ئیبن فەقیە) دەڵێت : ئاتەشگای (جەم شیز)، هەتا ساڵی (٢٨٢ك/٨٩٥ م) سەردەمی خەلیفە ( المعتضد بالله ٢٧٩-٢٨٩ ك) مابوو، هەروەها ئەو ئاتەشگایە یەکێ لە سێ ئاتەشگا مەزنەکەی زەردەشتیی بوو."

(قەزوینی) لە (ل٤٥١)ی (ئاساری بلاد) ئاماژە بە شارۆچکەیەکی (مازروستان) دەکات، کە تەنیا دوو قۆناغ لە (حلوان) دوورە، هەیوانێکی گەورە هەیە، کە شوێنگایەکی گەورەی ئاگری لێیە.

(دینەوەر)یش وەك (ئیبن فەقیە) خەڵکی ناوچەکەیە و هەم لە هەمان سەردەمی ئەو ژیاوە، ناوی گوندێك بەناوی: - خوارجان - دەبات، کە لە نزیك - نەهاوەند - کە ئاتەشگایەکی لێیە، لەو ناوچەیەش گەنجینەو خشڵو موجەوهەراتی لێشاردرابۆوە.

لەوانەیە ئەو گوندەی نزیك (نەهاوەند) هەمان ئەو گوندە بێت، کە (طبری) بەناوی - نخرجان - ئاماژەی پێدەکات، (طبری) وا باس لەو گوندەی نزیك نەهاوەند دەکات، کە لە سەردەمی فتوحاتدا، موسڵمانەکان غەنیمەیەکی گەورەیان دۆزیەوە، کە کەنزی (کیسرا) و کەنزی (نەخرجان) بوو."

حمدالله مستوفی( لە ٧٥٠ك/١٣٤٩ م مردووە) باسی مانەوەی پەرستگای ئاگرپەرێسی، هەتا کۆتایی عەباسییەکان و سەرەتای هاتنی مەغۆلەکان لە وڵاتی کوردان دەکات . لە (ل١٢٧)ی کتێبی: (نزهة القلوب) ئاماژە بە بوونی پەرستگایەکی زەردەشتی لە شاری - شتر - دەکات.

(ئیبن حوقەل) لە (ل٣٠٧)ی (صورة الارض) دەڵێت : (شتر) تەنها (٦٠) کیلۆمەتر لە نەهاوەند دوورە.

حمدالله مستۆ فی و قەزوینی، بە جیا وا باسی - شتر - دەکەن، کە ئاگرێکی گەورەی لێبووە، بەناوی: (ئاز رخس)، ئەگەر یەکێ لە پاشاکانی (مەدائین) زیارەتیان بکردایە، ئەوا بەپیادە دەچوون و لە (شەهرەزوور) دەحەسایەوە،

(شەهرەزوور) نیوەی (حلوان) بوو لەوێوە بەپیادە دەچووە - شیز، - پیرۆزی (شیز) لای مەجووسیەکان لەوە دابوو: زێدی زەردەشت بوو."

نەقشەبەندی لە (ل٩٠)ی ماستەرنامەکەی، ئاماژە بە هەبوونی ئاتەشگایەکی زەردەشتیان لە گردی شوێنەواری (قورتاس) لە دەشتی شارەزوور دەکات.

(کریستنسن) لە لاپەرە (٢٤١)ی کتێبی: (ئێران لە سەردەمی ساسانییەکاندا) ئاماژە بەوە دەکات، کە پاشماوەی نەخش و پەرستگای زەردەشتی لە (تاق بستان) لە باکووری ڕۆژهەڵاتی (کرمەشان) ماوە، لەوێ پەرستگایەکی کۆن تایبەت بەمەجووسیەکانی لێبوو. لە نزیك ئەو پەرستگایەدا، دیمەنی بە شاکردنی ئەردەشێری دووەم (٣٧٦ - ٣٨٣ م) لێیە، کە بەجۆرێکە لەوی ڕاستیدا پاشا ئاهورامەزدا هەیە، تەماشای ئەو دەکات."

زەردەشتییەتی ساسانی (مەجووسی)، هەر تەنها لە (عیراقی عەجەمی) و (ئەقلیم جیبال) نەبوو، بەڵکو لە تەواوی قەڵەمڕەوی ساسانی هەبوو، وەك: ئەقلیم جەزیرە، ئەقلیمی جەزیرە هەر تەنها باکووری کوردستان نەبوو، بەڵکو بەشێك لە باشووریشی دەگرتەوە، وەك: (شەنگال و بەهدینان...).

بەشێکی زۆر لە هەرێمی (جەزیرە) لە ناو قەڵەمڕەوی ساسانی دابوو، کەواتە: فۆرمی زەردەشتی ساسانی لەو هەرێمەش تەواو باڵادەست بوو، بۆ نموونە: لە گوندی (باصفرِی کە دەکەوێتە شارۆچکەی شێخان)ی سەر بە نوهدرا (دهۆك) هەروەها (تاق گلی زردك) لە ئاکرێ.

لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی دواییدا، چەندان ئاتەشگای زەردەشتی لە دەڤەری بەهدینان دۆزرانەوە(١).

کەواتە وڵاتی کوردان لە سەردەمی ساسانیەکان، لە سەر فۆرمی دووەمی زەردەشتیەت بوون بە ناوی دینی (ماگیەکان)، یا (مەجوسی)، پاشماوەی پەیکۆلی سەردەمی (شا نرسی) نەوەی ئەردەشێر (٢٩٣) میلادی و، دەقی قورئانی پیرۆز باشترین بەڵگەن.

(١) (کەلسومە جەمیل، وڵاتی کوردان لە سەردەمی ساسانیەکان).

## مانەوەی نەصرانی
## لە وڵاتی کوردان دوای فتوحات

لە هەردوو بەشی کوردستانی ساسانی و کوردستانی بیزەنتی، دوو ڕەوشی جیاواز بۆ کوردی مەسیحی هەبوو، کوردی کوردستانی ساسانی لە ڕەوشێکی چەوساندنەوە دابوو .

(سمکۆ بەهرۆز)(٢٠٠٦) لە (ل٧١) لە (ل١٢-١٣)ی (الفتوحات العربیة للعراق ...)و (دور النصری فی..)دەگوازێتەوە و دەنووسێت: " هەر لە دوای داگیرکردنی ناوچەکانی خوارووی عێراق...مەسیحییەکان لە عێراقدا، پێشوازی ئیسلامیان کرد و بەرەو پیریانەوە هاتن، هەوڵی ئەومیان دەدا، کە لە چەوساندنەوەی ساسانییەکان ڕزگاریان بێت ."

لە ڕوانگەی ئایەتی (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ)دا هیچ دینێك ناچار نەبووە و نەکراوە دەستبەرداری دینەکەی خۆی بێت . (الاب البیر ابونا) لە (٧٨-٧٩) (تاریخ الکنیسة السریانیة الشرقیة) دا وێنەیەکی سەدەی نۆی میلادی ناوچەکەمان بۆ دەگوازێتەوە: "لە سەردەمی خەلیفە موعتەسمدا( ٨٣٣-٨٤٢) ی میلادی پایتەخت لە بەغداوە گوازرایەوە بۆ (سامەڕا)، لەو ماوەیەدا ئاسودەیی باڵی بەسەر ناوچەکانی (موصل) و (باجرمی) داگرتبوو .

بەهرۆز لە (ل٧٣)ی (مێژووی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ناوچەی کەرکوکدا) دەنووسێت: "کەرکوکیش بەشێکی گرنگی ئەو ئاسوودەییە بوو."

ئەوەی گرینگە، خودی ئیسلام و بەشێکی زۆری خەلیفەکان لە هەردوو بەشی کوردستانی ساسانی و کوردستانی بیزەنتی، هیچ کێشەیەکیان دەگەڵ پاشماوەی زەردەشتی (مەجوسی) و مەسیحی کوردی و، غەیرە کوردی (نەصرانی) نەبووە.

# كوردستانی ساسانی و
# كوردستانی ڕۆمی

بوونی دوو دەسەڵات لە سەر خاكی كورد، وەیكردووە ببێتە گۆڕەپانی تەراتێنی ساسانی و ڕۆم. لێرەدا پرسی ناوەكی و دەرەكی نێو هەردوو ئیمپراتۆریەت: ساسانی لە (٢٢٦) ەوە بووە میراتگری قەڵەمڕەوی ڕۆژهەڵات، (ڕۆم)یش پاش شكاندنی (سلوكیەكان) لە ڕۆژهەڵات، لە ڕۆژئاواش كورسی دەسەڵاتی كەوتە لێژی، ڕۆمەكان بوونە میراتگری (سلوكییەكان).

لەو نێوەدا كوردستان بووە دوو بەش: بەشی كوردستانی ساسانی و بەشی كوردستانی ڕۆمی. ئەو دوو بەشەش سنوورێكی دیاركراویان نەبوو، چونكە هەر دەمە شارێك لە شارەكانی: (جەزیرە و عیراقی عەجەمی) لە دەست لایەك بوو.

كوردەكانی ساسانی، هەم زۆربەی (زەردەشتی) بوون و كەمینە (مەسیحی)، هەروەها كوردەكانی ڕۆمی، زۆربە (مەسیحی) و كەمینە (زەردەشتی) بوون.

وێڕای ئەو داگیركردنە جوگرافیە، كوردەكان خاوەنی هیچ دینێك لە دینەكانی (زەردەشتی) و (مەسیحی) نەبوون.

بە كورتی: كوردەكان زۆربەیان زەردەشتی ویراسی لە ئیمپراتۆریەتی ساسانی و مەسیحی دەوڵەت بوون لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمی.

## جیۆگرافیای کوردستانەکانی ساسانی:

لە ئیمپراتۆریەتی ساسانیدا، (سێ) ئەقلیمی کوردی هەبوون، بەڵام هیچ سنوورێکی جیوگرافی لە نێوانیاندا نەبوو، ئەوەی هەبوو سنوورێکی کارگێڕی بوو. ئەو سنووره کارگێڕییە،هەم هەندێ ناوچەی نا -کوردی وەك: خۆزستان (ئەهواز )و(تکریت)ی خستبووە سەر ئەقلیمە کوردییەکان، هەم هەندێ شاری لە عیراقی عەجەمیەوە کردبۆوە وەك: (هەولێر، ژەنگار،شارەکانی دەڤەری بادینان)، هەروەها هەندێ شاری کوردستانی ڕۆمی کردبووە، کوردستانی ساسانی.

**لە ئیمپراتۆریەتی ساسانیدا ، کوردستانی ساسانی سێ ئەقلیم بوو:**

١- عیراقی عەجەمی، یان عیراقی کوردی.
٢- ئەقلیم جیبال، یان غەربی ئەقلیم جیبال.
٣- ئەقلیم جەزیرە.

## کورد لە حوکمڕانیەتی (١٦-٤٠) ی کۆچی:

(ئەردەشێر بابەکان) دامەزرێنەری حوکمڕانیەتی ساسانی، پاش دەمکوتکردنی (میدی) و (ئەشکانیەکان) فەرمانڕەوایەکی فارسی (٢٢٦)ی میلادی دامەزراند.

وەك گوتمان: وڵاتی (کوردان - کوردستان) ئەوسا کرابووە دوو زۆن : دەتوانین ناویان بنێین: کوردستانی بندەستی ساسانیەکان،کە لای گەڕیدە و مێژوونووسە موسڵمانەکان، ناسراو بوو بە :(ئەقلیمی جیبال) .بەشەکەی تر کوردستانی بندەستی ڕۆمەکان، یا زۆنی: (زۆزان و ئەرمینیا ).

لەو ماوەیەدا، ناوی کورد (لەو ١٣٠٠ ساڵە) لە شار و حوکمڕانی دوورخرایەوە. سەرچاوە عەرەبیەکان، کە لە ژێدەر سەرەکیەکانی ناساندنی کورد. (ئارشاك پۆڵادیان) - کە خۆی دوژمنی باوەکوشتەی ئیسلامە - لە (ل١٢) هەتا (ل١٤)

باس لەوە دەکات، کە هەرچی نووسەرە عەرەبەکان دەربارەی شوناسی کوردەکان نووسیویانە لە نووسینی ساسانیەکان وەریانگرتووە، بۆیە "زاراوەی ( کوردەکان ) و ( کورد )،پتر سیمایەکی مێژوویی و ئەفسانەییان لە خۆ گرتووە ." "زاراوەی کورد لە سەرچاوە عارەبیەکاندا، بە واتای ئەو هۆزانە دێت، کە بە ئێرانی قسە دەکەن و لە ناوچە شاخاوییەکاندا دەژین و ژیانێکی کۆچەرییانە بە سەر دەبەن."

ئەو ڕەوشە، ( هۆزی ) و ( کۆچەرییە )، واتای تەواو فەرامۆشکردن و بە لاوەکی دیتنی کورد دێت: هەر (ئارشاك پۆلادیان) لە (ل١٣) باوەڕی خۆی ناشارێتەوە، کە ئەو زانیاریانەی لەو سەرچاوانانە هەن، تەواو لە ساسانی وەرگیراون: "لەو باوەڕەداین کە ئەم زانیاریانەی دەربارەی کورد لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا هەن لە نەریتە ئێرانییەکانەوە وەرگیراوە، بە تایبەتی لە کتێبی،( کارنامەی ئەردەشێری بابەکان)."

ئەو وێناکردنەی کورد بە هۆزی کۆچەری شوانکارەیی خاوەن مەڕ و مالأت، لای ساسانییەکان، ڕقێکی گەورەی لای ڕۆشنبیری ئەوسای کورد دروستکرد، کە تەواو ئامێز بۆ ئیسلام بکاتەوە. کەواتە کورد بە موسڵمانبوونی، شوناسی قەومی خۆی وەرگرتەوە ( وەك دوایی دەبینین).

عیراقی عەجەمی، (هەژار) گوتەنی: عێراقی کوردە و خەتی یەکلاکەرەوەی وڵاتی کوردە لە عەرەب . وەك دوایی باسی دەکەین، فتوحات لەو هەرێمەوە بەرەو (ئەقلیم الجبال) هات .

(ئەقلیمی جیبال)هەروەك لە ناوەکەی دیارە،هەرێمێکی شاخاویە.لە لاپەڕە (١٢٤)ی (شەرەفنامە) هاتووە : "خێوی - مسالك الابصار دەربارەی (اقلیم الجبال) دەڵێ: کەوشەنەکەی سەر زنجیرەی کێوەکانی: هەمەدان و شارەزورەو، لە لای شورەقەلاکانی کافرەکانی وڵاتی :- تکفور - دوایی دێت، (تکفور) مەملەکەتی - سیس - وە ئەو شوێنەشە، کە سەربەوێ و لە دەست ماڵی - لاون- دایە."

ئەقلیمی جەزیرەش، ئەقلیمێکی دی نێو قەڵەمڕەوی ساسانی بوو .

ئەو سێ ئەقلیمی کوردستانی ساسانی پێکدەهێنا .

## کوردستانی بندەستی ڕۆم :

کوردستانی بندەستی ڕۆمی، لە ڕووی جیوگرافیەوە دوو بەش بوو، لە ڕووی سەقا و کارگێرییەوە سێ بەش بوو، وەك کوردستانی شامی، بەشێکی جەزیرە، هەروەها دڤەری (زۆزان).

بەشی شامی کوردی لە (عفرین) ەوە، تا (تل دیوار) بوو، بەشی جزیرەی (ڕۆم)یش بریتی بوو لە چەندین شاری کوردی . هەرچی بەشی (زۆزان)ی ئەم کوردستانەیە لە سەردەمی فتوحات بریتی بوو :

"(زۆزان) وڵاتێکی جوانە و لە نێوانی چیاکانی: (ئەرمەنستان و ئەخلات و ئازەربایجان و دیاربەکر و موصڵ) هەڵکەوتوە. (یاقوت حەمەوی، ل٤١٥)".

## کوردستانی ئەرمینیا :

**وشەی (ئەرمینیا)، وشەیەکی ئەتنیکی نەبوو، بەڵکو وشەیەکی کارگێڕی بوو . ئەم کوردستانەش سێ بەش بوو:**

أ- بەشێکی سەر بە ساسانی بوو...نزیك نەهاوەند.

ب- بەشێکی سەر بە ڕۆمی بوو، نزیك (زۆزان).

ت- لە نزیك (ئەرمینیا و ئازەر بایجان بوو) - ئەترۆپاتین.

کەواتە: هەرچی کوردستانی (ئەرمینیا - ئەترۆپاتینە)، کوردستانێك بوو بە هۆی هاودینی لەگەڵ ڕۆمەکان دا، هەردەم هەڕەشەی لەو بەشەی کوردەکان دەکرد، هەتا زۆربەی بەشەکانی باکوور داگیر کرد .

ئەو خاك دابەشکراوییەی کورد و پەرتەوازەیەی تاکی کورد، لە نێوان کۆچەری - عیمرانیەتی لە لایەك، هەروەها زەردەشتیبوون و مەسیحیبوون لەلایەکی تر، لە ژێر سایەی خیلافەتی عەقائیدی چی بە سەرهاتووە؟؟.
لە بەشی دووەمەوە قسە لە سەر ئەو پرسە دەکەین.

"باری سروشتی کوردستان و، ژیانی سەختی زۆربەی دانیشتوانی و، پەرەسەندنی کۆچەری و نیمچە کۆچەری لە ناویاندا، لەگەڵ چەند دیاردەیەکی تر لەو بابەتە، بوونە هۆی ئەوەی نووسین و خوێندن و خوێندەواری لە ناو کورددا، درەنگ پەیدا ببن ...

وا دیارە بەهۆی ئایینی ئیسلام و پێویستییەکانییەوە، خوێندن و خوێندەواری بەناو کوردا بڵاوبوونەوە. دکتۆر کەمال مەزهەر ١٩٨٣، مێژوو ل١٠٦"

# دەروازەی
# بەشی دووەم

لێرەوە کورد پاش (١٣٠٠) ساڵ لە داگیرکردن، دینێکی نوێ لە دەرگای دەدات. دینەکەش وەك تێکست و پرانسیپ، لە کورد نامۆ نییە، چونکە پێشتر دینی ئاسمانی لای کورد هەبوونە، وەك دینی: (یەهودی و مەسیحی).

جیاوازی ئیسلام لەگەڵ دووەکەی تر، بە کردەوە کردنی ئەو جیهانبینییەیە. ئەوەی ئەم بەشە دەیەوێ قسەی لە سەر بکات، دوو پرسی سەرەکییە:

١- پرسی نەتەوە و زمانی جودایە.

٢- پرسی فتوحات، یا ئیسلامی دەرەوەی جەزیرەی عەرەبی.

# لەپرسی قورئان
# نەتەوە و زمانی جیا

عالەمیەتی دەقی قورئان، دەلالەت لە هەبوونی خودایەك دەکات، کە هەموو نەتەوە و زمانەکانی لەلا وەك یەکە، جا ئەو نەتەوە و زمانە لەناو ئیسلام بن، یان دەرەوە .

زمان ئامێری گەیاندنە، هەم کەلامی خودای پێ دەگەیەندرێ، هەم کەلامی دژە خوای پێ دەگەیەندرێ، بە پێی ئەم ئایەتەی خوارەوەی سورەتی ئیبراهیم:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡ ﴾

واتە: بۆ هەر قەومێك، پەیامبەرێکمان بە زمانی قەومەکەی هەناردووە بۆ ئەوەی پەیامی خودایان بۆڕون بکاتەوە.

لەو ئایەتەی سەرەوە دەردەکەوێت: کە هەر پەیامێکی ئیلاهی بۆ قەومێك هاتبێت، بە زمانی قەومەکە بووە، کەواتە هەموو زمانەکان لای خودا پیرۆزن، چونکە دەقی ئاسمانیان پێ نووسراوەتەوە، هەروەها هیچ قەومێکیش بۆی نییە لاف لە سەر قەومێکی تر لێبدات، چونکە هەموو وەك یەك لە پێغەمبەر بۆ هاتن بێبەش نەبوون ...

قەوم هەبووە ( دە)یان پێغەمبەری بۆ چووە، کەچی هێشتا زۆربەیان بڕوا بە (دوا پەیامی خوا - قورئان) ناهێنن، قەومیش هەیە وەك کورد، تەنیا پێغەمبەرێکی بۆ هاتووە، کەچی زۆربە موسڵمانن، چ بە شوناس، چ بە عەقیدە.

لە ڕوانگەی زمانەوانی بونیاتگەریش دا، هەموو زمانەکان لە فۆنیم و

مۆرفیم و وشە و فرێیز و ڕستە پێکهاتوون، کەواتە: زمانی پێشکەوتوو و زمانی بەرایی، تەنیا کۆمەڵگا دروستی دەکات .

﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّلْعَـٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾ (الروم:٢٢).

واتە: یەکێ لە بەڵگەکانی خودا، ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە(بە دوو ئەدگاری جودا) هەروەها وایکردووە زمانی هەر قەومێکتان و ڕەنگی هەر قەومێکتان جودا بێت، تەنیا ئەوەی زانان لەو پرسە تێدەفکرن.

جیاوازی زمانی دوو قەوم لە یەکتر، نیشانەی گەورەیی خودایە، ئەوە پرسی دوو بەرەیی بووە لە سەردەمێکدا، لە جیهانی ئیسلامی، تەنیا زمانی عەرەبی زمانی دەوڵەت بووە، چۆن لە ئەوروپاش زمانی لاتینی، زمانی دەوڵەت و کەنیسە و ئەدەب ..

بۆ نموونە: چەندان کەسی جیوگرافی ناس و مێژووناس و شەرعناسی کورد، وەك:( ئەبولفیدای ئەییوبی، ئیبن خەلەکان، شاهرەزووری....) کتێبی خۆیان بەعەرەبی نووسیوە . کەسێکی وەك موحەممەد ئەمین زەکی (١٨٨٠-١٩٤٨)، کە لە سەدەی (١٩ و ٢٠) ژیاوە چەندان کتێب بە زمانی عەرەبی بنوسێت، یەکێ لەوانە، کتێبی:( مەشاهیری کورد و کوردستان)ە لە سەردەمی ئیسلامی (چ ٢٠١١،٣)... زیاتر لە (٤٠٠) زانا و دانای کورد بە نەتەوەی تر بناسێنی.

دوای ڕوخانی دەوڵەتی عەبباسی و ڕێنیسانسی ئەوروپا، زمانی عەرەبی لە کاروباری دەوڵەت و زمانی لاتینی لە کاروباری دەوڵەت نەمان، یان زۆر لاواز بوون، جا چۆن لە ئەوروپا زمانی نەتەوەکان دەرکەوتن، وەك زمانی: (ئینگلیزی، ئەلمانی، فەرەنسی....) لە جیهانی ئیسلامیش هەردوو زمانی: (فارسی و عوسمانی) بوونە زمانی دەوڵەت، میرێکی ڕۆشنفکری وەك: (شەرەفخانی بدلیسی) (شەرەفنامە)ی بە زمانی:( فارسی) نووسی، بەڵام مەلایەکی وەك: (تەرەماخی) دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی نووسی، هەروەها مەلایەکی وەك (جەزیری) شیعری بە کوردی نووسی، هەروەها مەلایەکی وەك: (ئەحمەدی

خانی) دەق و فەرهەنگی بە کوردی نووسی! چونکە جیهانی ئیسلامی وەك ئەوروپا نەبوو، مرۆڤ ئازاد بوو بە چ زمانێك گوزارشت لە خۆی بکات، بەڵام لە ئەوروپای پێش ڕێنیسانس، تاکی ئەوروپی ئازاد نەبوو لە غەیری لاتینی، بە زمانی خۆی گوزارشت لە خۆی بکات.

هەر بۆ نموونە: هەتا (دانتی) داوای ئازادی زمانی ئیتاڵی نەکرد، (مارتن لوسەر) بە زەبر، ئینجیلی لە لاتینی تەرجەمەی ئەڵمانی نەکرد، لە بەریتانیا پاش (١٤) سەدە لە مەسیحیبوون، ئینجیل تەرجەمەی ئینگلیزی نەکرا!!!

خوای بەرزو مەزن لە ئایەتی (١٣)ی (حوجرات) داوای "عەولەمەی مەعریفی" لە نێوان قەومەکان دەکات، بۆیە دەقی قورئان بەقەد گەردیلەیەك باوەڕی بە سڕینەوەی هیچ نەتەوەیەك نییە، بۆیە پاکتاوی ڕەگەزی و سڕینەوەی نەتەوەی تر، تەواو دژ بە گوتاری قورئانییە.

هەموو نەتەوەکان لە (ئادەم و حەوا) دروستکراون، (ئادەم)یش خۆی لە خاك دروستکراوە، جا ئەی خەڵکینە! ئێوە کراون بە قەومی جودا، تا یەکتر بناسن، نەك یەکتر بسڕنەوە، ئەوەی مرۆڤێك لە مرۆڤێکی تر جیا دەکاتەوە تەقوایە، نەك جۆری نەتەوە.

براینە! ئەوەندەی (ئەبو لەهەب) و (ئەبو جەهل)ی نوێنەری دەسەڵاتی عەرەبی جاهیلی، شەڕی گوتاری قورئانی کرد، لەوانەیە کوردەکانی نێو دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمی، هێندە شەڕی لەشکری ئیسلامیان نەکرد بێت، (بەلازری) و... (ڕۆژبەیانی) ئەو شاهێدییە دەدەن.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾

گەلۆ! ئێوەم لە نێر و مێیەك خەڵقکردووە هەروەها ئێوەشم کردووە بە گەل و هۆزی جیا بۆ ئەوەی یەکتر بناسن، بەرێزترین کەس لە ئێوە بە تەقوادارترتانە.

ئەمە گوتاری دەقی قورئانە، ماوەی (٩-٤٠) ماوەی قورئانی کردارەکیە، خودا لێیان ڕازی بوو، (سەید قوتب)یش گوتەنی ئەوانە نەوەی قورئانی بێوێنە

بوون ... جا لە سەر ئەو بنیاتە هەوڵدەدەین ئەو (٣١)ی ساڵەی نێوان (٩-٤٠)، بە پێوەری دەقی قورئانی شرۆڤە بکەین .

لێرەدا هەر ستەمێك لە نەتەوەی دی کرابێ، پێچەوانەی دەقی قورئانی کەلامی و، قورئانی کردارەکی ماوەی سەحابەیە، هەروەها ئەو سەحابانە توند بووبن بەرانبەر کوردی ناو دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمی ، هەر ئەو سەحابانە بەرانبەر عەرەبی باب و برا و کوڕی نەتەوەی خۆیان بوونە، بە هەمان شێوەش پێشمەرگەی کورد، دژ بە کوردەکانی ناو ڕژێمی: (عیراق و ئێران و سوریا و تورکیا)ن، چونکە ئەو "کوردانە" هەر بە جل و زمان کوردن، ئەگینا هەرگیز نوێنەری کورد نەبوون و نیین، هەروەها ئەو سەحابانە بە قەوڵی قورئان، لەگەڵ یەکتر بەبەزەیین.

# لەپرسی دووەمدا
# ناساندنی زاتی خوا
# لە ڕێگای (فتوحات)ەوە

پرسی فتوحات، پرسی "زۆرینەکردن لە سەپاندنی دینی تر"-ە، نەك تواندنەوە و، سڕینەوەی ئەویتر. ئەم تێکستە گوزارشت لە جیهانبینی و بەکردەوەکردنی تێکستە. کەواتە: فتوحات پیادەکردنی دوو چەمکەیە یەکەمیان: بەکردارکردنی پرانسیپەکانی قورئان بۆ هەموو خەڵك و، بەزاندنی نەتەوەیە، چونکە (٢٣) پێغەمبەر لە( ٢٥) پێغەمبەری قورئان، باس لە کێشەکانی نەتەوە دەکەن .

دەقەکانی قورئان سنوورەکانی نەتەوە دەبەزێنن . واتە: لە ڕووی تیۆرییەوە، کەلامەکانی نێو قورئان، قسە لە سەر عالەمیبوون دەکەن .

ئایەتی: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ... ﴿٢٥٦﴾ ﴾

وەك تێکستێکی قورئان بۆ ناساندنی زاتی خودا بووە بە نەتەوەکانی تر، ئەوەتە کەسێکی ویژدان زیندووی وەك: (دکتۆر زیگفرید)، گەورەبووی ناو کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی لە (ل٤٧)ی کتێبی: (الله لیس کما تروجون) دا، ئامانجی فتوحاتی ئیسلامی لە دێڕێکدا کورت دەکاتەوە : "بریتی بوو لە بڵاوکردنەوەی وشەی (الله)، نەك بڵاوکردنەوەی عەقیدەی ئیسلامی ."

وێڕای کێشەکانی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی: (ساسانی و ڕۆمی)، بە ڕێککەوتنامەیەك کۆتاییان بە شەڕی نێوانیان هێنا، دەستیان کرد بە دەستوەردان لە کاروباری دەوڵەتی ئیسلامی .

نامە ئاشتی ئامێزەکانی پێغەمبەر بۆ هەردوو ئیمپراتۆر، دەرگاکردنەوە بوو، بەڵام هەردوو ئیمپراتۆر، لە بریتی بە گوتاری کەلامی ئیسلام ڕازی بن، کەوتنە هەڕەشەکردن لە دەوڵەتی ئیسلامی، بۆیە گواستنەوەی ئیسلام بە میکانیزمی فتوحات لە دوورگەی عەرەبی بۆ وڵاتی دی، بووە شتێکی حەتمی.

هەر بۆ نموونە: هەتا دوو ساڵ بەر لە وەفاتی پێغەمبەر، قورئان تاك و تەرا نەبێت دەرەوەی جەزیرەی عەرەبی بە کردەوە نەبینی بوو، بەڵام هەڕەشەی سەربازی ڕۆم، لە (تەبوك) و دەستوەردانی ساسانی لە "حروب الردة"، میکانیزمی شمشێر بۆ بەرەنگاری لە دەوڵەتی ئیسلامی، بووە کارێکی ناچاری .

سترەکچەری ئەو دەوڵەتە ئیسلامیەی مەدینە، گوزارشتی لە کۆمەڵگای فرە نەتەوە دەکرد . ڕاستە پێکهاتەی عەرەب، پێکهاتەی سەرەکی ئەو دەوڵەتە بوو، بەڵام نەتەوەی دی لە سەر ئاستی تاك، وەك: (سەلمان فارسی، بیلالی حەبەشی، سوهەیبی ڕۆمی، گاوانی کوردی) لە دەوڵەتی مەدینە ئامادەگیان هەبوون.

لە دوای پرۆسەی فتوحات، ئەو تێکەڵبوونەی عەرەب بە نەتەوەکانی دی، لە دوا ساتەکانی ماڵئاوایی پێغەمبەر و، بەرایی حوکمی ئەبوبەکر دروست بوو.

لە سەردەمی خەلیفە (عومەر)، هەتا (عەلی)، زۆر نەتەوەی دی هاتنە نێو ئیسلام وەك: (فارس و کورد...)، بۆیە پێویست بوو (سەر-فتحە) و (بۆر-زەمە) و (ژێرە- کەسرە )و تەنوین بۆ دەقی قورئان بکرێت، تا ئەو نەتەوە (نا-عەرەب)انە بەدروستی لە قورئان بگەن، ئەو پرۆسەیە بۆ ناساندنی ئیسلام بوو، کەچی هەندێ شەهادەداری کورد بە پرۆسەی بەعەرەبکردنی دادەنێن.

کەواتە فتوحات هەم ئاشنابوون بوو بە نەتەوەی دی، هەم بە کردەوەکردنی دەقەکانی قورئان بوو، هەروەها دانانی ئاماژەکان بوو بۆ قورئان، هەتا قەومەکانی ناعەرەب لەوانە: کورد لە قورئان تێبگەن .

# پێغەمبەر و کورد
## ( ١ - ١١ ) کۆچی

پێغەمبەری ئیسلام، جیا لە پێغەمبەرەکانی تر، جگە لە ئادەم پێغەمبەر، کۆتایی بە ئاخاوتن و پەیوەندی کەلامی زەوی و ئاسمان هێنا .ئەو کۆتایی مێژووییە، لە کەلامی ئیلاهی بۆ مرۆڤەکان، ئیسلامی کردۆتە پەیامێکی ئەودیوی سنووری نەتەوە و، بە تەواوی سنووری نەتەوەی دیارکراوی بڕیوە.

لەم ڕوانگەوە، موحەممەد پێغەمبەر وەك هەر مرۆڤێك لە نەتەوەیەکە، جا ئەو نەتەوە عەرەب بی، یان نەتەوەی بە عەرەبکراو، بەڵام پەیامەکەی، کە دوا پەیامی ئاسمانە بۆ مرۆڤەکان، پەیامێکی ئینتەرناشناڵە، نەك ناشنال و لۆکالی.

زۆر قسە لە سەر کارەکتەری هاوەڵەکانی پێغەمبەر: (عەرەب و ئەسیوبی - حەبەشی و فارسی و ڕۆمی) کراوە، بەڵام زۆر کەم باسی سەحابی کورد کراوە. لەوانەیە نەوەکانی نەتەوەی عەرەبی و فارسی و ڕۆمی کاریان بۆ ئەوە کردبێت، کە کارەکتەری سەحابی کورد بشارنەوە، بە تایبەتی عەرەبەکانی عێراق و سوریا!.

لە کتێبەکانی فەرموودە تەنیا باسی یەك سەحابی کورد کراوە، ئەویش جاوانی کوردی (گاوانی کوردی)یە. گومان دەبردرێ: گاوانی کوردی لە مەدینە بەخزمەتی پێغەمبەر گەیشتووە، واتە: لە نێوان (١-١١)ی کۆچی.

(جابانی کوردی)، نووسەر (١٤٣٢)، لە (ل٢٠-٢١)ی کتێبی: (کورد لە فەرهەنگی شیعەدا) دەنووسێت: "مەیمونی کوردی لە باوکی دەگێڕێتەوە، کە لە ترسی ئاخاوتنی پێغەمبەر زیاد، یان کەم بکات، بە دەگمەن باوکی، بە دەگمەن فەرموودەی لە پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، فەرموودەی وەك: " هەر کەس بە ئەنقەست درۆم بە دەمەوە بکات، ئەوا باشوێنی خۆی لە ئاگر خۆش بکات.

(جابانی کوردی)، نووسەر لە پەراوێزی (ل٢١) دەنووسێت : دەقی وەك :" هەرکەس بە ئەنقەست درۆم بە دەمەوە بکا، ئەوا با شوێنی خۆی لە ئاگر خۆش بکا - بوخاری " صەحیحە.

لای (ل١١٧)ی (شەرەفنامە)، جابان-ی سەحابەی پێغەمبەر (گابان کوردی)-ە هەروەها باوکی تابعی (مەیمون ئەبو بەصیر)-ە . لەوانەیە گاوان لە بەر دوو هۆ فەرموودەی لە پێغەمبەر نەگێڕاوەتەوە:

١- کورد بووە لە کۆمەڵگایەکی عەرەبی و تەواو عەرەبی نەزانیوە.
٢- کەم لە مەدینە ماوەتەوە و زۆر لەگەڵ پێغەمبەر نەژیاوە.

هیچ سەرچاوەیەك شك نابرێ، کە ئاماژەی بە (سێزدە) ساڵی پێغەمبەرایەتی و کورد کردبێت. ئەمەش لەبەر دوو هۆ بووە:

١- دەسەڵاتی عەرەبی هەموو گوشارێکی خستبووە سەر بزاوتنەکانی پێغەمبەر و یارانی، کە کاریگەری دینی نوێ لە مەککە دەرنەچێ!

٢- کورد لە هەردوو دەوڵەتی: (ساسانی و بێزەنتی) ئازاد نەبوو، هەروەها لە نێوان سنووری: (مەککە) و (کوردستان)، ناوچەی تر هەبوون.

ئیسلام دینێکە باوەش بۆ هەموو نەتەوەکان دەکاتەوە، کەسانی غەیرە عەرەبی، وەك :(صهیب ڕۆمی و بیلالی حەبەشی و سەلمان فارسی) گەورەبووی ناو کۆمەڵگەی عەرەبی بوون، بە واتای هەموو عەرەبی زان بوون و، کێشەیان لە تێگەیشتنی قورئان نەبوو.

پێغەمبەر لە مەدینە دەسەڵاتی بۆ دروست بوو، بە تایبەتی لە دوای جەنگی (بەدر)دا.

سروشتی پێکهاتەی مەدینە وەك مەککە نەبوو، مەدینە کۆمەڵگایەکی تەواو عەرەبی نەبوو، بەڵکو زۆر نەتەوەی تری لێ بوو، لەوانە: (جولەکە، فارس) هەروەها هەر لە مەدینەوە، دەکرا پەیوەندی لەگەڵ (بابل) و (مصر) و ( میدیا) پەیوەندی ببەستێت، ئەو کرانەوە جیوگرافیە تەواو بە قازانجی ئیسلام تەواو بوو.

**زۆربەی سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن، کە موسڵمانبوونی کورد، لە سەردەمی پێغەمبەرەوە دەستی پێکردووە . لێرەدا ئاماژە بە چەند سەرچاوەیەك دەکەین:**

**١- (کوردستان لە بەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا)، (چ٤، ل٣٩):**

حەسەن مەحمود (٢٠٠٧) لە (ل٣٩)ی ئەم کتێبە دەنووسێت: " هێشتا بانگەواز لە قۆناغی مەککەدا دەبێ، کە کورد (جابانی کوردی - کابانی کوردی) بە نوێنەر دەنێرێ بۆ مەککە و مەدینە و، هەواڵی کورد دەگەیەنێ بە ئیسلام و، هەواڵی پێغەمبەر و ئیسلام بۆ کورد دەهێننەوە، ئەمە جگە لە نوێنەری ناوچەی (جزیره) و بازرگانەکانی هۆزی (باجن)."

قۆناغی مەککە بۆ موسڵمانانی مەککە سەخت و دژوار بوو، جا چ جای شاندێکی کوردی نابەڵەد؟ بۆیە رێی تێناچێ جابانی کوردی لە مەککە پێغەمبەری بینیبێ.

لە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر لە (تائیف) زاتی خۆی داوای "پەنادان" لە موشریکانی پیاو ماقووڵ کردوو، تا لە ستەمی دەسەڵاتی عەرەبی بیپارێزن.

(المبارکفوری ) لە (ل١٥١)ی (الرحیق المختوم)دا ئەم دیمەنە وا دەگوازێتەوە: "دوای (تائیف)، پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەرەو مەککە کەوتە رێ، هەتا لە مەککە نزیك بۆوە، لە (حراُ) مایەوە، پیاوێکی خێڵی (خزاعە)ی نارد بۆ لای (اخنس)ی کوڕی - شریق - تا پەنای بدات، وتبوی: من پەیمانم داوە، پەیماندەریش ناتوانێت پەنای کەسی تر بدات، ئەنجا ناردی بۆ لای - سهیل - کوڕی عمرو، سهیل وتبوی: (بنی عارم) هەرگیز بەسەر - بنی کعب-دا پەنای کەس نادەن!!".

دوای ئەوەی لەو دوو هەوڵەی پێغەمبەر سەری نەگرت، پێغەمبەر کۆڵی نەدا " ئەمجارە کەسێکی نارد بۆ لای ( مطعم )ی کوڕی (عدی)، ( مطعم) وتبوی : بەڵێ من پەنای دەدەم... هەروەها هاواری کرد : ئەی خێڵی قورەیش! من موحەممەدم پەنا داوە ...(ئەبو جەهل)یش ناچار بوو بڵێت : ئێمەش پەنای کەسێك دەدەین، کە تۆ پەنای بدەیت."

دەربارەی ئەو هەڵوێستە جوامێرانەی کوڕی عەدی لە (صحیح بخاری) هاتووە: "پێغەمبەری خوا ئەم پیاوەتیەی (مطعم)ی لەبەرچاو بوو، لەبارەی دیلەکانی بەدرەوە فەرمووی : ئەگەر (مطعم) ی کوڕی (عدی) لە ژیاندا بوایە و، لە بارەی ئەم دیلانەوە قسەی بکردایە، هەموویانم بۆ بەردەدا."

نازانم کەسێك لە وڵات و زێدی خۆی پەنابەر بێت، لە کوێ دەتوانێ پێشوازی لە شاندی تر بکات بەتایبەتی کوردی بەرگ و زمان جودا لە عەرەب؟!

بۆیە واپێدەچێ لیقای پێغەمبەر و جابان لە مەدینە بووبێ .

سەبارەت بە شاندی (جەزیرە)ش، ڕێ تێناچێ ئاگایان لە هاتنی جابان بوو بێ، چونکە زۆر لە یەك دوور بوونە. (مەسعود عبدالخالق) یش لە کتێبەکانیدا، ئاماژە بەو شاندە کوردییەی (جەزیرە) دەکات.

ڕزگارکردنی زۆربەی ئەقلیمی جەزیرە و باکووری کوردستان، ئەم دەنگۆیەی لە لاپەڕە (چواردە)ی (شەرەفنامە) پشتڕاستدەکاتەوە، کە گوایە: کۆمەڵێك کوردی بازرگانی هۆزی (بازن) لە لای بۆتانەوە (جەزیرەی بۆتان) چوونەتە (تایف) و لە سەر دەستی پێغەمبەر موسڵمانبوون! ".

ئەو موسڵمانبوونەی بازرگانی کورد، پێش فتوحات ئیسلامی ڕەگێکی هەیە، چونکە زۆربەی سەرچاوەکانی: (طبری و ئیبن ئەسیر و ...المقدسی) ئاماژە بەوە دەکەن،( جەزیرە و نصبین...)بەبێ شەڕ موسڵمانبوون، یا بەجزیە لە سەر دینی خۆیان مانەوە. "ئەوەی جێی گومانە گەیشتنی ئەو کۆمەڵە بازرگانە بە پێغەمبەر لە تایف!!

**٢- (تأریخ الکرد فی العهود الاسلامیة) (٢٠١٣، ل١٤٤-١٤٦):**

دکتۆر (ئەحمەد مەحمود خەلیل)، نوسەری کتێبەکەی سەرەوە، لە (ل١٤٤-١٤٦) باسی جابان، لە چەند کتێبێکی ئیسلامی دەگوازێتەوە، لەوانە: (زەهەبی، مالك بن دینار، ئەبو داود، یەمانی، ئیبن حەجەری عەسقەلانی). هەموو ئەو سەرچاوانە جەخت لە سەر ئەوە دەکەن، کە پێغەمبەر و جابان یەکتریان بینیوە، لەوانەیە ئەو بینینە چەند جارێکیش بوبیت.

خەلیل لە (ل١٤٦) دا چەند گریمانێك بۆ بوونی جابان لە جەزیرەی عەرەبی دادەنێت:

١- بەزۆری ڕا وایە، کە لە مەدینە بووبێ.
٢- لەوانەیە لە مەککە بووبێ بە هۆی بازرگانییەوە، پاشان بەرەو مەدینە کۆچی کردبێت.

٣- لەوانەیە دیلی شەڕی ساسانی و ڕۆمانی بێت، لە بازاری بەندەفرۆشی مەککە بووبێ، چونکە عەرەبیەکەی لە فەرموودە گێڕانەوە و تێگەیشتن لە فەرموودەدا، ئەوە دەسەلمێنێ، کە ماوەیەکی زۆر لە حیجاز بووە.

(جابان) کە نزیکەی (دە) جار پێغەمبەری بینیوە، وەك مەیمونی کوڕی دەڵێت: ئەم فەرموودەیەی لە پێغەمبەر گێڕاوەتەوە: "من تزوج امرأة و هو لا ينوي الا يعطيها الصداق ، لقي الله و هو زان واتە: ئەو مرۆڤەی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك کردو، نیەتی وابوو مارەییەکەی نەداتێ ئەوە ئەو دەمەی بە خوا دەگات، وەك زیناکارێك وایە."

جارێ سەرەتا لەم فەرموودەدا، (ئەحکام) بوونی هەیە، بۆیە هەر زوو پرسی دیتنی (جابان) لە مەککە هەڵدەوەشێتەوە هەروەها بە حوکمی عەرەبی زانیەکەی، کە توانیویەتی فەرموودە لە زاتی پێغەمبەر بگێڕێتەوە، لەوانەیە (جابان) ماوەیەکی زۆر لە حیجاز بووبێ، نەك بە شاندێکی چەند ڕۆژی ئەو عەرەبیەی زانی بێت. مەسعود عبدالخالق لە (ل٢٩)ی کتێبی: (ڕۆڵی عەلمانیەت لە دروست بوونی مەینەتی کورد) دا دەنووسێت: " جابانی هاوەڵ، نزیکەی ساڵێك ڕاستەوخۆ لە دیدەنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوە، دوایش گەڕاوەتەوە (مەرگە) و لە دژی زوڵم و زۆری فارسەکان خەباتی کردوە."

موحەممەد ئەمین زەکی لە (ل٩١)ی (خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان)قسەیەکی واقیعی تۆماردەکات، کە لەوانەیە (جابان) بە تەنیا نەبووبێ و کەسی تری لەگەڵدا بووبێ، کە دەڵێ :" موحتەمەلە، بێجگە لە جابان بەعزێ صەحابی تری کوردیش، ببێ."

ئەو مانەوە یەك ساڵیەی (جابان) لە مەدینە، پاڵپشتێکی بەهێزی گێڕانەوەیتی، هەروەها گەڕاندنەوەی ئەو، بۆ (مەرگە) بە شوناسی موسڵمانەوە، پرسی فتوحاتی ئیسلامی لە وڵاتی کوردان ئاسانتر کرد.

ئەوەتە طبری لە (ل٦٠٩) و مەلا جەمیل رۆژبەیانی لە نامیلکەی: (رەشەخاکی عیراق) ئاماژە بەوە دەکەن، کە کورد و عەرەبە موسڵمانەکان، پێکەوە کەوتوونەتە راماڵینی دەسەڵاتی ساسانیەکان لە وڵاتی کوردان.

### ٣- شەرەفنامەی بدلیسی، (ل١٦) ی چاپی کوردی:

لە لاپەرە (شازدە)ی چاپی کوردی (شەرەفنامە) دا، هەژار موکریانی (١٩٨١) بوختانێکی هەڵبەستراو لە لایەن داگیرکارانی کوردستان، دەربارەی پەیوەندی پێغەمبەر و کورد دەنووسێت:" ئۆرغانی تورکستانی، (بوغدوز، ناوی کوردستانی) ناردە لای پێغەمبەر . (بوغدوز) ئەوەندە ناشیرین و رەزاگران بو : پێغەمبەر بێزی لە چرچاوی هەڵقرچاوی هەستا و، لە داخانی توك و نەفرینی لە هەمو کوردی سەرزەمین کرد!"

هەژار موکریانی دەربارەی ئەم درۆ و دەلەسەیە دەنووسێت: "حاشا، کە پێغەمبەری خوا ئاکاری وا نالەباری بوبێ، ئەم درۆپوچ و بەریادە لەدەمی ئەوانە زیادە، کە بۆ لاکی مرداری دنیا رێکیان خستوە."

نوسەرێك بە ناوی (جابانی کوردی) لە (ل١٧٩-١٨٠) دوو گێڕانەوەی (کولەینی) (بوخاری شیعەکان!) و (رەبیع شامی) دەهێنێتەوە، کە زۆر لەو چیرۆکەی سەرەوە پیسترە.

(کولەینی) لە ( ئەبو رەبیعی شامی )یەوە ریوایەت دەکات، دەڵێ :

"سألت أبا عبدالله - عليه السلام - فقلت: ان عندنا قوما من الاكراد ، وانهم لايزالون يجيئون بالبيع ، فنخالطوهم و نبايعهم ؟ فقال يا ابا الربيع ! لا تخالطوهم، فإن الاكراد حي من احياء الجن ، كشف الله عنهم الغطاء ، فلا تخالطوهم ))

واتە: پرسیارم لە ئەبو عبدالله کرد - علیه السلام - وتم : ئێمە خەڵکانێکمان لایە کوردن، شت دەفرۆشن، ئایا تێکەڵاوی و کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ بکەین؟ ئەویش وتی: ئەی باوکی ڕەبیع! تێکەڵاویان مەکەن، کوردەکان بەشێکن لە جنۆکە، بەڵام خوای گەورە پەردەی لە سەر هەڵماڵیون، جا تێکەڵاویان مەکەن."

(ڕەبیع شامی) ڕیوایەتێکی دی دەگێڕێتەوە : "و لاتنكحوا من الاكراد احدا ، فانهم جيش من الجن كشف عنهم الغطاء)).

واتە: ژن لە کوردان مەخوازن، لەبەر ئەوەی سوپایەکن لە جنۆکە، پەردەیان لە سەر هەڵمادراوە."

**ئەو دوو قسەیەی (ڕەبیعی) تەواو پێچەوانەی قورئان و مێژووە :**

١- مرۆڤەکان بەدەقی قورئان لە هاوسەرگیری پەیدا دەبن، نەك لە جنۆکە، وەك دەفەرموێ ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا ﴾ هەروەها ابن عساکر لە حەسەن بەصیری دەگوازێتەوە کە وتویەتی: " الجن لا يتوالدون اي ان المرأة من الانس لا تلد من الجن (جابانی کوردی، ل٢١٣).

٢- لە مێژووی ئیسلامیدا هاوەڵێك نییە بەناوی: (ڕەبیع الشامی) !

٣- لە سەردەمی پێغەمبەردا، لە هیچ سەرچاوەیەك ئاماژە بە تێکەڵبوونی کورد بە عەرەب نەکراوە لە تیجارەت دا .

٤- (الاکراد و النبی)، ا.د.محمد بهجت قبیسی.

کتێبەکەی قبیسی (٣٣٠) لاپەڕەیە، ناوەڕۆکی هەرە زۆری دوورە لە ناونیشانەکەی، کورد و پێغەمبەر! لە (ل٢٥٠-٢٥١) لە ڕوانگەی واتای (کرد) وەك فەرمان سیفەتی (کوردێتی) لە (ئیبراهیم پێغەمبەر) و (موحەممەد پێغەمبەر) دەستێنێتەوە وەك دەنووسێت: "نجد في التراث الشعبي ان ابراهيم الخليل عليه السلام كردي ، نقول نعم لقد كرد من (اور) الى ( حران ) ثم الى (مكة مكرمة ) اى ابعد من ارضه و داره اي كرد من ارضه فهو كردي- لە تراسی میللی دەبینین،

کە ئیبراهیم خەلیل - سەلامی خوای لێ بێت (کورد)-ە، دەڵێین: بەڵێ (کوریدە - دوور خرایەوە) لە (ئور) بۆ (حەران) دوایی (مەککە)، بە واتای لە زەوی و زێدی خۆی دوور خرایەوە، کەواتە: کوریدە (دوور خرایەوە).

هەروەها هەر لە تراسی میللی دەبینین: هەندێك (موحەممەد پێغەمبەر) بە کوردی ناو دەبەن، ئەم کوردیبوونەی موحەممەدیش وەك کوردیبوونەکەی ئیبراهیم لە (مەککە) بە هۆی فاکتەری دینی و کۆمەڵایەتی زانراو بۆ ( مەدینە) دوور خرایەوە ."

ڕەچەڵەکی ئیبراهیم پێغەمبەر بۆ (سۆمەری)یەکان، وەك گەڕاندنەوەی ڕەچەڵەکی ئەوە بۆ (بابلی) و (کوردی). گەر ئیبراهیم پێغەمبەر بە هۆی باوەڕەکەی لە زێدی خۆی دوورخرابێتەوە، ئەوا دەسەڵاتی عەرەبی مەککە هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوە بوو، بانگەوازەکەی (موحەممەد پێغەمبەر) لە مەککە دەرنەچێت، نەك دووربخرێتەوە لە مەککە!!.

کەواتە: وشەکەی قبیسی (کوریدە - دوورخرایەوە) بەهیچ جۆرێك بە سەر ژیاننامەی (موحەممەد پێغەمبەر) پیادەنابێت، لەوەش زیاتر، پیرەمێرد لە (ل٤٢١)ی بەرگی یەکەمی دیوانەکەی(١٩٩٠) لە شیعرێك بەناوی "ستایشێکی پێغەمبەر" وەڵامی مرۆڤانی وەك: (بقیسی) دەداتەوە:

ئەو ئیبراهیمە، تۆ نەوەی ئەوی
لە کوردستانا دەرکەوت برەوی
باپیرە گەورەت فەخری کوردانە
مەڵبەندی ئەوە ئەم جێ و مەکانە
توخوا هەر لەبەر دڵی ئیبراهیم
دەردمان دەرمان کە، تەنیا تۆی حەکیم

## ئاگالێبوونی پێغەمبەر لە کورد :

دوای سەقامگیربوونی خۆشەویست(موحەممەد پێغەمبەر) لە مەدینە، کیانێکی دامودەزگایی لە مەدینە دروستبوو . (مبارکفوری) لە (ل٢٢٤-٢٣١) ی (الرحیق المختوم)دا لە ماوەی یەکی کۆچی و دووی کۆچی تەنیا هەشت سریە و غەزا قەوماون، هەروەها لە ماوەی (٢-٦) کۆچی دا، تەنیا سێ شەڕی گەورەی: (بەدر و ئوحد و ئەحزاب (خەندەك)) قەوماون."

لەو ڕوانگەوە ئەو (یازدە) ساڵەی مەدینەو مەککە، تەنیا چەند مانگێکی شەڕ بووە، ئەویتر هەمووی دروستکردن بووە .

لە مەدینەدا، موسڵمانی عەرەب بە نەتەوەی تر ئاشنا بوو، هەروەها تەواو ئەوە ساخ بۆوە، کە پەیامی ئیسلام جیهانیە، نەك لۆکالی . کورد لە نەتەوە بەراییەکان بوو، کە دوای عەرەب بە ئیسلام ئاشنا بێت، خودی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) تەواو ئاگای لە نەتەوەیەك بووە بە ناوی (کورد)، ئەوەتە محەمەد مەلا مەحمود (٢٠١٤) لە (ل٨٢-٨٣)ی کتێبی: ( کورد لە سەردەمی پێغەمبەردا) لە عەلی ئەکبەر دەگوازێتەوە، کە لە (ل١٨٠/فصل الدال المهملة) دا دەڵێ: "ڕۆژێ حەزرەتی فاتیمە (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری باوکی پرسی: ئایا زمانی غەیری عەرەبی هەیە؟ پێغەمبەریش (صلی الله علیه و سلم) فەرمووی: بەڵێ، زۆرە، وەکو: زمانی کوردی.

فاتیمەش سەری سوڕما، ئاخۆ دەبێ (کوردی) چ زمانێك بێت! لەو کاتەدا یەکێك لە دەرگای دا، حەزرەتی فاتیمە چوو دەرگای کردەوە، سەیری کرد پیاوەکە وتی: میمکە زەحمەت نەبێ (مەمەد) لە ماڵە؟ پێغەمبەریش (صلی الله علیه و سلم) فەرمووی: ئەوە زمانی کوردییە و، ئەوەش جویرشیلە، بڕۆ بڵێ: (مەمەد) لە ماڵە".

پیرەمێردی شاعیری کوردیش لە دێرە شیعرێك دەڵێت :

نازانی پێغەمبەری تۆ حەمەیە

ئەو (مەمەد و حەمە)یە بۆ خۆشەویستی لە بریتی ( موحەممەد ) بەکاردێت

هەروەها ژیان و وتەی پێغەمبەر ئەوەمان پێ دەڵێن: کە لە ئیسلامدا پۆشاکێکی نەتەوەیەکی دیارکراو ئیسلامی نییە، بەڵکو هەر پۆشاکێك سنووری ئیسلام بپارێزێت ئیسلامیە .

لە فەرموودەکەی نێو (سوونەتی ئیبن داود) بە کورتی ئەوها هاتووە :

"پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جل و بەرگێکی نیشانەداری لە بەر دابوو، نوێژی پێوە کرد. دوای ئەوەی نوێژی تەواو کرد، فەرمووی: نیشانەکانی ئەو پۆشاکە لە یادی خودا مژۆلی کردم و بیبەنە لای (ئەبی جەهەم) و جلێکی سادەم بۆ بێنن - لە نێو ئەو جلانەی هێنایان، ( پۆشاکە کوردی )یەکەی هەڵگرت .

پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! نیشانداڕەکە لە کوردیەکە باشتر بوو .- تەواوی فەرموودەکە لە نووسینەکەی د.فائیز لە گۆڤاری "دەنگی زانا، ژ (٢٠)،ساڵی (١٩٩٣)- دایە."

جابانی کوردی لە (ل١٩)ی کورد لە (فەرهەنگی شیعە)دا دەنووسێت :" شێخی ئەلبانی ئەو فەرموودەی بە (حەسەن) داناوە و ئیبن حەجەریش لە (فتح الباری) باسی دەکات، هەروەها ئەسڵی چیرۆکەکەش لە (بوخاری)دا هاتووە."

# پێغەمبەر و کورد

پێغەمبەری ئیسلام، جیا لە پێغەمبەرەکانی تر، جگە لە ئادەم پێغەمبەر، کۆتایی بە ئاخاوتن و پەیوەندی کەلامی زەوی و ئاسمان هێنا .ئەو کۆتایی مێژووییە، لە کەلامی ئیلاهی بۆ مرۆڤەکان، ئیسلامی کردۆتە پەیامێکی ئەودیوی سنووری نەتەوە و، بە تەواوی سنووری نەتەوەی دیارکراوی بڕیوە.

لەم ڕوانگەوە، (موحەممەد پێغەمبەر) وەك هەر مرۆڤێك لە نەتەوەیەکە، جا ئەو نەتەوە عەرەب بێ، یان نەتەوەی بە عەرەبکراو، بەڵام پەیامەکەی، کە دوا پەیامی ئاسمانە بۆ مرۆڤەکان، پەیامێکی ئینتەرناشنالە، نەك ناشنال و لۆکالی .

زۆر قسە لە سەر کارەکتەری هاوەڵەکانی پێغەمبەر: (عەرەب و ئەسیوپی - حەبەشی و فارسی و ڕۆمی) کراوە، بەڵام زۆر کەم باسی سەحابی کورد کراوە .

لەوانەیە نەوەکانی نەتەوەی: (عەرەبی و فارسی و ڕۆمی) کاریان بۆ ئەوە کردبێت، کە کارەکتەری سەحابی کورد بشارنەوە، بە تایبەتی عەرەبەکانی: (عێراق و سوریا)!

لە کتێبەکانی فەرمووده دا، تەنیا باسی یەك سەحابی کورد کراوە، ئەویش جاوانی کوردی( گاوانی کوردی)یە.

زەن وا دەبردرێ: (گاوانی کوردی) لە مەدینە بەخزمەتی پێغەمبەر گەیشتووە، واتە: لە نێوان (١-١١)ی کۆچی .(جابانی کوردی)، نووسەر (١٤٣٢)، لە ل(٢٠-٢١)ی کتێبی: (کورد لە فەرهەنگی شیعەدا) دەنووسێت:

"مەیمونی کوردی لە باوکی دەگێڕێتەوە، کە لە ترسی ئاخاوتنی پێغەمبەر، زیاد، یان کەم بکات، بە دەگمەن باوکی، بە دەگمەن فەرموودەی لە پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، فەرموودەی وەك: "هەر کەس بە ئەنقەست درۆم بە دەمەوە بکات، ئەوا باشوێنی خۆی لە ئاگر خۆش بکات."

(جابانی کوردی)، نووسەر لە پەراوێزی (ل٢١) دەنووسێت : دەقی وەك : "هەرکەس بە ئەنقەست درۆم بە دەمەوە بکا، ئەوا با شوێنی خۆی لە ئاگر خۆش بکا - بوخاری" صەحیحە.

لای (ل١١٧)ی (شەرەفنامە)، جابان-ی سەحابەی پێغەمبەر ( گابان کوردی )-ە هەروەها باوکی تابعی (مەیمون ئەبو بەصیر)-ە . لەوانەیە: (گاوان) لە بەر دوو هۆ فەرموودەی لە پێغەمبەر نەگێڕاوەتەوە:

١- کورد بووە لە کۆمەڵگایەکی عەرەبی و تەواو عەرەبی نەزانیوە.

٢- کەم لە مەدینە ماوەتەوە و زۆر لەگەڵ پێغەمبەر نەژیاوە .

هەر لە هەمان ماوەدا، کە پێغەمبەر لە شاری مەدینە بووە لە نێوان (١-١١) ی کۆچی (٦٢٢ +١ تا ١١ = ٦٢٣ یان ٦٣٣ زایینی ) ئاگای لە بوونی پۆشاکی کوردی بووە و پەسندی کردووە.

هەروەها ژیان و وتەی پێغەمبەر، ئەوەمان پێ دەڵێن، کە لە ئیسلامدا پۆشاکێکی نەتەوەیەکی دیارکراو ئیسلامی نییە، بەڵکو هەر پۆشاکێك سنووری ئیسلام بپارێزێت ئیسلامیە .

لە فەرموودەکەی نێو (سوونەنی ئیبن داود) بە کورتی ئەوهایە :

"پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) جل و بەرگێکی نیشانەداری لە بەر دابوو، نوێژی پێوە کرد . دوای ئەوەی نوێژی تەواو کرد، فەرمووی: نیشانەکانی ئەو پۆشاکە لە یادی خودا مژۆلی کردم و بیبەنە لای (ئەبی جەهەم) و جلێکی سادەم بۆ بێنن - لە نێو ئەو جلانەی هێنایان، پۆشاکە کوردیەکەی هەڵگرت . تەواوی فەرموودەکە لە نووسینەکەی د.فائیز لە گۆڤاری "دەنگی زانا، ژ (٢.)،ساڵی (١٩٩٣) - دایە .

جابانی کوردی (١٤٣٢) لە (ل١٩)ی (کورد لە فەرهەنگی شیعە)دا دەنووسێت: "شێخی ئەلبانی ئەم فەرموودەی بە حەسەن داناوە و ئیبن حەجەریش لە (فتح الباری)دا باسی دەکات، ئەسڵی چیرۆکەکەش لە بوخاریدا هاتووە ."

ناسیۆنالیستی تورك ئەو پەیوەندیەی نێوان پێغەمبەر و کورد دەشێوێنێت. بۆ ئەو مەبەستەش چیرۆکێکی ئەفسانە ئامێز دەگێڕنەوە، گوایە: "ئوغوزخانی تورکستان ( بوغدوز ناوی کوردستانی )ناردە لای پێغەمبەر، (بوغدوز) ئەوەندە ناشیرین و ڕەزاگران بو، پێغەمبەر بێزی لە چرِوچاوی هەڵقرچاوی هەستا و لە داخانی، توك و نەفرینی لە هەمو کوردی سەرزەمین کرد! - (شەرەفنامە) پێشەکی هەژار (ل١٦).

" هەر لە هەمان لاپەڕەدا هەژار موکریانی دەنووسێت : "حاشا کە پێغەمبەری خوا وا ئاکاری وا نالەباری بوبێ ، ئەم درۆپوچ و بەربادە لە دەمی ئەوانە زیادە، کە بۆ لاکی مرداری دنیا ڕێکیان خستوە ."

لەوانەیە ئەو گێڕانەوەی (خواجە) لە (تاج التواریخ) تەنیا بۆ مەجلیس گەرمکردنی تورك بوویێت، بەڵام ئەمڕۆ کۆمێك شەهرەدار دەیانەوێ بەو درۆیانە پەیوەندی ڕەگ داکوتراوی پێغەمبەر و کورد هەڵتەکێنن، لە وەڵامی ئەوانەش شیعرەکەی مەلای گەورە دووبارە دەکەمەوە :

ئەوی ڕێگای لە کوردەکان گۆڕی
لەعنەتی خوای لە ئەلحەد و گۆڕی

# لە هاوکێشەی فتوحاتی ناوچە کوردییەکان دا دوو کارەکتەر ئامادەگیان هەیە:

## یەکەم: خەلیفەکانی پێغەمبەر:

بە قسەی (ل١٤٩) (ئالوسی) لە ماوەی (٢٣) ساڵ پێغەمبەرایەتی دا (١٢٤) هەزار ئەصحابە پەیدا بوون، هەروەها بە قسەی (ابن صلاح) (١١٤) هەزار ئەصحابە گوێیان لە پێغەمبەر بووە. (قاسم محمد٢٠١٤، هاوەڵان و خەلیفەکانی ڕاشیدین، ل٧).

لە قورئاندا (سێ) ئایەت هەن، خودا وەسفی ئەنصار و موهاجیرەکان دەکات :

١- ﴿...سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ...﴾ الفتح ٢٩.
٢- ﴿...رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ...﴾ التوبة،١٠٠.
٣- ﴿...وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ...﴾ الحديد،١٠.

ئەم سێ ئایەتە تەواو بۆچوونەکەی ( مەحوی ) بە ڕاست دەگێڕن، کە مەدینە بۆ کەسێکی تازە هاتوو پێغەمبەرستان بوو.

لە پرسی فتوحاتی کوردستان، بە تایبەتی کوردستانی ساسانی لە هەر چوار خەلیفەی ڕاشیدین، کە بریتین لە:

١- ئەبوبەکری صدیق (١١-١٣ک).
٢- عومەری کوڕی خەتتاب (١٣-٢٤ک).
٣- عوسمان کوڕی عەففان (٢٤ -٣٥ک).
٤- عەلی کوڕی ئەبی تالیب (٣٥-٤٠ک).

لە حوکمڕانی ئەو چوار خەلیفەیەدا، تەنیا دوو بە کردەوە ناویان لە فتوحات دێ، ئەویش: خەلیفە عومەر و خەلیفە عوسمانن، ئەبوبەکر هەر پاش شەڕی: (یەرموك)و(اجنادین) کۆچی دوایی کرد.
بە واتای هێزەکەی نەگەیشتە کوردستان، هەرچی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە، دەوری لە عومەر و عوسمان زۆر کەمتر بووە، لە فتوحاتی ناوچە کوردییەکاندا.

## پرسی شەهیدبوونی پێغەمبەر و خەلیفەکانی:

لە پەراوێزی یەکەمی لاپەڕە (٦٣)ی کتێبی: (خەلیفەکانی پێغەمبەر) هاتووە : "الشعبی دەڵێ: ماذا نتوقع من هذه الدنيا الدنية، وقد سم رسول الله (صلى الله عليه و سلم) وسم ابوبكر - رواه الحاكم/ تأريخ الخلفا/ للسيوطي/ ل٨١.

واتە: چی لەم دنیا کاتیە چاوەڕێ بکەین، پێغەمبەری خوا ژەهراوی کرا، ئەبوبکریش ژەهراوی کرا.
ژەهراویکردنی پێغەمبەر لە خەیبەر بوو، کە کاریگەری خۆی درەنگ پیشاندا، بەم چەشنە هەموو خەلیفەکانیشی، کە بریتی بوون لە: (ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و حەسەن و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) شەهید کراون."

## خەلیفەکانی پێغەمبەر نە بە کۆیلەکردنی مرۆڤ ڕازی بوونە، نە بە جیاوازیکردن لە نێوان نەتەوەکان دا:

خەلیفەکانی پێغەمبەر(صلى لله عليه وسلم) هەڵویست و وتەی ئەوتۆیان هەیە، کە بەردیش لە ئاستیان دەهێنێتە دەنگ، هەتا لەبەردەم پێغەمبەرەکەیان ڕاستی بدرکێنێت.
ڕەحیم ئەحمەد لە (ل٧٢)ی ماستەرنامەکەی: (دوو هەڵوێستی ئیمامی عومەر و ئیمامی عەلی) لە سەرچاوە عەرەبیەکان دەگوازێتەوە .(یەعقوبی) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە یەکەمین کاری خەلیفە عومەر بریتی بووە لە:

ڕەتکردنەوەی تالآنکراوەکانی جەنگەکانی هەڵگەڕاوەکان (حروب الردة) بۆ خاوەنەکانیان، ئەمەش بۆ ئەو مەبەستە بوو، کە تالآکردنی پیاو و ئافرەت و منداڵ، نەبێتە عادەتێکی هەمیشەیی لای عەرەب ."

(ئەحمەد بن یەعقوب) شیعەیەکی توندڕەو بوو، مامۆستا ئیکرام کەریم (٢٠٠٧) لە (ل١٨)ی (دەوڵەتی خیلافەت) دەربارەی دەنووسێت: کە نووسەرێکی شیعە توندڕەوەکانە و، ناتوانێت دەربارەی مێژووی ئیسلامی بە ویژدانەوە قسە بکات، چونکە بڕوای بەو مێژووە هەر نییە، یان لاوازە."

هەر ڕەحیم لە (ل٧٢)ی ماستەرنامەکەی دەگێڕێتەوە: عەرەبەکان چوونە لای خەلیفە (عەلی) پێیان وت، کە دان بنێت بە چاکەی عەرەبدا بە سەر مەوالی و عەجەمدا، ئەو سەروەت و سامانەی کە هەیە بیدات بە عەرەبەکان و، مەوالییەکان بێبەش بکات، بەڵام (عەلی) بەمە ڕازی نەبوو، لە وەڵامدا پێی وتن: دەتانەوێت لە ڕێگای ستەمکارییەوە سەرکەوتن بە دەست بهێنن؟"

کەواتە لە ڕۆژە کۆتاییەکانی تەمەنی خەلیفە عەلی، ستەمکاری مرۆڤ خەریك بوو، دەبووە سیستەم، ئەو دەمەش فتوحات لە کوردستان کۆتایی پێهاتبوو.

## دووەم: پرسی (أولوا بأس)

عەرەبی دوور لە ئیسلام و عەرەبی بەداوی کۆچەری عەرەبی تالآنکەر و دوور لە عومرانیەت بوون .

لەمەی سەرەوە دەردەکەوێت، کە دەسەڵاتی عەرەبی و دەشتەکی عەرەبی، گەورەترین شەڕیان لەگەڵ ئیسلام کرد، وەك شەڕەکانی: (بەدر و ئوحد و خەندەق..)، کە بە هیچ جۆرێك بە شەڕی کوردی ناو دەسەڵاتی ساسانی لەگەڵ ئیسلام بەراورد ناکرێت!

بەرایی ئایەتی سورەتی (الفتح)، سوڵحی حودەیبیە بە ( فەتحی موبین ) دادەنێت . بەڵێنەکانی قورئانیش، بەڵێنی خودان، کەواتە: دەبێ هەر ڕووبدەن .
لە ئایەتی (١٦)ی ئەم سورەتەدا:

﴿قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَٰتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ﴿١٦﴾﴾

واتە: ئەی موحەممەد! بە دەشتەکییە دواکەوتوەکان بڵێ : ئێوە لەمەولا بۆ ڕوو بە ڕووبوونەوە لەگەڵ قەومێکی جەنگاوەر و توند بانگ دەکرێن : شەڕیان لەگەڵ دەکەن، یا ئەوان خۆیان موسڵمان دەبن".

لە خوێندنەوەیەکی زمانەوانی دەقەکەدا، ئەم هاوکێشەیە فۆرمەلە دەبێت : انتم الاعراب تقاتلون تلك قوم و هذا قوم يقاتلونكم او يسلمون - ئێوەی دەشتەکی شەڕی ئەو قەومە دەکەن، ئەوانیش یا شەڕتان لەگەڵ دەکەن، یا خۆیان موسڵمان دەبن..

**پێش ئەوەی دەقەکە بە فتوحاتی کوردستان ببەستمەوە، دەمەوێ ئاماژە بە چەمکی جزیە بکەم ..**

(جزیە) باجێکی سادەیە، کە دەوڵەتی ئیسلامی بە سەر غەیرە موسڵمانی ئەهلی کیتابی دەیسەپاند. ئەو باجە بۆ هەموو نەتەوەیەکی کتابی بوو، ئەمەش لە بەرانبەر پاراستنی ئاسایشی ئەو مرۆڤە کیتابییە بوو.

(جزیە) بە هیچ جۆرێك بە باجی ئەورووپی بەراورد ناکرێت، زۆربەی خەڵك، (باج) تەواو باری قورس کردووە، بۆیە ئەستێرەکانی بواری: وەرزشی، هونەری لە باج ڕادەکەن، هەرچی (جزیە)یە لەگەڵ زەکاتیش بەراورد ناکرێت.

هەموو ئافرەتێکی موسڵمانی پارەدار، دەبێ زەکات بدەن، بەڵام ئافرەتی ئەهلی کیتاب، (جزیە) نادات ... کەواتە (جزیە) خەڵات بوو، نەك سزا .

**دەربارەی ئەو قەومە نەناسراوە زۆر قەوم دەستنیشانکراون :**

١- موحەممەد سلێمان الاشقر لە (ل٦٨١)ی (زبدة التفسير)..عەرەب لەو ئایەتە - يقاتلون او يسلمون - دوور دەخاتەوە و دەنووسێت: "اى :يكون احد الأمرين : اما المقاتلة ، او الاسلام لا ثالث لهما ، و هذا حكم الكفار الذين لا تؤخذ منهم الجزية ، فقد شرع اخذ الجزية من غير العرب." کەچی زۆربەی ڕاڤەکاران باس لەوە دەکەن، کە

بەشی یەکەمی ئایەتەکە، ئاماژەیە بۆ قەومی (هوازن) !! ئایا عەرەبی دیان و جوولەکە نەبووە و نییە؟!

مامۆستای ڕەحمەتی: ئەحمەدی کاکە مەحمود لە (ل٨١١)ی (تەفسیری ڕامان) دەڵێ: ئاماژە بەو قەومانە کراوە :

٢- لا تقوم الساعة حتي تقاتلوا قوما صغار الأعين ، لف الانف كان وجوههم المجان المطرقة - قیامەت هەڵناستێ، هەتا شەڕ لەگەڵ قەومێکی چاو بچووك، لووت کورت و لووت پان و دەم وچاو دەڵێی ترس و مەتەڵەیە : "دەووترێت: ئەو قەومە تورکن !"

٣- تقاتلون قوما نعالهم الشعر - قەومێك پێڵاو و نەعلەکانیان لە مووە "دەوترێت: ئەو قەومە کوردە" وەك لە گێڕانەوەی فەموودەیەك هاتووە : "قال ابن أبي عمر: وجدت في مكان آخر: ابن أبي خالد عن أبيه قال: نـزل علينا أبو هريرة ففسر قول رسول الله (صلى الله عليه وسلم): " تقاتلون قومًا نعالهم الشَّعْر " قال:هم البارزون، يعني الأكراد.

٤- مامۆستا نیزامەدین عەبدلحەمید لە (ل١١٠٥) ی (تەفسیری گوڵشەن) دەربارەی ئایەتەکە دەپرسێت : "ئەو گەلە خاوەن توانایە کێ بوون ؟! هەندێك دەڵێن: هۆزی هەوازین و غەتەفان بوون لە شەڕی (حونەین) دا، بەڵام هەندێکی تر دەڵێن: گەلەکەی: (موسەیلیمەی کەززاب) بوون، هەندێکی تریش دەڵێن: ڕۆم و عەجەم بوون."

**کاروان تەقتەقی (٢٠١٦) لە (ل٨)ی (دەوڵەتی کوردستاندا) پێنج تەفسیری نا-کوردی دەهێنێتەوە هەموو دەڵێن: قەومی (أولو بأس شديد): کوردن:**

١- ئیمامی ئالوسی،(ل٢٠٢).
٢- ابن ابی حاتەم،(ل٢٣٠).
٣- ئیبن کثیر،(ل١٩٠).
٤- جلال الدين السيوطی،(ل٥١٩).
٥- شوکانی،(ل٦٩).

**بە ڕای ئێمە ئەم ئایەتە هەڵگری دوو پرسە:**

١- هەر خودی کورد بە (گورد) ناسراوە، قورئان خاکی ئەو میللەتە ئازایەی بە موبارەك ناو بردووە، هەروەها زۆربەی شاعیرە مەلایەکان لە زۆر دەقەکانیاندا، کوردیان بە ئازا و چاو نەترس ناو بردووە.

٢- لە پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامیدا بە دەرکەوت: زۆربەی کوردی جزیرە و ئەقلیم جیبال، بە ئاشتی موسڵمان بوون، ئەو کەمەی شەڕی ئیسلامیشی کرد،ئەو کوردانەبون ، کە لە ناو دەوڵەتی ساسانیدا پۆستیان هەبوو.

کەواتە: لە هەردوو لاوە بە قسەی زۆربەی ڕاڤەکاران و پرۆسەی فتوحاتەوە، ئایەتی (١٦)ی سوڕەتی (الفتح) باسی کورد دەکات ...

کوردستان لە سەردەمی هاتنی ئیسلام دا، بریتی بوو لە: دوو ناوچەی ژێر دەسەڵاتی: ساسانی و کوردستانی ژێر دەسەڵاتی بیزەنتی - ڕۆمانی .

# کورد و کوردستان و فتوحاتی ئیسلامی

ئەو قسەیەی سەرەتای لاپەڕە (١١٧)ی (شەرەفنامە) دەکەینە دەسپێکی قسەکردن لەسەر ( کورد و کوردستان ).

هەژار موکریانی (١٩٧١)لە (ل١١٧)ی (شەرەفنامە) دەنووسێت : هەر لەوساوە، کە عەرەبەکان خاکی فارس و ڕۆمانیان گرت، مێژووی کوردیش لەوە دەرچو، مێژوی کەونی بۆ بڕوانی و بۆ زمانەکەی زمانەکانی کەونار ! بپشکنی، هەر لە سایەی کتێبی مێژوی ئیسلامییەوە، مێژوی کوردیش شی کراوە و ڕون و ڕەوان باسی کراوە!

بەر لە موسڵمانبوون، وشەی ( کورد ) نەبووە، بەڵکو ئەوەی هەبووە، وشەی تر بووە و هەر نەتەوەیەکی کۆن، بە ناوێك باسی کردوون، وەك:

**سۆمەری :** گۆتی، جۆتی - جودی.

**ئاشووری :** گۆتی، کاردۆ، کارداك...

**ئێرانی :** کورتیوی، سیرتی، کوردراها.

**یۆنانی و ڕۆمانی :** کاردۆسۆی، کەردۆکی، کەردۆخی.

**ئەرمەنی :** کوردۆئین، کورخی...

**عەرەبەکان :** کاردۆی، باقرد، کرد، ئەکراد...( شەرەفنامە، ل١١٥ و ١٢٦ ).

کەواتە: تا موسڵمانبوونی کورد، هیچ نەتەوەیەکی دەوروبەر، وشەی (کورد)ی بۆ کوردەکان بە کارنەهێناوە.
کەواتە: یەکەم کەس کە ناوی کوردی هێنا؟ ئەویش: (بەلازری) بوو .

ناوی (کورد)یش وەك ناوی کوردستان بە زۆر ناو لای نەتەوەکان هاتووە، بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە: نامیلکەکەی (درایڤەر) . ناوی کورد بە ڕێنووسی " کورد /کوردان" لە کتێبەکەی ئەردەشێر لە (٢٢٦) هاتووە .

مامۆستا حەسەن مەحموود لە (ل٥٢) ئاماژە بەوە دەکات، کە (بەلازری) کتێبی (عهدی ئەردەشێری) لە فارسیەوە بە شیعر تەرجەمە کردووە. (ئەردەشێر بابك) دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی ساسانی لەم کۆنتێکستەوە ناوی کورد دەهێنێت : (سافراستیان) دەنووسێت، کە ئەردەشێر باسی دوژمنەکانی دەکا، دێتە سەر ناوێك بەناوی:- مادیك - ناوێك، کە پادشای کوردان بووە.
"(تۆ فیق وەهبی) لە نامیلکەی (بنەچەی کوردان)...دەڵێت : ئەو ئەردەشێرە، زیاتر (١٠٠٠) میدی کوشت و ئەسیر کرد، هەروەها (ئەردەوانی) پادشای فرسیەکانی کوشت ....
(سافراستیان) لە (ل٢١) دەڵێت :مێژوونووسانی بەناوبانگی عەرەبی، وەك: (طبری) و (مەسعودی) ئەم ناوەیان - ناوی کورد- لە ساسانییەکانەوە وەرگرتووە ."

جابانی کوردی لە (ل١٨)ی (کورد لە فەرهەنگی شیعەدا) لە د. کەمال فوئاد دەگێڕێتەوە، کە " کۆنترین بەڵگەنامەیەك ناوی ( کورد - کرد)ی ئا بەم شێوەیە تێدا هاتبێت، ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ئیسلام، کە دوو جار وشەی " أکراد " لە ئاڵوگۆڕی نامەی نێوان ( عەلی کوری ئەبوتاڵب ) و ( زیادی کوڕی ئەبوسفیان )دا هاتووە، کە ئەو کاتە والی (بەسرە) بووە."

دەزانی بۆ ناوی کورد لەگەڵ فتوحات هاتووە، چونکە (١٣٠٠) ساڵ ئەسیری دەستی: (ئەخمینی و سلوکی و ئەشکانی و ساسانی بووە)، هەر ئەوەش وایلێکردووە هەر لە شەڕە بەراییەکانی: (قادسیە و جەلەلا و خانەقین...) بچێتە پاڵ لەشکری موسڵمانەکان و، پشت لە ساسانیەکان بکات!

لە سەردەمی فتوحاتدا، کۆمەڵە ناوێکی وەك: (عیراقی عەجەمی - عیراقی کورد، ئەقلیم جیبال، جەزیرە ..) بۆ وڵاتی کورد بەکار دەهاتن، هەتا هەژار موکریانی لە پێشەکی (شەرەفنامە) و (کوردستان لە وەختی ساسانی).( زۆم) - هۆبە - بەکاردەهات، (زۆم)یش واتای کۆچەری دەدات، چونکە کورد لە دوای ڕوخانی (میدیا) دووچاری کۆچەری بووە، (ئیبن ئەسیری)ش ئەوە پشت ڕاستدەکاتەوە، کە کورد لە کۆندا بە " کۆچەری فارس" ناسرا بوون، دکتۆر جەمال ڕەشید)یش لە کتێبی: (دراسات ....)ئاماژەی بەو قسەیەی (ئیبن ئەسیر) دەکات!

**وشەی کوردستان:** وشەی کوردستان وەك وشە، نوێیە، پێشتر بە وڵاتی کوردان ناسراوە. پاشگری (-ستان ) لە پاڵ چەندەها ناوی وەك: (ئەفغان، ئۆزبەگ، تاجیك، پاك، هیند) دێت .

لەو هەموو ناوەش، ئەو پاشگرە واتادارە لە پاڵ ناوی قەومی، واتای وڵات دەدات، کەواتە کوردستان، واتای: وڵاتی کوردان دەدات :

## - کوردستان وەك شوێن:

پێشتر بە دەڤەرێك، بە تایبەتی لەناوەڕاستی سەدەی شەشەمی کۆچیەوە دەوترا: کوردستان، کە لە بنەڕەتەوە بۆ بچووککردنەوەی ڕووبەری کوردستان بوو.

هەژار موکریانی (١٩٧١) لە (ل١١٩) ی پێشەکی (شەرەفنامە) دەڵێت: "(مستۆفی) دەڵێ: لە دەوری نیوەی سەدەی شەشی کۆچی، سوڵتان (سەنجەر) ی سەلجوقی (٥١١-٥٥٥) ئەو ناوچیایەی لە (کرمانشان) جیاکردەوە و ناوی (کوردستان)ی لێناو، (سولەیمان شا)ی برازای خۆی لە سەر دانا، ئەو ڕۆژگارە، باج و پیتاکی کوردستان: (دوو) ملیۆن دیناری زێڕ بوو ."

ئەحمەد خلیل لە (ل١٤) دا، هەمان بۆچوونی مێژوونووسانی دەگێڕێتەوە، کە ئەو ناوە گوزارشت بووە لە یەکەیەکی کارگێڕی و سیاسی تەسك ، نەك ڕووبەری کوردستان .

لەوەش زیاتر، ئەو کوردستانەی سەلجوقی، تەنیا بەشێك بووە لە ئەقلیمی جیبال - عیراقی عەجەمی، ئەو بەشەی لای سەنجەری کوڕی مەلیك شای ئەرسەلانی،

کوردستان بوو کەوتبووە نێوان (ئازەربایجان) لە باکوورەوە و (لۆرستان) لە باشوورەوە، ئەو کوردستانەش ناوچەی وەك:( هەمەدان، دینەوەر و کەرمنشاه، سنە) لە خۆ دەگرێت..

هەمان زانیاری لای (سجادی) لە ڕاپەڕینەکانی کورد ، قاسملۆ، (ل ١١) ی (کوردستان وکورد)، خەسرەو گۆران،(ل١٨٩)ی (کوردستان لەمێژوودا) هەیە، بۆ نموونە: قاسملۆ لە (ل١١) دەنووسێت: "وشەی کوردستان، بۆ یەکەمجار لە سەدەی (چاردە) لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی سەلجووقیەکاندا بەکارهێنراوە، بڕوانە کتێبی: (نزهة القلوب) ی (حمدالله مستەوفی)، کە لە نێوان ساڵەکانی: (١٣٣٥-١٣٤٠) نووسیویەتی و لەوێدا دا دەڵێ: (کوردستان لە (١٦) ویلایەت پێك هاتووە، ئاو و هەوای سازگارە و لەگەڵ عیراقی عەرەب و خوزستان و عیراقی عەجەم و ئازەربایجان و دیار بەکر هاوسنوورە).

## - کوردستان وەك ناو:

کوردستان وەك ناو بۆ وڵاتی کوردان، جیۆگرافیای کوردستانی گەورە، د.زرار (٢٠١٠) لە (ل٤٣)ی کتێبی: (کورد و کوردستان ...)دا دەڵێت : مێژوونووسی ئەرمەنی (مادتیوس ئۆرهایتسی) لە سەدەی (١١-١٢) لە پرسی ڕوداوەکانی (روها) ناوی کوردستانی لە چەندەها تێکست هێناوە لەوانە: (کوردستان لە دۆزێکی ئاڵۆزدایە) (کوردستان لە ڕەوشێکی ئاڵۆزدایە دروستترە ). د.فەرهاد پیریال لە (ل٤٥-٤٧)ی کتێبی: (زێڕی ناو زبڵ) باس لە گەشتەکەی (مارکۆ پۆلۆ)(١٢٥٤-١٣٢٤) بۆ کوردستان دەکات و دەڵێت : مارکۆ پۆلۆ لە (١٢٧٠) گەشتەکەی بەرەو کوردستان کردووە و لە (١٢٩٠) کتێبەکەی لە سەر گەشتەکە نووسیوەتەوە، لەوێ لە زۆر دەق دا، ناوی کوردستانی هێناوە، وەك لە ناوهێنانی میرنشینەکان، بە تایبەتی میرنشینی: (شەدادیەکان و حەسنەوییەکان و بەنو ئەناز ..) لە (ل٤٧) ی هەمان کتێبدا دەنووسێت: ئەو کوردستانە سەلجووقیەی لە سەر نەخشەی سیاسیی گەشتەکەی (مارکۆ پۆلۆ)دا دەبینرێت، کوردستانی گەورە نیە، بەڵکو بریتییە لەو (ئوستانەی)، کە سوڵتان سەنجاری سەلجوقی لە ساڵی (١١٥٠) دا لە باشووری ڕۆژئاوای کوردستاندا دروستی کرد ."

- ئەو هەوڵەی (مارکۆ پۆلۆ) لە کتێبی دکتۆر جەمال ڕەشید لە (١٩٨٤)

باسکراوه، هەروەها لە سەرچاوەی (سریان)یش ناوی کوردستان بەر لەو مێژووەش هاتووە،بڕوانە کتێبەکەی: (زنار عەبدلسەلام) و وتارەکەی (موحەممەد صاڵح زێباری) لە ژمارە (١٢) ی گۆڤاری دهۆك (ل٧٥-٧٧).

## کوردستان وەك ئوستانێك لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان :

لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ئوستانێك هەیە بە ناوی: (کوردستان)، ئەویش وەك کوردستانی سەلجوقی تەنیا پارێزگایە، نەك کوردستانی گەورە، یان بەشێکی کوردستان، کەواتە وشەی کوردستان لە سەردەمی: (ئەخمینی - ساسانی) نەبووە، لە پاش هاتنی سەلجوقییەکان بۆ کوردستان دروست بووە .

چەمکی فتوحات، جگە لەوەی ئیسلامی دەرەوەی جزیرەی عەرەبیە، هەروەها گەیاندنی ئیسلامە بە نەتەوەی تر وەك: (کورد، فارس، ئازەری...)، پیادەکردنی ئایەتی (وما ارسلناك الا كافه للناس )، نەك فراوانخوازی جیوگرافی و سیاسی.

بەر لەوەی باسی فتوحات بکەین، بە تایبەتی لە کوردستان، با باسی موژدەکانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەربارەی فتوحات بکەین، هەروەها فاکتەری وروژێنەری پرسی فتوحات، کە ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسەکانن، سەرباسێکی دی ئەم بەشەن . ڕەوشی ئایینی هەردوو ئیمپراتۆریەت، دوا سەرباسی ئەم بەشە پێکدەهێنن.

# مۆژدەکانی
# پێغەمبەر دەربارەی فتوحات

ئەوەی تەواو لە پرانسیپ و گوتاری ئیلاهی گەیشت بێ، دەزانێ ئیسلام تەنها بۆ جەزیرەی عەرەب و نەتەوەی عەرەب نییە، بەڵکو بۆ تەواوی بەشەریەتە. وتە و بەڵێنەکانی پێغەمبەر لە ناخۆشترین ڕەوشدا، هەڵگری ئەو مۆژدەیە، کە بزاڤی ئیسلام لە نێو عەرەب قەتیس نابێت .

زۆربەی ئەو مۆژدانەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە زۆربەی کتێبەکانی (سیره )باسی لێوە کراوە،دکتۆر عەلی صەلابی (٢٠٠٥) لە (ل١٦٩-١٧١)ی (التأريخ الاسلامی) ئاماژە بە مۆژدەکانی فەتحی ئیسلامی دەکات، لەوانە:

**١- مۆژدەی پێغەمبەر بۆ سوراقە:**

پێغەمبەر لە کۆچکردن لە مەککەوە بۆ مەدینە، بەڵێنی بە (سوراقە)، دابوو کە عیراق و وڵاتی دی دەرەوەی جەزیرە فەتح دەکرێن ، هەروەها بەڵێنی بازنەی کیسرا بە (سوراقە) دابوو .(سوراقە)ی بیابان و چۆڵەوانی مەککە، ئەو مۆژدەیەی پێ سەیر بوو، بەڵام هەر کە عومەری کوڕی خەتتاب دەستی بەسەر زۆربەی گەنجینەی (یەزگرد) داگرت، ئەو بازنەیەی، کە پێغەمبەر بەڵێنی دابوو، خەلیفە عومەر بە (سوراقە)ی دا . ئەو پرسە لە (ل٥١) ی (ب.٧-٨) (البداية و النهاية) دایە .

**٢- پێغەمبەر بەڵێنی بە (عودەی کوڕی حاتەم تائی) دابوو، کە گەنجینەکانی کیسرای کوڕی هرمز فەتح دەکەن، ئەوەش لە سەردەمی عومەر ڕوویدا.**

**٣- فەتحکردنی وڵاتی شام :**

کاتێ شاندی (تەمیم الداری) هاتنە مەدینە فەرمووی : " گەر (کیسرا) لە نێوچوو،(کیسرا)ی تر لە دوای ئەو نایەت، گەر (قەیصەر) لەنێوچوو، (قەیصەر) ی تر لە دوای ئەو نایەت، سوێندبێ بەوەی گیانی منی بەدەستە، گەنجینەی ئەوانە لە ڕێگای خوا خەرج دەکەن ."

..... هتد، قورئان لە ئایەتی (٣-٤) سورەتی (النجم)دا، تەواو بەڵێنەکانی پێغەمبەر پشتڕاستدەکاتەوە، کە ئەو لە خۆیەوە نادوێت، بەڵکو بە ئاراستەی وەحی قسە دەکات : ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾

چۆن لە حەتمیەتی مێژوو هاتووە، ئەو بەڵێنانەی لە قورئان هاتوون، دەبێ ڕوویدەن، هەرواش کەوتەوە، ئەوەبوو عیراق و عیراقی عەجەمی و ئەقلیمی جیبال و تەواوی وڵاتی فارس، لەگەڵ وڵاتی قەیصەر و شام فەتح کرا.

بۆیە بەر لە مەرگ، سوپای (ئوسامە)ی بۆ دەرەوەی جەزیرەی عەرەبی تەیار و بەڕێکرد و، (ئەبەکر و عومەر و عوسمان) درێژەیان بە پرۆسەکە دا.

# گومانەکانی
# ڕۆژهەڵاتناسی دەربارەی فتوحات

ڕۆژهەڵاتناسی، دیوێکی مەعریفی ڕۆژئاوایە دەربارەی ڕۆژهەڵات، د.فەرهاد پیربال (٢٠٠٦) لە (ل١٣) (کورد لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە) دەنووسێت: "لە ڕۆناکبیرە عەرەبەکانیش، (ئەدوارد سەعید)، ڕایان وایە، کە زانستی ڕۆژهەڵاتناسی شێوازێکی ڕۆژئاواییانەی دەسەڵات پەیداکردنی ڕۆژئاوایە بە سەر ڕۆژهەڵات."

بە حوکمی ئەوەی کوردناسی، یان کوردۆلۆجی، بەشێکە لە ڕۆژهەڵاتناسی، ئەو دووەش بوونەتە ناوەند، یان بزاڤ بۆ قسەکردن لە سەر کورد، ئەوە دێنێ قسەیەك ،دوان لە سەر ڕۆژهەڵاتناسی بکەین.

ڕۆژهەڵاتناسی، واتە ئەو دیسیپلینانەی، کە ئامانجیان لێکۆڵینەوەی شارستانیەتەکانی ڕۆژهەڵاتە - پیربال، (ل١١) . هەر پیربال لە (ل١٤-١٥) ی هەمان کتێبی سەرەوە، دەربارەی شوناسی ڕۆژهەڵاتناسەکان دەنووسێت : "لە ڕیزی (٤٤٩) گەڕیدە، کە لە هەموو دنیاوە لە ماوەی سەدەی (١٤ م)، تاکو سەدەی (١٦ م) سەریان لە تورکیای عوسمانلی داوە، (١٠٦) فەرمانبەری بەرزی حکوومەت و جاسووس بوونە، (٧٥) قەشە و پیاوی دینی بوونە، (٣٨) بازرگان و نوێنەر، (٣٦) بۆرژوا، (٢٦) نووسەر و پیاوی ئەدەب،(٢٣) سەرباز و دەریاوان و جەربەزە."

وەك دەبینین لەو هەموو ڕۆژهەڵاتناسە، (١٠٠) کەس نادۆزیەوە، کە شتە سەرنج ڕاکێشەکانی ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژهەڵات پەلکێشی کردبن، بەڵکو تەبشیرو کۆلۆنیالیزم و سیاسەت، پەلکێشی کردوون بۆ ئەوێ.

کوردناسی، کە ڕووی مەعریفی ڕۆژئاوایە دەربارەی ڕۆژهەڵات، هەمزە شوکر (٢٠١٣) لە (ل٢٥) گ.کوردناسی، بێ سڵەمینەوە دەڵێت: (کوردناسی مەکرێکی ڕۆژئاوایە) .

دکتۆر (زیگرید هونکی) لە (ل ٤٧-٤٩)ی کتێبی (الله لیس کما تروجون) باس لەوە دەکات، کە فتوحاتی ئیسلامی بۆ توانەوە و سڕینەوەی (یەهودیەت) و (مەسیحیەت )نییە ."

هەردوو چەمکی: کوردۆلۆجیا و ڕۆژهەڵاتیەوان، لە لای دوو نووسەری کورد: د.عبدالله جەودەت و حوزنی موکریانی، کە تاوانبارن بە چەپ و دۆستی ئینگلیز، هاتە ناو نووسینی کوردەوە .
پیربال لە (ل٩ )دەڵێت : زاراوەی کوردۆلۆجیا بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٩١٣) لە لایەن عبدالله جەودەت بەکارهات، هەرچی زاراوەی ڕۆژهەڵاتیەوان بوو، لە ساڵی (١٩٤٤) لای حوسێن حوزنی موکریانی بەکارهات ."

بەشێك لە مێژووی کورد لای کوردناسەکان نووسرایەوە، چونکە گەلانی دراوسێی کورد، دوای دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوە، کورد و پرسی کوردیان تەواو بن پێ خست، بۆیە ڕۆشنفکرانی کورد ڕوویانکردە کوردناسەکانەوە. کورد چۆن کێشەی لەگەڵ دراوسێکان هەیە، بە هەمان شێوە کێشەی لەگەڵ کوردناسەکان هەیە . کەسانی وەك: (ئەسکەندەری مەکدۆنی و زەینەفۆن و مێجەرسۆن و مس بێل و نیکیتین و مینۆرسکی و ئەدمۆنز...پۆڵاندیان و لازەرێف و سافراستیان) لە خانەی ئەو کەسانە دادەنرێن، کە جاسووس، یان پیاوی حکوومەت بوونە....

(د.علی الصلابی ) لە (ل١٧١-١٧٨)ی (تأریخ الاسلامی ) ئاماژە بە چوار گومانی ڕۆژهەڵاتناسەکان دەکات، ئەو چوار گومانە چۆن دەربارەی ئیسلام دەوروژێنن، هەمان گومان دەربارەی مێژووی کورد و ئاشنابوونی کورد بە ئیسلام دەوروژێنن!

**یەکەم: نەبوونی ستراتیژیەت لە پرۆسەی فتوحات دا:**

فتوحات سەبارەت بە کوردەوە، دەرچوون بوو لە تونێلێکی تاریك، چونکە کورد (١٣٠٠) ساڵ بوو، ئەسیری (ئەخمینی) تا (ساسانی) بوو، بۆیە موسڵمانبوون، واتای: ڕزگاربوون بوو.

بۆیە ڕۆژهەڵاتناسەکان گومان لە سەر ئەو پرۆسەیە دروست دەکەن، ئەوەتە: (ئانتونی نتنج)ی ڕۆژهەڵاتناس لە بارەی (فتوحات) دەنووسێت :

"فتوحات تەواو لەوە دوورن لەپێناو ئامانجێکی هێمن بەرپابوو بن، لە ڕاستیدا ئەوان وەك هەڵمەتی جەنگ ئامێز دەستیان پێکرد، بۆ دۆزینەوەی دەرچەیەکی نوێ بۆ گیانی شەڕئامێزی نێو هۆزەکان ...(لە شەڕی براکوژی دوورکەنەوە) (ل١٧٢-١٧٣)".

خەلیفەکانی ڕاشیدین مەبەستیان بوو، بە دەیان گەلانی غەیرە - عەرەبی وەك: (کورد و فارس و تورك) لە ستەمی دینەکان و پاشایەکان ڕزگاریان بێت و تەنیا خودا بپەرستن، نەك هیچ مرۆڤ و نەتەوەیەك .
لەوەش زیاتر بەڵێنەکانی پێغەمبەر بهێننەدی، وەك بەڵێنی: " لیفتحن کنوز کسری بن هرمز" دابوو.

هەرچی ئامانجی ڕۆژهەڵاتناسی و کوردناسی بوو: بڵاوکردنەوەی مەسیحیەت بوو لەناو گەلانی ڕۆژهەڵات، بە تایبەتی کورد. هەرئەوانیش بوون لە سەردەمی (میر بەدرخان) و (عبید الله شەمزینی)، گەورەترین پشێویان بۆ کورد نایەوە!

ئەمە شتێکی شاراوە نییە، د.فەرهاد پیربال لە (ل٢١) (کورد لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە) لە مەسیحیەکانی ئەوروپا دەگوازێتەوە: "مۆژدەگارە مەسیحییەکانی ئەوروپا، لە نێوان سەدەی (١٢) و (١٣) مدا، کە دەیانویست دینی مەسیحی بە ناو خەڵکی ڕۆژهەڵاتدا بڵاوبکەنەوە - ڕۆڵێکی گەورەیان لە دروستکردنی ئەو پەیوەندییەی نێوان وڵاتانی ڕۆژئاوا و کوردستاندا بینی .

ئەم موژدەگارانە بوونە هاندەرێکی کاریگەر، بۆ ئەوەی ئەوروپییەکان زیاتر ڕوویکەنە کوردستان، چونکە کوردستان بۆ ئەوان، مەڵبەندێکی گرنگی مەسیحیەت بوو ."

لێرەدا دەپرسین: ئایا ئیسلام، یان مەسیحیەت لە کوردستان پشێوی نایەوە؟؟

## دووەم: فتوحاتی ئیسلامی شەڕی دینی بوو؟!

دکتۆر (صەلابی) لە (ل١٧٤) لە دکتۆر (جەمیل میصری) دەگوازێتەوە: زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسەکان گومانی ئەوە بڵاودەکەنەوە، کە فتوحات خۆی لە خۆیدا، جەنگی ئیسلام بوو لەگەڵ غەیرە ئیسلام، وەك دەڵێن: "موسڵمانەکان خاوەن عەقیدەن، بە دەمارگیری کوێرانە، خەریکی بڵاوکردنەوەی ئەو عەقیدەیە بوون، خەڵکی غەیرە موسڵمانیان بە زۆری و زەندەق بردن ملکەچی باوەڕی خۆیان کرد، لەو پێناوەدا ڕوبارێك خوێن و توندوتیژیان بەرپاکرد، قورئان لە دەستێکیان بوو، دەستەکەی تر شیری هەڵگرت بوو ."

ئێستا ساڵی (١٤٣٨)ی کۆچیە، کوردیش وەك نەتەوە (١٤٢١) ساڵە ئیسلامی وەرگرتووە، هەبوونی ئەو کوردانەی لە سەر دینی خۆیان مانەوە، وەك: کوردی جوو، کوردی دیان، یا کوردی یارسان - کاکەیی، کوردی ئێزیدی، کوردی شەبەك، باشترین وەڵامە بۆ ئەو گومانەی سەرەوە، کوردی موسڵمان شەڕی ئەو هەموو دینەی نەکردووە، هەتا ئەوان شەڕیان پێ نەفرۆشت بێ.

کەچی هەڵمەتی بە مەسیحیکردنی (ئیسپانیا) و (هیندیە سورەکان) بەرد

بەوەڵام دەهێنێ، قەشە (کاراس) لە کتێبی: (مەسیحیەت و شمشێر) باس لەوە دەکات، کە مەسیحییەکانی ئیسپانیا، نزیکەی (یەك) ملیار هیندی سۆریان کوشت! لەولاوەش شیوعیەت لە پێناو بڵاوکردنەوەی شیوعیەت (١٩١٧-١٩٩٠) تەنیا لە سۆڤیەت و چین چەندان ملیۆن مرۆڤیان کوشت،!!

لە هەموو بەشەکانی کوردستان دا، چەندان کورد لە ماوەی (١٩٦٤)، هەتا هەنووکە بەدەست کورد، لە پێناو مارکسیەت دا، شوێن بزر و کوژراون !!

## سێیەم: گومانی ئەوەی فتوحات شەڕی قەومی بوو:

هەمزە(٢٠١٣) لە وتاری: گۆڤاری (کوردناسی)، ڕاستەکات کوردناسی مەکرێکی ڕۆژئاوایە، بۆیە ئەم گومانە زیاتر لای گەلانی غەیرە عەرەب ئیشی لە سەر دەکرێت . هەبوونی عەرەب لە: (عیراق و کوردستان و میصر و تونس ...)بۆ عەرەبیکردنی ئەم وڵاتانەیە، ئەگەرنا ئەو وڵاتانە زێدی: (ئارامی و کورد و قیپتی و ئەمازیغیە) .

ئەم بیرۆکە و ڕقە، لەگەڵ دەوڵەتی نەتەوە دروست بوو، نەك فتوحات ! بیرۆکەی دەوڵەتی نەتەوەش، بەرهەمی: (سایکس - بیکۆ) ...بوو .

## چوارەم: فتوحات لە پێناو فاکتەری ئابووری بوو:

دەوڵەمەندی کوردستان لە چاو نیمچە دوورگەی عەرەبی و، دیتنی هزری ڕۆشنفکری کورد بۆ مێژوو،کە دیتنێکی (مەتریالی)ە و لە سەر فاکتەری ئابووری دامەزراوە، هۆکاری ئەم گومانەن لە کوردستاندا!

بزاڤی ئیسلامی بە ڕابەرایەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ماوەی (٢٣) ساڵ پێغەمبەرایەتی دا، لە خراپترین ڕەوشی ئابووری دابوو، بەڵام پێغەمبەر توانی لە ماوەی (٢١) ساڵی پێغەمبەرەیاتی، لە ( یەك کەسەوە - زاتی پێغەمبەر ) بووە ( ١٠ هەزار سەحابی - فەتحی مەککە )، جا ئایا فاکتەری ئابووری، یا فاکتەری ئیمانی، توانی ئەو بەرفراوانییە ئاسۆیی و شاقوولیە دروست بکات؟

ڕۆناکبیر و قەڵەم بەدەستی کورد، هەوڵیدا ئەو چوار گومانەی ڕۆژهەڵاتناسی، لە پرسی ئیسلامبوونی کورد بەرجەستە بکات! ئەرێ ئەوانە قەت لە خۆیان نەپرسیوە: گەر کورد بە ئیسلام ئاشنا نەبوایە، ئەوا وەك: ( ئیستراگۆن ) و

(فلادمیر )، هەر لە چاوەڕوانی (گۆدۆ) دا بوونایە !

کورد (١٣٠٠) ساڵ، خاك و شوناس و دینی داگیرکرابوو، توانی وەك (میدیەکان)، ئیمپراتۆرێکی وەك ئاشووری بڕوخێنێت؟! کەواتە: نەقدی ئێوە بۆ فتوحات، واتای: مانەوەی کوردی دەگەیاند لە نێو قەیرانەکانی بزربوون و توانەوە، ئەوەتە (دیاکۆنۆف) لە (میدیا) و (بۆرەکەیی) لە بەرگی یەکەمی: (مێژووی وێژەی کوردی) باس لەوە دەکەن، کە ئەخمینییەکان، هەم دین و ئەلفبێی کوردیان دزی !

ئەمڕۆ، کە ئەوەندە باسی (زەردەشتیەت) دەکرێ، با بزانین سیستەمی ستەمکاری (زەردەشتیەت) چۆن بووە؟

# ستەمی زەردەشتی و مەسیحیەت لە کورد

ئیمپراتۆریەتی (ساسانی)، پاش دەمکوتکردنی (میدی) و (ئەشکانی) و کوشتنی پاشای هەردوو نەتەوە، (ئەردەشێر بابەك) لە ساڵی (٢٢٦)ی میلادی، زەردەشتیەتی لە ئیمپراتۆریەت، کردە ئایینی ڕەسمی . ئەمە لە ئەردەشێر چاوەڕێ کراوبوو، چونکە خۆی و باوکی، دوژمنی باوەکوشتەی (سلۆکی) و (ئەشکانی) و (کورد) بوون، ئەمەشی لە کتێبەکەی باسکردووە .

(وەهبی) (١٩٦١)، (ل١٥-١٦) ی (بنەچەکەی کوردان و بنچینەی زمانی کوردی)، ئاماژە بە شەڕی نێوان: (ئەردەشێر و پارسی) هەروەها (ئەردەشێر و میدی) دەکات: "پاش کوشتنی ئەردەوانی پێنجەم-پاشای پارسەکان، هێرشی کردە سەرمیدیەکان و هەزارکەسی لێ کوشتن ئەوەی ماشبۆوە بەدیلی گرتن، یا برینداریکردن..."پاش ئەو سەرکەوتنە بەسەر (پارس) و (میدی)، ئەردەشێر فەرمانڕوایی فارسی بەناوی ئیمپراتۆریەتی (ساسانی) دروستکرد.

ئەو دەسەڵاتە تاکانەی فارس لە (٢٢٤) هەتا (٦٢٨) درێژەی هەبوو، لەو ساڵەوە بنەماڵەی دەسەڵات وملیێهات، ڕەگەزی نێر لە بنەماڵە نەمێنێ و هەردوو خوشك: (بۆران پاشا و ئازەرمیدۆخت) کچانی (خەسرەو پەروێز) لە ماوەی (٦٢٨-٦٣١) حوکمی دەوڵەتی ساسانی بکەن .

ئەو دەسەڵاتە تاك نەتەوە و بنەماڵە و ئایینە، هەر لە هەناوی خۆیەوە،

چەندان ئایین و مەزهەب و نەتەوەی دژ بە خۆی هەڵگرت بوو .
نەتەوەی (پارسی - ئەشکانی) و کورد، لە دەرفەتێك دەگەڕان، کە لە دەسەڵاتی فارسی ڕزگاریان ببێت .

لە پێش دەرکەوتنی ئیسلام، چەندەها مەزهەب و ئایین لە دەوڵەتی ساسانی دەرکەوتن، کە و بە (زەردەشتیەت) ڕازی نەبوون . ئەوسا کوردستان لە ڕووی خاك و ئایینەوە، بۆ دوو زۆنی دین جودا دابەشکرابوو: ئەقلیمی جیبال، یا کوردستانی بندەستی ساسانی .
لەو بەشەی کوردستان دا، (زەردەشتیەت) ئایینی ڕەسمی ئیمپراتۆریەتی ساسانی بوو، (مەسیحیەت) و (مانیەت) و (مەزدەکیەت)، ئایینی ئۆپۆزسیۆن بوون . دەسەڵاتی ساسانی بەرگەی حزووری ئەو سێ ئایینەی نەدەکرد، بۆیە بەئاگر و ئاسن مامەڵەی لەگەڵ دەکردن .

لە دەوڵەتی ساسانی و کوردستانی بندەستی ساسانیەکان، ناسراو بە: (ئەقلیم جیبال)، سێ بزاڤی ئومەمی: ( کورد و فارس و ئەشکانی )لە دوو ماوەی جیاواز پەیدابوون، کە زەردەشتیەت و پیاوانی دەوڵەت، زۆر بە دڕندانە وەڵامیان دانەوە:

## ١- هەڵوێستی زەردەشتیەت بەرانبەر مەسیحیەکان:

کتێبەکانی مەسیحیەت، لەوانە: خودی (ئینجیل) هەروەها کتێبی وەك: (کورد دناڤ ئینجیل و تەورات و ئادی شیر، ئەلبێر ئەبونا...)باس هەر لە بەرایی بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت لە شارەکانی هەردوو بەشی کوردستان دەکەن. ئەو تێکەڵبوونەی کورد بە مەسیحیەت، جیۆگرافیای کوردستان بەش بەش کردووە.

ئەو مەسیحیانەی (ئەقلیم جیبال) لە زۆر شاری کوردی، خاوەنی دەسەڵاتی خۆیان بوون، لەوانە: (میرنشینی حەدیاب) لە هەولێر. ئەو میرنشینە مەسیحیە، هەر لە پێش دەوڵەتی ساسانی هەبوو.

(ئادی شیر) لە (ل١٦٥)ی (کرۆنۆلۆجیای هەولێر) باس لە کەسایەتی مەسیحی وەك: (یوحنان و ئەبرەهام و قەرەداغ) لە کەسە دیارەکانی هەولێر بوون، کە بە دەستی ساسانی کوژران، هەر (ئادی شیر) ئاماژە بە چەوساندنەوەی (چل) ساڵی سەردەمی (شاپووری دووەم) دژ بە مەسیحیەکان دەکات.

لە نێو کوردەکانی (ئەقلیم جیبال)دا، گروپێکی مەسیحی دروست بوو بە ناوی: (نەستوری).

## ٢- هەڵوێستی (زەردەشتیەت) بەرانبەر (مانیەت):

پاش ئەوەی لە دەوڵەتی ساسانی، زەردەشتیەت بووە ئایینی ڕەسمی دەوڵەت، هەندێ مەزهەبی پێچەوانە و جیا لەو دینە سەری هەڵدا، لەوانە: (زەروانی، کومرسی و صابئی) (کەلسومە، ل٥٢)، بەڵام ئەو مەزهەبانە مەزهەبی نوخبەوی بوون، بۆیە هێندە کاریگەریان نەبوو لە سەر سیاسەتی دەوڵەت.

بزاڤی (مانیەت) بەرهەمی بیرکردنەوەی (مانی کوڕی فاتك)ە، کە لە سەدەی سێیەم لە ناو دەوڵەتی ساسانی پەیدا بوو، جەماوەربوونی ئەو بزاڤە وەیکرد (مانی) لە سەر نەتەوەیەك کار نەکات . هەرچەندە خۆی (ئەشکانی) بوو، بۆیە لە شاری کوردی وەك: (هەولێر و ڕەها و نوصەبین و حەران و موصل) بڵاوبۆوە. (کریستنسین،ل ١٥٨) ، (الحمد،ل٢٣).

بە حوکمی ئەوەی (مانی) پێشتر مەسیحی بوو، بۆیە مەسیحیەت لە نێو (مانیەت)دا حزووری هەبوو، ئەو حزوورەش وەیکرد (مانیەت) سنووری دەوڵەتی ساسانی ببڕێت و، بگاتە دەوڵەتی ڕۆمانی و کوردستانی بندەستی ڕۆمانی .

ئەو بڵاوبوونەوەی (مانیەت)ە، بە یارمەتی شاپووری یەکەم (٢٤١-٢٧٢) بوو، بەڵام پیاوانی ئایینی: (زەردەشتی و مەسیحی) لە دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمانی، دژی وەستان. (کریستنسن، ل١٨٩-١٩٠) .

پیاوانی دەوڵەت و زەردەشتیەت، لە سەر مێزی دانوستانددا، (مانی) و پیاوانی (مانی)ان کوشت!

## ٣- هەڵوێستی (زەردەشتیەت) بەرانبەر (مەزدەکیەت):

دەوڵەتی ساسانی، هەم دەوڵەتی بنەماڵەیی بوو، هەم دەوڵەتێکی تەبەقی - چینایەتی، چۆن (بەلشەفیەت) دەوڵەتی ڕووسیای قەیسەری هەژاند، (کریستنسن، ل٢٢٠) وتەنی، مەزدەکیەتیش لە کۆتایی سەدەی (پێنجەم)، مەزدەکیەت وەك بزاڤێکی شۆڕشگێر، کۆمەڵگای ساسانی ورووژاند و هەژاند . کۆمۆنیستەکان بزاڤی مەزدەکی، بە بزاڤێکی ئیشتراکی بەرایی دادەنێن، چونکە خەڵك چۆن لە ڕەگەزەکانی سروشت هاوبەشن، دەبێت لە شتەکانی تریش هاوبەش بن. (ئیبن ئەسیر، ل٢٥٨).

چۆن (مانیەت) بە یارمەتی (شاپوور پاشا) بڵاوبۆوە، (مەزدەکیەت)یش بە یارمەتی (قوباد پاشا) بڵاوبۆوە. (طبری، ل٥١).

شەهرستانی لە (ل٨٧) دا دەڵێت : (مەزدەکیەت) تەواو لە نێو کوردی:(دێلم وهەمەدان و دینەوەر..) بڵاوبۆوە. لە ساڵی (٥٢٩) لە سەردەمی (ئەنوشیروان) بە یارمەتی پیاوانی زەردەشتی و ئەو قەشانەی پیاوی دەوڵەت بوون، تیرۆر کرا.

وڵاتی ساسانی، ببووە وڵاتی تیرۆر، بە تایبەتی لە نێو پیاوانی دەوڵەت دا، بە جۆرێك لە (٦٢٨-٦٣١) پیاو لە بنەماڵەی ساسانی نەما، پیاوانی ئایینی زەردەشتی ناچاربوون پرانسیپەکانی دەقی (ئاڤێستا) بگۆڕن، دەرفەت بۆ مێیەکی بنەماڵە بکەنەوە، کە ببێتە پاشا.

ئەو هەموو پەشێوی و پاشاگەردانییە لە نێو بنەماڵەی دەسەڵات دا، دەرفەتی لە باری خوڵقاند بۆ مەسیحیەتی ناو هەناوی حوکمڕانیەتی زەردەشتی، هەروەها کوردەکانیش خەریکی بوون، پاش (١٣٠٠) ساڵ لە داگیرکراویدا، دەربکەونەوە.

# ستەمی مەسیحیەتی ( ڕۆمی ) و ( ئەرمەنی ) لە کـــــورد

وەك دەزانین، هەر لە پاش ئەوەی ئیمپراتۆر (قوستنتین) هاتە نێو مەسیحیەت، ئایینی مەسیحی زۆر گۆڕانی بنەڕەتی تێدا کراو و، لەوە دەرچوو چیتر هەڵگری لەقەبی دروستی (ئەهلی کتاب) بێت .

دەسەڵات و کەنیسەی ڕۆمانی، هەر لە سەدەی (چوار) و (پێنج)ەوە لە ڕوخان نزیکبۆوە . یەك زمانی لە نێو ئەو دەسەڵاتە کەنیسە پەرگیرەدا، ئومەتێکی ئەورووپی دروستکردبوو.

(دان ناردۆ ) لە (ل٣٤ -٣٣) ی (لاوازبوون و هەرەسهێنانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆم) دەڵێت: لە ساڵی (٥٦٨)ی زایینییدا، (لۆمبارد)ەکان بەودیودا شۆڕبۆوە و زۆرترین شوێنی ئیتالیای باکوور و ناوەڕاستیان گرت و، لە سەدەی دواتریشدا، سوپای موسڵمانەکان گەیشتە باکووری ئەفریقا و، دەسەڵاتی قوستەنتینیە لە سەر ئەو ناوچانە کۆتایی پێهات. لەو سەردەمە بەدواوە، ڕۆمای ڕۆژهەڵات وەك ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی، کەم و زۆر پێوەندی لەگەڵ ڕۆژئاوادا پچڕا."

لە ماوەی (٥٦٥-٦١٠) بە مردنی ئیمپراتۆر (جەستیان) لە (٥٦٥) دا، ئیمپراتۆری ڕۆمی درزی تێکەوت، دوای ئەو، (٤) ئیمپراتۆر هاتن، کە کۆتاییەکەیان ئیمپراتۆر (فوقاس) (٦٠٢-٦١٠) بوو، ئەو چوار ئیمپراتۆرە، دەوڵەتی ڕۆمیان دوچاری بارێکی ئابووری گران کرد، هەروەها گەندەڵیەکی زۆر لە دەوڵەت تەشەنەی کرد.

لەپاشان بنەماڵەی (هەرقەڵ) سەدەیەك زیاتر (٦١٠-٧١٧) حوکمی دەوڵەتی (ڕۆم)یان کرد، دەوترێت: ئەو بنەماڵەیە لە بنەڕەتدا (ئەرمەنی) بوون، هەربۆیە هاریکاری ئەرمەنەکانی (ئەرمینیا)ن کرد، کە زۆر شاری باکووری کوردستانیان داگیرکەن !

لەولاوەش، ئەو دوو زلهێزەی ئەوسا هەمیشە لەمل یەکبوون، قورئانی پیرۆز لە بەرایی سورەتی (ڕۆم)، ئاماژە بە سەرکەوتنی فارس بە سەر ڕۆم دەکا، ئینجا ئاماژە بەوە دەکا، کە ئەمجارە لە ماوەی ( هەندێك ساڵ : ٣-٩ ساڵ) ڕۆم بەسەر فارس زاڵ دەبن .

ئەحمەدی کاکە مەحموود لە (ل٦٥٧) ی تەفسیری (ڕامان) دەنووسێت: "ئەو سەرکەوتنەی فارس لە ساڵی (٦١٣-٦١٤)ی میلادی بووە، بەڵام سەرکەوتنی ڕۆم (٧) ساڵ دوای ئەو مێژووە بووە."

(جیمز کۆریك) لە (ل١٠١)ی (ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی) ئاماژە بە شەڕێك دەکات " کە بێزەنتییەکان لە ساڵی (٦٢٧)دا بە سەر ئێرانیەکاندا سەرکەوتن، بە سەرکردایەتی (هێراکلیوس) بە کردەوە سوپای دوژمنانی لێك بڵاوکرد، تەواوی ئەو هەرێمانەی لە دەستی ئێرانیەکان سەندەوە."

دەسەڵاتی ساسانی و ڕۆمی، دەرکیان بەدروستبوونی هێزێك لە نیمچە دوورگەی عەرەب کردبوو، بۆیە پەیمانێکیان لە نێوان خۆیان لە سەر (٧) خاڵ نووسیبوو . لە خاڵی (١) و (٥) ئاماژە بە وە دەکات، کە نابێ ساسانی و ڕۆم، یارمەتی عەرەب بدەن دژ بە یەکتر، هەروەها لە بەندی پێنجەم هاتووە : هەردوو کۆکن لە سەر ئەوەی، کە بازرگانە عەرەبەکان....بەبێ ئیزنی فەرمی، نابێ بچنە نێو هەرێمی دەرەکییەوە .( جیمز، ل١٠٠).

کێشەی ڕاپەڕینی (قوستەنتینە) و شەڕی (ئاڤارییەکان) و شەڕی (ساسانییەکان)، تووشی هێزێکی تر بوو بەناوی (جیهادیەکان)، لە ماوەی سێ ساڵدا ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی، یەکەمین زەبرێکی پشت شکێنی لە لای جیهادیەکانەوە پێکەوت، لە ساڵی (٦٣٥) (سوریە - شام) و ساڵی (٦٣٧) فەڵەستینی بە قودسەوە لە دەست چوو. هەمان ژێدەری پێشوو .

لە کوردستانی بندەستی ڕۆمانی، خەڵکی کورد لە سەر ئایینی دەوڵەتی ڕۆمانی بوو، مەسیحیەت ئایینی ڕەسمی دەوڵەتی ڕۆمانی بوو.

پاش زاڵبوونی لەشکری ئیسلام بە سەر دەوڵەتی: (ساسانی و ڕۆمانی) دا، هەردوو بەشی کوردستان بۆ یەکەمجار لە ڕووی خاك و ئایینەوە بوونە یەك، ئەو کوردە مەسیحیانەی لە سەر ئایینی خۆیان مانەوە، بوونە بەشێك لە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگای کوردستانی، ئەو عەرەبە موسڵمانانەی هاتبوونە کوردستان لە نێو کۆمەڵگای کوردستانەوە توانەوە و، ئەوانیش بوونە بەشێك لە کوردستان !

# دەستپێکی
# فتوحات یان بەرگری
# لە دەسەڵاتی ئیسلامی

فتوحات، یان بەرگری لە دەوڵەتی مەدینە، پرسێکە دەربارەی قایمکردنی سنووری دەوڵەتی ئیسلام و، دەرچوونی گوتاری قورئان بۆ دەرەوەی جەزیرەی عەرەبی .

لێرەدا گرینگە ئاماژە بە مافی ئیسلام بکەین لە بەرگری، هەروەها چەمکی (کۆلۆنیالیستی)، کە فەرهەنگی کۆلینزی ئینگلیزی (٢٠١٢) پێناسەی (کۆلۆنیالیزم) ئاوا دەکات : "بریتیە لە سیاسەت و پیادەکردنی هێز، بۆ درێژکردنەوەی قەڵەمڕەوی کۆنترۆل بە سەر خەڵکی لاواز و ناوچەی تردا ."

کەواتە کارەکتەری کۆلۆنی نامۆ و غەوارەیە بە سەر دانیشتوانی تر . هەرچی فەرهەنگی وێبستەری ئینگلیزیە (٢٠١٠) باس لەوە دەکات، کە (کۆلۆنیالیزم) بریتیە لە: جۆرێك لە فراوانخوازی، چونکە دەیەوێت بە زەبری هێز قەڵەمڕەوی نەتەوەیەکی تر، ناوچەیەکی تر بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی.

ئەو دوو خاڵە پرسی سەرەکی ئەم کتێبەن.

## پرسی بەرگری لە دەسەڵات:

لە دوو ماوەدا پرسی دروستبوونی دەسەڵاتی سێیەم، بووە خەمی هەنووکەیی هەردوو زلهێزی: (ساسانی و ڕۆمی) . دوا ڕێککەوتنی (ساسانی - ڕۆمی) تەواو ئاماژە بەو ترسە دەکات .

پاش تەواوگرتنی نیمچە جەزیرەی عەرەبی، ساسانی و ڕۆمی، ترسیان زیاتر لێنیشت. جەنگی (تەبوك) یەکەم کاردانەوەی (ڕۆم) بوو بەرانبەر تەشەنەکردنی ئیسلام .

(المبارکفوری ) لە (ل٥٠٨-٥١٦) باس لەوە دەکات، کە (ڕۆم) و (غەساسنە) ی عەرەب ( عەرەبی مەسیحی شام) وەك خێڵەکانی: (لخم) و ( جزام ) خەریکی خۆسازدان بوون بۆ لێدانی دەوڵەتی ئیسلامی، بۆ بەزاندنی سنووری دەوڵەتی ئیسلامی، (ڕۆم) هێزێکی (چل) هەزار کەسی ئامادەکرد.

خۆسازدانی پێغەمبەر بۆ بەرەنگاری هێزی: (ڕۆم) و (غەساسنە) و (تابووری پێنجەم) لە هەموو جارەکان ترسناکتر بوو، بۆیە پێغەمبەر ئەمجارە لەبەر ترسناکی ڕەوشە سیاسی و ئابووریەکە، داوای لە خەڵکی مەککە و خێڵە عەرەبەکان کرد بۆ بەرەنگاری، بەمجۆرە سوپایەکی ئیسلامی (سی ) هەزار بەرەو ناوچەی (تەبوك) کەوتە ڕێ.

ئەو (٣٠) هەزار کەسە ترسێکی گەورەی لای (ڕۆم) دروستکرد و نەیان وێرا سنووری دەوڵەتی ئیسلامی ببەزێنن . هەر لە تەمەنی پێغەمبەردا، لە ساڵی (١١)ی کۆچی، جم وجۆڵی سەربازی: ڕۆم و عەرەبەکانی ڕۆم لە شام زۆربوو، وەك یەعقوبی، (ل٣٩٨) و بەلازری، (ل٧١) دەنوسن سوپایەکی بە سەرکردایەتی ئوسامەی کوڕی زەید بەرەو شام ڕێکخست .

لە پاش وەفاتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، ساسانیەکانیش لە جەنگی هەڵگەڕانەوە دا (حروب الردة)دا دەستێکی باڵایان هەبوو، حەسەن مەحمود(٢٠١٢) لە (ل١٥و١٦) باس لەوەدەکات، کە (ئەبوبەکری صدیق) پاش ئەوەی توانی یەکێتی خێڵەکانی نیودوورگەی عەرەبی پتەوبکاتەوە، هەروەها سوپایەکی بە سەرکردایەتی: (خالیدی کوڕی وەلید) بۆ تەمبێکردنی ساسانییەکان بۆ باشووری عێراق بەرێکرد.

پاش گرتنی: (تەیسەفۆن (مەدائین) سەلمان پاك)،واقدی و طبری و ئیبن ئەسیرو .... زۆریتر باس لە نامەکەی خەلیفە عومەر دەکەن، کە نایەوێ لەوە

زێتر پێشڕەوی بکەن و هیوای خواستووە، کە لە نێوان موسڵمان و (ئەقلیم جیبال) دا، چیایەك لە ئاگر هەبوایە، بۆ ئەوەی نە ئەوان هێرشبکەن، نە موسڵمان .

کەواتە لەم توێژینەوەیە دا، دەمانەوێت قسە لە سەر ئەوە بکەین، کە بەشێکی فتوحات بۆ بەرەنگاری داگیرکاری: (ڕۆم و فارس و عەرەبی مەسیحی) بووە.

## دوانەی کۆلۆنیالیزم و عالەمیبوونی پەیام:

لە پێناسەی (کۆلۆنیالیزم)دا قسەمان لە سەر ئەوەکرد، کە کۆلۆنیالیزم بزاڤێکی ئیستعماری فراوانخوازە. سیفەتی نەتەوەی داگیرکراو ئەوەیە، کە پاش نەمانی گوشاری کۆلۆنیالی نەتەوەکە دێتەوە سەر کاری بەرێی، نموونەیەکی ئەم سەردەمە لە (١٩١٧-١٩٩٠) کۆمۆنیستەکانی ڕووسیا بە زەبری کۆلۆنیالیزمی ئایدیۆلۆژی، ئیمپراتۆریەکی گەورەیان دروستکرد بە ناوی: (شورەوی - یەکێتی سۆڤیەت)، هەرکە ئەو گوشارە ئایدیۆلۆژییە نەما، زۆربەی نەتەوەکان لە یازدەی کۆچی، پاش تەواو بوونی دوا پەیامی کەلامی ئاسمانی بۆ زەوی ، پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد. جیلێکی لە سەحابە دروستکرد، کە خودا لێیان ڕازی بوو، هەروەها مەحوی شاعیریش وتەنی: ئەو سەحابانە لە مەدرەسەی پێغەمبەرستان دەرچوو بوون. لە ڕێگای قورئان و (سیرە)وە پێیان گوترابوو، کە خۆشەویست جیایە لە هەموو پێغەمبەرەکان، هەم بۆ عەرەبە هەم بۆ کورد و فارس...

ئەو ئیسلامییە قورئانییە، لە سەردەمی پێغەمبەر و دەسەڵاتی سیاسی هەر چوار خەلیفەکەی بەرایی تەواو هەستی پێدەکرێت، کوردیش، چ وەك تاك، چ وەك نەتەوە لەو ماوەیەوە پاش (١٣٠٠)ساڵ لە داگیرکردن، دەرکەوتەوە و بۆوە ژمارەیەك لە ژمارەکان.

لەولاوەش هەردوو ئیمپراتۆریەتی (ساسانی و ڕۆمی) بە هۆی کێشەی ناوەکی و دەرەکی خۆیانەوە، لە هەرەسی حەتمی نزیك دەبوونەوە .

جگە لەوەی تێکستی قورئان جەخت لە سەر عالەمیبوونی پەیامەکەی دەکات، خودی پێغەمبەریش لە دوا ساتی ژیانیدا، کاری بۆ ئەوەکرد، کە ئیسلام لە نێو

عەرەب و جەزیرەی عەرەبی بباتەدەر، کەواتە پشت ئەستوور بەو دووە، دەتوانین بڵێین: فتوحات پرۆسەیەکی ئیلاهی بوو، نەك ئابووری و کۆلۆنیۆخوازی .

کتێبە مێژوویەکانی وەك: (طبری و واقدی و بلازری) باس لەوە دەکەن، کە ئەبوبەکری صدیق لە ساڵی (٦٣٤) سێ سوپای هەریەك (٣هەزار کەسی بە سەرکردایەتی هەر یەك لە :

١- یەزیدی کوڕی ئەبی سفیان.
٢- شەرحەبیلی کوڕی حەسەن.
٣- عەمری کوڕی عاص.

بەرەو دەرەوەی جەزیرەی عەرەبی بەڕێکرد.

وەك (واقدی) و (بەلازری) دەگێڕنەوە: بەشێك لە وڵاتی شام لە زەمەنی خیلافەتی (ئەبوبەکری صدیق) ڕزگار کرا.

ئەبوبەکر لە شەڕی (یەرموك یەك)، هەتا شەڕی (ئەجنادین) یا (ئەجنادەین) لە ژیاندا مابوو. (بەلازری) لە کۆتایی (٧٤ )و بەرایی (٧٥) باسی مردنی ئەبوبەکر لە دوای ئەو شەڕە دەکات .

(ڕۆژبەیان)یش لە پەراوێزەکانی نامیلکەی "وڵاتگیری ڕەشەخاکی عیراق"دا باس لەوە دەکات، کە ڕەشەخاکی عیراق، وڵاتی نێوان (بەسرە و کوفە) لە سەردەمی (ئەبوبەکر) ڕزگار کران .

لە دوای ئەبوبەکر، عومەری کوڕی خەتتاب بووە خەلیفە، تەواو پرۆژەکانی پێغەمبەر و ئەبوبەکری صدیقی جێبەجێ کرد، لە ( یەرموکی دووەم ) هاوینی (٦٣٦) کۆتایی بە دەسەڵاتی بێزەنتی لە شام هێنا - ( بەلازری،ل٨٦-٨٨).

دەستپێکی (فتوحات) بۆ گەورەکردنی پانتایی جیۆگرافیای ئیمانی، ئیسلام بوو، هەروەها پیادەکردنی ستراتیژیەتی ئایەتی: "لتعارفوا" بوو .

لەو خاڵانە دەردەکەوێت، کە ئیسلام باوەڕی بە میکانیزمی شەڕ نەبووە بۆ بڵاوکردنەوەی چەمکی (الله) لای نەتەوەکانی دوور لەو چەمکە . لە قسەکانی خەلیفە عومەریش ( لوددت ان بین السواد و بین جبل سدا... طبری،

ل٤٣٥) دەردەکەوێت، کە هەرگیز نەیخواستووە بە چەکەوە لە کوردستان نزیك بێتەوە، بەڵکو ئەوە داگیرکەری ساسانی بووە، ویستویەتی کوردستان بکاتە گۆڕەپانی شەڕ، لەم بارەیەوە طبری لە (ل٤٣٢)ی بەرگی سێیەم ڕاستی پرسەکە یەکلاتر دەکاتەوە:

" ان الاعاجم لما انتهوا بعد الهرب من المدائن الى جلولاء ،و افترقت الطرق بأهل اذربايجان و الباب و بأهل الجبال -كردستان الساسانية-و فارس تذامروا و قالوا : ان افترقتم لم تجمعوا ابدا ، و هذا مكان يفرق بيننا فهلموا فلنجتمع للعرب - المسلمين - به و لنقاتلهم ..." پاش ئەو بانگەوازە ساسانیە، شەڕی (جەلەولا) ڕویدا .

شەڕی جەنگاوەرانی ئیمان و جەهل، سەد دەر سەد شەڕی ئیمان و جەهل نەبوو، چونکە هەر قورئان پێماندەڵێ: کەسان هەن بە بیانوو و بەهانەی درۆ ئامێزی خۆیان لە ڕووبەڕووبوونەوە دەدزنەوە، هەروەها جەنگاوەر هەیە لە پێناو "لەیلای خۆیەوە، نەك ئیمان" دەچێتە ئەو شەڕەوە، سورەتی (الفتح) ئاماژە بەکۆچەرییەکانی عەرەب دەکات، کە تەنیا چاوەڕێی تاڵان و دەسکەوتی جەنگ بوونە، بەڵام هەر ئەو سورەتە قسە لە سەر پەیامی خودا دەکات، کە دەیەوێ دڵەکان داگیربکات، نەك سەروەت و سامان .

دەقی قورئان، ئەو جۆرە کەسەی ناوێت، بۆیە لێرەو لەوێ ستەمێك کرابێ، شێوەی ئەو کەسە لە سەردەمی پێغەمبەریش لە نێو جەرگەی جەزیرەی عەرەبی ئەوهایان کردووە .

لە خەتی (یەرموك)ەوە لەشکری ئیسلام لە کوردە ڕۆمییەکان ( کوردەکانی ناو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمی ) نزیك بۆوە، هەروەها لە خەتی قادسیە و مەدائین... هەمان لەشکر لە کوردە ساسانیەکان ( کوردەکانی ناو سوپای ساسانی ) نزیك بۆوە، کەواتە: هەردوو کوردستان لە یەك کاتدا ڕزگار کران.

# عەرەب یان کورد بیانووی بەهێزترە لە موسڵمانبوون؟

بە بەراورد بە ڕەوشی داگیرکراوی کورد، دەسەڵاتی عەرەبی بیانوویێکی بنەڕەتی هەبوو، کە موسڵمان نەبێت! ئەو دەسەڵاتی عەسکەری و کۆمەڵایەتی و ئابووری هەبوو، هەروەها لە مەککە بە هۆی کەعبەوە پێگە و مەنزڵی بازرگانی و سیاسی هەبوو لە نێو هەموو عەرەبی نیمچە - دوورگەی عەرەبی .

کورد چی هەبوو ؟ خاك و ئایینی دابەشکرابوو، بۆیە بە پێچەوانەی عەرەبەوە، چاوەڕێی ڕزگارکەرێکی دەکرد..

خاك داگیرکراوی و دووربوونی لە دەسەڵات، دوو فاکتەری سەرەکین بۆ زوو موسڵمانبوونی کورد، هەروەها جۆری ئایین، دەوری لە سەر بە ئاشتی (لە کوردستانی ڕۆمی ) و، بە شەڕ موسڵمانبوونی( لە کوردستانی ساسانی ) هەیە .

جگە لەوەی مامۆستا حەسەن مەحموود لە کتێبی ( فتوحاتی ئیسلامی )دا، بە درێژی باسی موسڵمانبوونی کوردی کردووە، بەڵام لە کتێبی (فەتحکردنی ناوچە کوردییەکان)، ئەم پرسیارەی کردووە : فەتحی ناوچە کوردییەکان بەئاشتی بووە، یان بە شەڕ؟

ئێمەش لەم کتێبە هەوڵ دەدەین، هەم جیۆگرافیای ئەوسای کوردستان بخەینەڕوو، هەم دەربخەین: چ ناوچەیەك بە شەڕ موسڵمان بووە، هەم چ ناوچەیەکی تری کوردستان بە ئاشتی موسڵمان بووە ؟

(ئارشاك پۆلادیان) لەگەڵ هەموو بێویژدانیەکەوە ناتوانێ نکوڵی لەوە بکات، کە کورد بە ڕێگای شەڕ و ئاشتی موسڵمان بووە، ئەم ڕاستیەش لە (ل٩) دەدرکێنێت: "زانیارییەکان ئەوە ڕوون دەکەنەوە، کە عەرەبەکان ناوچە کوردەوارییەکان بە دوو ڕێگا "داگیرکردووە":

یەکەمیان : لە ڕێگای چەکەوە .

دووەمیان: لە ڕێگای پەیماننامەی ئاشتی، ئەمەش لە: (طبری و ئیبن ئەسیر ، ئیبن کەسیر و ئیبن خەلدون) و زۆری دیکەش ئاماژەی پێدەکەن .

# دەروازەی
# بەشی چوارەم

لەم بەشەدا، هەوڵ دەدەین ڕوناهی بخەینە سەر سنووری جیوگرافی ئەقلیمەکانی: (کوردستانی ساسانی و کوردستانی ڕۆمی) . پاش دیاریکردنی قەڵەمڕەوی ئەو دوو بەشەی کوردستان، دەمانەوێ قسە لە سەر چەمکی (فتوحات) لە کوردستان بکەین، بزانین کێن ئەوانەی بەشەڕ موسڵمان بوونە، هەروەها ئەوانەش کێن، کە بەئاشتی و (جزیە) دانەوە موسڵمان بوونە ؟

# چەمکی
# کوردستانی ساسانی

کوردستانی ساسانی بریتی بوو لە: سێ ئەقلیمی جودا، بەڵام سەرچاوە ئیسلامیەکانی ئەوسا، زیاتر باس لە دوو ئەقلیم دەکەن و عیراقی عەجەمی و ئەقلیم بە یەکەوە دەبەستنەوە، بە واتای: ئەو دوو ئەقلیمە، بە ئەقلیمێك دادەنێن ، ئەقلیمی دووەمیش ئەقلیمی: (جەزیرە)یە . ئەم نووسینە هەر جەخت لە سەر ئەوە دەکات، کە سێ ئەقلیم لە کوردستانی ساسانی هەبووە :

## ا- ئەقلیمی عیراقی عەجەمی :

سنووری عیراقی عەجەمی جیایە لە ئەقلیمی جیبال .(دکتۆر بەعلەبەکی) (٢٠٠٥) لە (ل٧٥٢) دەربارەی وشەی (عەجەمی) دەنووسێت : بریتیە لە: (نا - عەرەبی) وە لە (ل١٣٠) دەڵێت: کەچی هەرچی پەیڤی ( اعجمی)یە، بریتیە لە ناڕوونی پەیڤ، یا ئاخاوتنی ناڕوون. " کەواتە عەجەمی هەر فارسی نییە، بەڵکو کوردیش دەگرێتەوە . زۆربەی سەرچاوەکان وەك طبری، (ل١٨٥)و بەلازری، (ل ٢٩٠)، رۆژبەیانی و خەسرەو گۆران و زرار صدیق... جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە، کە ئەو ئەقلیمە:(عیراقی ئەعجەمی ) خەتی جیاکەرەوەی وڵاتی کوردە لەگەڵ عەرەب.

لەوەش زیاتر، خەسرەو گۆران باوەڕی وایە، کە (عیراقی عەجەمی) بریتیە لە: باشووری کوردستان.

لە ڕاستیدا شارەکانی (عیراقی عەجەمی) ( یان وەك هەژار موکریانی وتەنی:

عیراقی کوردی -لە پێشەکی شەرەفنامە ) شار و شارۆچکەکانی: (جەلەولا و شارەبان و خانەقین و حەلوان) دەگرێتەوە.

## ٢- ئەقلیم جیبال:

وشەی (ئەقلیم جیبال) هەر لە سەردەمێکدا ناوێکی هەبووە :

١- ئەشکانییەکان پێیان دەوت: وڵاتی (بەهلەوییەکان)،کە و وشەکانیان بە ئارامی دەنووسی.(کریستینسن، ل٥٢-٥٣).

٢- بەناز عەدۆ لە (ل٢٢) ماستەرنامەکەی لە (قەزوێنی ) دەگوازێتەوە، کە ساسانیەکان پێیان دەوت: (قهستان).

٣- (لسترنگ ) لە (ل٣٣١) دەڵێت: عەرەبەکان پێیان دەوت: (اقلیم جیبال). (ئیبن حەوقەل) (١٩٧٩) لە (ل ٣١٥) دەربارەی ئەو ئەقلیمە دەڵێت: چیاکانی بەرزن، هەروەها پڕە لە پێچاو پێچی و هەوراز و نشێوی دژوار ."

هەروەها لە (ل٣٠٤) لە ژێر ناونیشانی: (جیبال) دەڵێت: لە ڕۆژئاواوە سنووری لەگەڵ شارەزوور و جەزیرە... هەیە".

خەسرەو گۆران لە کتێبی: (کوردستان..) باوەڕی وایە: ئەقلیم جیبال، ڕۆژهەڵاتی کوردستانە .

ناونانی (ئەقلیم جیبال) بە وڵاتی: (پەهلەوی و کێوستان و ڕۆژهەڵاتی کوردستان)، پێناسەیەکی تەواو جیوگرافی نییە، چونکە تەواوی (ئەقلیم جیبال) لای ئەشکانیەکان (قهوستان) نەبوو، هەروەها ناوچەکە هەموو چیایی نییە، تا (کێوستان) بێت، لەوەش زیاتر، شار هەیە ئێستا لە سنووری باشووری کوردستانە، یا لە سەر سنوورە لە نێوان فارس و کورد، بۆیە زاراوەی جیوگرافی " ڕۆژهەڵاتی کوردستان" پڕ بە پێستی سنووری جیوگرافی (ئەقلیم جیبال) نیە.

## ٣- هەرێمی جەزیرە :

جیوگرافی هەرێمی (جەزیرە)، جیوگرافیەکی کارگێڕییە، نەك ڕووبەری. موحسن مامل (٢٠١٤)لە (ل١٣٩) لە زۆر لە جیوگرافیناس و مێژوونووسانی وەك: (ئیبن حەوقل و قەزوێنی ...) دەگوازێتەوە، کە هەرێمی (جەزیرە) دەکەوێتە نێوان هەردوو ڕووباری: (دیجلە و فورات).

ئیبن حەوقەل لە (ل١٨٩) دەربارەی هەرێمی (جەزیرە) دەنووسێت: فأما الجزيرة التي بين دجلة و الفرات فلتشمل على ديار ربيعة و ديار مضر و مخرج الفرات من داخل بلد الروم ."

بەر لە دروستبوونی ناوی (جەزیرە)، ئەلمەقدسی لە (ل١٢٤)ی (احسن التقاسيم) و یاقوت حەمەوی لە (ل١٣٤) معجم البلدان زاراوەی: ( اقور ) و ( ابور )یان بۆ جەزیرە بەکارهێناوە.

ئیبن حەوقەل لە (ل١٨٧) باسی شێوەی فۆرمی جیوگرافی شاری (جەزیرە) ئاوا دەکات : قد رسم في نصف الصورة الايمن من اعلاها الى اسفلها نهر الفرات و يوازيه عن اليسار نهر دجلة و كتب عن يمين نهر الفرات في الزاوية العليا صورة الجزيرة..".

ئازاد دیرکی لە بارەی جیوگرافی ئاوی (جەزیرە)، کە ئیبن حەوقەل لە سەرەوە ئاماژەی پێدەکات، ناوی (جەزیرە) دروست بووە، نەك " ناوی جەزیرە لە عەرەبییەوە هاتبێت ."

بە حوکمی ئەوەی دوو شار لە باکوور و ڕۆژئاوای کوردستان هەن، بۆیە هەندێك زەنی ئەوە دەبەن، کە هەرێمەکە تایبەت بێت بەو دوو بەشەی کوردستان. ناونانی هەرێمێك بە (جەزیرە) ناولێنانێکی جیوگرافی ڕووبەری ( دانیشتوان + خاکی باکوور و ڕۆژئاوا ) نییە، بەڵکو پۆلێنێکی کارگێڕییە، بۆیە کەسانی وەك: (دکتۆر جەمال ڕەشید و دکتۆر کەمال مەزهەر) لە هەردوو کتێبی: ( دراسات كردية...) و ( كركوك ..) بە جیا باس لەوە دەکەن، کە هەرێمی (جزیرە)، بێجگە لە هەندێ شار و شارۆچکەی باکووری کوردستان، بەشێك لە شار و شارۆچکەی باشوور وەك: (هەولێر و ئاراپخا - کەرکوك و موصڵ و بادینان وەك: (دهۆك و زاخۆ و سنجار) دەگرێتەوە .

# کوردستانی بندەستی ڕۆمی

ئەو بەشەی کوردستان لە ڕووی دینداری و جیوگرافیەوە، لە کوردستانی بندەستی ساسانی جیا بوو . لە کوردستانی بندەستی (ڕۆم)، لە سەدەی (سێ) و (چوار)ەوە، دوو جۆری مەسیحیەت هەبوو :

## ١- مەسیحیەتی ئازاد و کۆن:

(ئەدی شێر) و (مشیخا) باس لەوە دەکەن، کە بەر لەوەی ڕۆمەکان ببنە مەسیحی، ئیمپراتۆری وەك: (یانوس) زۆر مەسیحییەکانی بن دەستی دەچەوساندەوە، ئەو کوشتن و چەوساندنەوەیە، هەتا مەرسومی (میلانۆ) لە (٣١٣)هەر بەردەوام بوو.

لە (مەرعش) و (ڕەها) کوردێکی زۆری بن دەستی (ڕۆم)، پێش ڕۆمەکان بوونە مەسیحی وەك نەستوری مەرعشی،میرشەرەفخانی بدلیسی لە (شەرەفنامە) دا لە دیارکردنی جیوگرافیای وڵاتی کوردستان دا، (مەرعەش) دەخاتە ناو ئەو سنوورەوە : کوردستان، لە کەنداوی (فارس) لە باشورەوە دەستپێدەکات، تا (مەلاتیە) و (مەرعەش) و ئەودیوی ڕوباری فورات، لە باکور و ڕۆژئاواوە ."

## ٢- مەسیحی دەوڵەت :

پاش ئیمپراتۆر، (قوستەنتین) بووە مەسیحی، مەسیحیەتی کردە ئایینی ڕەسمی دەوڵەت . هالە صلاحەدین (٢٠٠٦) لە کتێبی " کیف أسلمت" لە ڕۆژئاواییەکان دەگوازێتەوە، کە لەوساوە بیرۆکەی سێینەی: (کوڕ- باوك - روح القدس) بڵاوبۆوە، ئەگەرنا پێشتر نەبوو .

کوردیش وەك هاولاتیەکی (ڕۆم) بۆی هەبوو لە ڕوالەتدا مەسیحی بێت .
کەواتە: لە کوردستانی بندەستی (ڕۆم)، دوو جۆر، هەتا سێ جۆر مەسیحیەت هەبوو، بەلام مەسیحیەت نەبوو بووە شوناسی ئایینی کورد، هەتا لە کوردستانی بندەستی (ڕۆم)یشدا .

**لە لایەن جیوگرافیەوەش، دەکرێ بێژین: سێ هەرێم لەو کوردستانە هەبووە :**

## ا- کوردستانی (سریا) یا (شام) :

لە شام، جگە لە قەومە کۆنەکانی وەك: (ئاموری و فینیقییەکان..) لە سەردەمی ئیسلامیدا، تەدموری و عەرەبی مەسیحی غەساسنە و کوردەکان دەژیان.
دکتۆر (صالح العلی) لە (ل٤٦-٤٧) ی (محاضرات في تأریخ العرب) وا باسی تەدمور دەکات،کە لە بادیەی شام سەرکانییەك نیوە ڕێی فورات لەلایەك و، دیمەشق و حمص لە لایەکی دی هەلکەوتبوو .
بەپێی (کتێبی پیرۆز) سلێمان پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) شاری (تدمر)ی دروستکردووە . "ڕۆمەکان هەر یاخیبوونێکی قەومی غەیرە ڕۆمیان لە قەلەمڕەوی خۆیان هەبایە، ئەوا ئەو یاخیبونەیان دەمکووت دەکرد، یاخیبوونی (زنوبیە خاتوون) و فەشەلهێنانی یەکێ لە یاخیبوونی تەدمریەکانە .

غەساسنە، یا عەرەبی مەسیحی، بەشێکی تری پێکهاتەی دانیشتوانی شام بوو. دکتۆر صالح العلی لە (ل٦٣)ی کتێبەکەی پێشووی دەگێڕێتەوە: غەساسنەکان چەندین جار هاوشانی ڕۆمەکان بەرەنگاری موسلمانەکانیان کردووە، بە تایبەتی لە شەڕی: (یەرموك)، ئەو عەرەبانەش لە سەر مەزهەبی (یاقووبی ) بوونە ."

قەومی سێهەم: کوردەکان بوونە . ئەوسا لە ڕووی کارگێڕیەوە کوردەکانی شام، هەروەك کوردەکانی بەشی کوردستانی ڕۆمی بوونە .

خەسرەو گۆران لە (ل١٩١)ی (کوردستان لە مێژوودا) دەلێت : لە سوریا

هەرگیز ناوی کوردستان نابردرێ، زاراوەی (جزیرە)ی بۆ بەکاردەهێنرێ ."

ئەوسا شاری وەك سەراکانی، بە شارێکی هەرێمی (جزیرە) حسێبی بۆ کراوە - بڕوانە ماستەرنامەکەی محسین (٢٠١٤) کوردستان کتێبی (تقویم البلدان...) کەچی (ل٥١) و کتێبی: (کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا) دەنووسێت : (مەلاتیە و ئورفە و دیاربەکر و وان) لە شارەکانی ڕۆژئاوای کوردستانن!!

**دوو بەشەکەی تری کوردستانی بندەستی ڕۆم بریتین :**

١- بەشێکی هەرێمی (جزیرە).
٢- زۆزان.

**بە کورتی :**

کوردستانی ساسانی، هەر تەنیا باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان نەبوو، بەڵکو لە هەندێ ماوەدا، زۆر شاری باکووریش دەکەوتنە ناو قەڵەمڕەوی ساسانی.
ئەو قەڵەمڕەوییە، لە لایەن نووسەرە موسڵمانەکانەوە، هەر دەڤەرەی ناوێکی هەبووە، بۆ نموونە: خەسرەو گۆران لە (ل١٨٨) دەنووسێت : "عارەبە موسڵمانەکانیش زاراوەی - بلاد الجبال - کۆهستان - یان یان وڵاتی (قهستان)، یان بە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەگوت و، بە کوردستانی باشوریان دەگوت :- العراق العجمی - و باشوری ڕۆژئاواشیان دەگوت :- (بلاد الجزیرة) بە کوردستانی ناوەڕاستیش، دەگوت بلاد (الزوزان) و بە ئەوپەڕی باکوریشیان دەگوت: (ئەرمینیا) ."

گەر سنووری جیۆگرافی کوردستانی، بە پێوەری کتێبەکەی خەسرەو گۆران، (ل١٩٨-١٩٩) بکێشین، ئەوا ڕێژەی:

١- زیاتر لە ٪٤٤ باکوری کوردستانە.
٢- زیاتر لە ٪٣١ ڕۆژهەڵاتی کوردستانە.
٣- زیاتر لە ٪١٦ باشووری کوردستانە.

٤- زیاتر لە ٤٪ رۆژئاوای کوردستانە.
٥- لە سەدا یەك زیاتر ئەرمینیا + ئازەربایجان + ئاران بووە.

لەو هەموو ڕێژەیە، هەر تەنیا (٣٠٪)ی لە ژێر دەستی ڕۆمەکان بووە . کورد لە دەرەوەی کوردستانیش لە: (خوراسان و هەرێمی فارس و ئەهواز) لە بندەستی ساسانیەکان بووە، هەرچی کوردەکانی (ئەنادۆل)ن لە بندەستی ڕۆمەکان بوون .

# فتوحاتی
# هەرسێ بەشی کوردستان

پرسی (فتوحات)، پرسێکی ئیلاهی بوو، کە دەبوو هەردوو فاکتەری عالەمیبوونی گوتار و گەیاندنی پەیامی خودا بگەیەنرێتەدی. لە ئیسلام دا جیهاد خۆی ئامانج نییە، بەڵکو میکانیزمی بەرگری و گەیاندنی پەیامی خودایە .

(فتوحات) لە هەڕەشەی عەسکەری: (ڕۆم و ساسانی) دروستبوو، ئەگینا چۆن ئیسلام لە: (ئەندەنوزیا و مالیزیا) و وڵاتانی دی بڵاوبۆوە، کەواتە: (فتوحات) لە بەرگری و گەیاندنی پەیامی ئاشتی دروستبوو .

دەقی نامەکەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە (٦) ی کۆچی (٦٢٧) ی میلادی، کە بە (عبدالله بن حزافة السهمي) بۆ کیسرای ناردبوو، باشترین بەڵگەی جیهادی ئاشتیخوازی ئیسلامە .. اسلم تسلم ، فأن ابيت فعليك أثم المجوس ، فمزق كتاب رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ، فقال رسول الله : مزق ملكه" ( طبری، ب٢،ل٦٥٤ ).

نە(ڕۆم) نە ساسانی، نەك هەربەدەم بانگەوازی ئاشتیانەی پێغەمبەر نەهاتن، بەڵکو هەردووك وازیان لە شەڕی چەندان سەدەیی هێنا و، کەوتنە ڕێککەوتنی ئاشتی .

وەك لە پەیماننامەکانی: (ساسانی و ڕۆمی) دەردەکەوێت، کە نەیاندەهێشت گوتاری قورئان لە جەزیرەی عەرەبی دەربچێت و بە مرۆڤەکان بگات . بۆیە هەرزوو پێش وەفاتی پێغەمبەر و دوای وەفاتی پێغەمبەر، کەوتنە هێز کۆکردنەوە

( وەك هەڕەشەی شەڕی تەبوك) و دەستوەردان لە سەروەری سنووری دەوڵەتی - دەستیان لە بزاڤی هەڵگەڕانەوەی هەندێ هۆزی عەڕەب بینی .

بە قسەی مامۆستا حەسەن مەحموود لە (ل١٥-١٦)ی کتێبی: (فەتحی ناوچە کوردییەکان....) فەتحی عیراق بۆ تەمبێکردنی فارسەکان بووە، چونکە دەستیان لە هاندان و هەڵگێڕانەوەی خێڵی موسەلیمەی کەزاب هەبووە ."

سەرەتا سوپای ئیسلام چووە ناوچەی (ئیبلە) و شەڕی (ذات السلاسل) ڕوویدا و شەڕی دی وەك: (المزار، الولجة، الیس، حیرة، ذات العیون، التمر، الحصید، المصیخ، الفراض) پاش ئەو جەنگانە، باشووری عیراق لە دەستی فارسەکان ڕزگاری بوو - هەمان سەرچاوە (ل١٦).

لە کاتی ئەو شەڕانەدا (پوران شا) شوێنی خوشکە کوژراوەکەی: (ئازەرمیدۆخت) گرتبۆوە . (پوران شا)ی کچی (خەسرەو شا)ی ساسانی زۆر لای جەماوەرەکەی مەقبووڵ بوو، وەك صدیق بۆرەکەیی لە (ل٨٨٦) (شانامە) دەنووسێت :

پووران دۆخت کچی خەسرەو پەروێز بوو　　لە لای گشت کەسێ،ژنێ بەڕێز بوو

( صدیق بۆرەکەیی، ١٣٨٤، ٨٨٦).

سەرچاوەکان بە زەردەشتی و مەسیحی و، هەتا عەرەبی ( لەوانە: طبری ) جەخت لە سەر لایەنی ئەرێنی ئەو پاشایە مێیە دەکەن، زۆر بە دەگمەن سەرچاوەیەك دەدۆزیەوە، کە باس لە حوکمڕانی نەرێنی (بۆران خان) بکەنەوە —کەلسومە (٢٠١٥،ل٨).

(پوران شا)ش بە دەردی خوشکەکەی چوو ( پیاوەکانی کۆشك هەردوو خوشکیان کوشت )، لە پاش ئەویش (یەزگوردی سێیەم) بووە شای ساسانی.

لە پاش کۆچی دوایی خەلیفە ئەبوبەکر لە ساڵی (١٣) کۆچی، ململانێکانی بنەماڵەی ساسانی لەگەڵ یەکتر لەوپەڕی دابووە، بەڵام هێرشی ئەبوبەکر، نەك نەگەیشتەکوردستان، بەڵکو شەڕی: (مەدائین و قادسیە)شی پێنەکرا.

# ئیسلامی عەقائیدی و فتوحاتی کوردستان

خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب یەکێك لەو مرۆڤە نەجیبزادانە بوو، کە ئەوەندە پابەندی پرانسیپەکانی ئیسلام بوو، موحەممەد پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەربارەی دەفەرمووێ: " گەر پێغەمبەرێك دوای من هاتبایە، عومەری کوڕی خەتاب بوو ."

ئەو هەوڵەی عومەری کوڕی خەتاب، بۆ فراوانکردنی ئاقاری جیۆگرافیای ئیسلام بوو، ئەو مەبەستی بوو، ئەوەی لە قورئان و فەرمودە هاتووە، لە دەرەوەی نیمچە دورگەی عەرەبی پیادەی بکات .

عومەر مەبەستی فراوانخوازی نەبوو، بەڵکو گەیاندنی ئیسلام بوو بە نەتەوەی دی، . ئەوەش کرۆکی ئیسلامی عەقیدەییە.

(واقدی) و (طبری) و (ئیبن ئەسیر) - (ل٣٦٥، ب.٢...) سەرچاوەی تر، هەموو وتەیەکی عومەر دەهێننەوە، کە هەرگیز نەیخواستووە شەڕی کورد و فارس بکات: "لوددت لو ان بين السواد و بين الجبل سدا لا يخلصون الينا و لا نخلص اليهم ، حسبنا من الريف السواد اني اثرت سلامة المسلمين على الانفال."

## هێڵەکانی فتوحاتی ئیسلامی لە کوردستان:

لە بەشەکانی پێشوودا، هەم ناوی هەردوو کوردستمانمان جیاکردەوە، هەم سنووری جیوگرافی وەهمی ئەقلیمە کوردییەکانمان دەرخست. لە پرسی فتوحاتی هەرێمە کوردییەکان دا، گرینگە ئاماژە بە هێڵەکان بدەین :

## هێڵەکانی فتوحات لە کوردستانی بندەستی ساسانی:

**لەو بەشەی کوردستان دا سێ هێڵی شەڕ هەبوون :**

**١- هێڵی، یا قۆڵی جەلەولا + خانەقین + حەلوان + نەهاوەند.**

**٢- قۆڵی جەلەولا + خانەقین + تکریت + هەولێر + بادینان + سنجار.**

**٣- قۆڵی دینەوەر + هەمەدان + بەشێکی ئەرمینیای ساسانی.**

**لە کوردستانی بندەستی ڕۆم، دوو هێڵی سەرەکی و هێڵێکی مامناوەندی هەیە :**

**١- شام + هەرێمی جەزیرە .**

**٢- زۆزان .**

**٣- بەشەکەی تری ئەرمینیا .**

**قۆڵی نەهاوەند بۆ ئەرمینیا + قۆڵی زۆزان بۆ ئەرمینیا +جەرگەی ئەترۆپاتین.**

## خەلیفە عومەر و عیراقی عەجەمی، یا هێڵی یەکەم:

لە دوای وەفاتی ئەبوبکر، خەلیفە عومەر(١٣ك-٢٤ك | ٦٣٣-٦٤٤) لە سەر پرۆسەی فتوحات بەردەوام بوو .

(بەلازری) لە (ل١٥٤ -١٦٠) ی چاپی (٢٠٠٠)دا باس لە شەڕی: عیراقی فارسی دەکات، کە بە (مەهران) دەستپێدەکات و (قادسیە) و (مەدائن - تەیسەفۆن) (سەلمان پاك) دەگرێتەوە . (بەلازری ) لە (ل١٥٥-١٥٨) قسە لە سەر ڕووبەڕووبوونەوەی (قادسیە) دەکات لە (١٦) کۆچی، هێزی عەسکەری ساسانیەکان، نزیکەی (١٢٠)هەزار کەس دەبوو، هەرچی موسڵمانەکانن لە نێوان (٩ هەتا ١٠) هەزار دەبوون .

دکتۆر عبدالله موستەفا لە (ل٣٦-٣٨) ی نامیلکەی: (امجاد الاکراد) ئامازە بەوە دەکات، کە سەرکەوتن لە (قادسیە) و (تەیسەفۆن) و (حەلوان)

بە یارمەتی کوردانی (دێلم) ناسراو بە (دێلمی سوور) بووە .

فازل قەرەداغی لە (ل ٧٥)ی بە ئیسلامکردنی کورد لە (ل٢٧٩) ی (بەلازری) دەگوازێتەوە، کە (٤هەزار) سەربازی (دەیلمیی) لە لەشکری ساسانی هەڵدەگەڕێنەوە و دەچنە پاڵ سوپای ئیسلامی .

عەباس سلێمان (٢٠٠٨) لە (ل٨٠)ی (ناوە کوردیە دێرینەکان) دەڵێت: بە هۆی شەڕوشۆڕی (دەیلەم) و (لاهی) بەرە بەرە کوردەکانی (هەزبانی) دەسەڵاتیان نامێنێ، ئەگەرنا (هەزبان) هۆزێکی گەورەی کورد بوونە، بەر لە ئیسلام، لە ئازەربایجانی گەورەی ئێران نیشتەجێبوونە، دواتر بە ناوی (ڕاوەندی) و (رەوادی) ناویان دێت." لە گۆڤاری (ئالآی ئیسلام - کەنەدە) رەوادی وەك حکومەتێکی ئیسلامی دەهێنێت.

عومەری کوڕی خەتتاب لە (١٣)ی کۆچیەوە (١٠) ساڵ و (٣) مانگ خەلافەتی کرد، لەو ماوەیەدا زۆر جێگای لە بەر دەستی ڕۆم و فارس ڕزگار کرد، لەوانە: (دیمەشق و حمص و بعلبك و بصرة و الابلة و عێراق و کوردستان بە جەلەولا و شارەزوور و تکریت و میسر و قودس و ئێران و تەرابلوس...). خالد محمد: خەلیفەکانی پێغەمبەر، ل١٥٨."

من تەنیا لە ئیسلامی عەقائیدی، باسی: (عومەر و عوسمان و عەلی) و فتوحاتی کوردستان دەکەم .

**کوردستانی ساسانی ئەوسا بریتی بوو لە سێ بەش :**

## فتوحاتی عیراقی کوردی :

هەژار موکریانی(١٩٧١) لە (شەرەفنامە) بە عیراقی عەجەمی دەڵێت: "عیراقی کوردی"، عیراقی کوردی ئەوسا، زۆربەی باشووری کوردستان بوو.

لە سەرچاوەکانی سەردەمی حوکمڕانی: (ئەمەوی) و (عەباسی) زۆر قسە لە سەر شارە کوردییەکانی عیراقی کوردی، وەك: (حەلوان و جەلەولا و

خانەقین) دەکەن.

لە نێوان (عیراقی کوردی) و (ئەقلیم جیبال) یەکەم ڕوبەڕوبونەوەی ساسانی و لەشکری ئیسلام لە (جەلەولا) ی عیراقی کوردی ڕویدا . لە پاش (جەلەولا)، لەشکری ئیسلام، (خانەقین) و (حەلوان)یشی گرت .

(ئیبن ئەسیر) لە (ل٣٦٦)، (ب .٢) باس لەوە دەکات، کە فارسەکانی دەوروبەری (مەهران) لە (خانەقین) خۆیان مۆڵ دا، بەڵام (قەعقاع)، (مەهرانی) کوشت . "(بەلازری) لە (فتوح البلدان)دا ئاماژە بەوە دەکات، کە لەشکری ئیسلام ئەو سەربازانەشی کوشت."

(حەلوان) شارێکی سەرسنووری نێوان عیراقی کوردی و ئەقلیم جیبال بوو . مامۆستا حەسەن لە (ل٣٤)ی (فەتحی ناوچە کوردییەکان) دەنووسێت : "حەلوان نزیك (سەرپێڵی زەهاو)ە بەلاپاڵی چیاوە بەسەر عیراقدا دەڕوانێت ." لە (حەلوان)ەوە کۆتایی بە سنووری عیراقی کوردی دەهات .

دکتۆر عبداللە مصطفی بەشداری کورد لە شەڕەکان دووپاتدەکاتەوە: (دێلمی تابعی) سەرکردەیەك بووە، وەك (سەعدی کوڕی وەقاص)ی سەرکردە، بەرانبەر ئەو بەشداریەی کورد، ئەمیری ئیمانداران ڕازیبووە بە دامەزراندنی (سلمان فارسی) وەك (والی مەدائین - تەیسەفۆن)، هەروەها دوو کورد لە دێلمەکان بوونە والی (حەلوان) و والی (جەلەولا). " مامۆستا حەسەن لە (ل٣٤) ئەو والیبوونەی کورد لە (حەلوان) دووپاتدەکاتەوە. ئیبن ئەسیر لە (ل٣٦٥،ب٢) دەنووسێت : "ئەو کەسە ناوی قوباد بوو، لە ئەصڵدا ئەو کەسە، خوراسانیی بوو."

ئەو کەسە کورد بێ، یا خۆراسانی، عەڕەب نەبووە، کەواتە بانگەشەی ناحەزانی ئیسلام، هیچ دەرفەتیان بۆ سەپاندنی بەعەرەبکردن بێ بەرهەمە و ڕەنج بەخەسارییە.

شەڕی: (قادسیە) و (مەدائین) دەرگاکردنەوە بوو بۆ خاکی کورد، بە تایبەتی عیراقی کوردی .

مامۆستا حەسەن مەحموودلە (ل٢٢)ی (فەتحی ناوچە کوردییەکان) لە (ڕۆژبەیانی) دەگوازێتەوە، کە "مەدائین گیرا، (یەزگورد) حەلوانی کردە پایتەخت، هەموو گەنجینەی وڵاتی بەرەو ئەوێ بەڕێخست ....لە حەلوان دەستوری بە هێزەکانی چیا - کوردستان و ئازەربایجان و شیرواندا، کە بچنە کۆمەك و یاریدەدەری مەهرانی کوڕی."

شەڕی (جەلەولا) لە نێوان لەشکری ئیسلامی و ساسانی زۆر گەورە بوو، بۆیە بەشێك لە مێژوو نووسە موسڵمانەکان، لەوانە: (بەلازری) (ل١٦٠-١٦١) بە ناوی کوشتاری گەورە ناوی دەبات .

دکتۆر عبدالله ی شێخ مستەفا لە کتێبی (امجاد الاکراد) لە بەر بەشداری کوردە موسڵمانەکان، کە ناسرابوون بە: (دێلمی سوور)، یەکێکیان کرایە والی جەلەولا ."

مامۆستا حەسەن مەحموود لە (ل٣١) لە (خزری) دەگوازێتەوە "ئەو فارسانەی مابوونەوە، جەلەولایان بەرەو خانەقین جێهێشت . لەو جەنگەدا (مەهرانی کوڕی یەزگورد) لە خانەقین کوژرا، هەروەها زۆر لە خزم و نزیکانی (یەزگورد) و میرەکان کوژران، (شابانۆ)ی کچی (یەزگورد) بەدیل گیرا ."

## جەنگی خانەقین :

دوای شکانی هێزی ساسانی لە جەلەولا، بەرەو خانەقین ڕایکرد. حەسەن مەحموود لە (ل٣٣)دا دەڵێت : خانەقین بە ئاشتی ڕزگارکرا . "هەر لە هەمان لاپەڕەدا لە (ئیبن ئەعسەم) دەگوازێتەوە: پاش شەڕی جەلەولا، موسڵمانەکان بەرەو خانەقین کەوتنەڕێ، کە فارسەکان بەمەیان زانی، بەرەودوا کشانەوە و شاریان جێهێشت و چوونە (قەسری شیرین)، لەوێش نەوەستان، هەتا حەلوان ."

ئیبن ئەسیر لە (ل٣٦٦، ب.٢) سوپای ئیسلام هێزە شکستخواردووەکەی فارسی بە سەرکردەوە، کە ( مەهران )بوو، کوشت."

## جەنگی حلوان

پرۆسەی ئاشتەوەری و کۆتایی سنووری عیراقی عەجەمی، پرۆسەی ئاشتەوایی یەکێك لە پرانسیپەکانی ئیسلام بوو . کورد زۆر ئاشنا نەبوو بە فۆرمێکی ئەوها، چونکە تەواو لە دەسەڵاتی فارس گەیشتبوون، کە قەبوڵی ئەویتر ناکەن، لەو چوار سەد ساڵیە (٢٢٦-٦٣٢) مەسیحیەتی تەواو لاواز کرد، (مانیەت)ی لە نێو برد، بە هەمان شێوەش (مەزدەکیەت)ی لە نێو برد .

شاری (حەلوان) تەنیا کوردی تێدا نەبوو، بەڵکو (فارس) و (ئەشکانی) تێدا بوو. (بەلازری) لە (ل١٨٢) ی (فتوح البلدان) دەنووسێت : "ففتح جرير حلوان صلحا على ان كف عنهم و امنهم على دمائهم و أموالهم و جعل لمن احب منهم الهرب لأن لا يعرض لهم : (جەریر) بە ئاشتی دەستی بە سەر (حلوان) گرت، بە مەرجێك واز لەو خەڵکە بهێڵدرێت و خوێن و سامانیان بپارێزرێت و ڕێ بەو کەسانەی پێیانخۆشە ڕابکەن، ڕێیان پێ بدرێت. " دکتۆر عبدللە مستەفا لە (امجاد الاکراد) باس لەوە دەکات، کە عومەری کوڕی خەتاب، کوردێکی (دێلمی) کردە والی (حلوان) ."

(ئارشاك پۆلادیانی) ڕۆژهەڵاتناس، ڕاڤەیەکی تەواو هەڵە بۆ ئەو قسەیەی (ئیبن کەسیر) دەکات : "ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە حەلوان و دێهاتەکانی، ئیسلامەتیان ڕەت کردۆتەوە و بەرەنگاری سوپای عەرەب بوون ."

ئەو دیتنەی (ئارشاك)تەنیا کەسانی وەك خۆی پشتڕاستی دەکەنەوە، ئەگەرنا لە ڕاستیدا، گرتنی (حەلوان)، دەروازەیەکی دروستکرد بەرەو تەواوی (ئەقلیم جیبال) و (فارستان)، ئەوەتە مامۆستا حەسەن مەحموود لە (ل٣٤ )ی کتێبی (فەتحی ناوچە کوردییەکان) دا لە سەرچاوەکان دەگێڕێتەوە، کە جگە لە (جەلەولا) باسیان لە ڕزگارکردنی: (خانەقین و سەرپێڵ و قەسری شیرین و حەلوان کردووە)، کە بە ئاشتی ڕزگارکراون."

ئەو ڕزگارکردنە بە ئاشتی، ڕاپەڕینی مارتی (١٩٩١)م بە بیر دەهێنێتەوە،

جگە لە صەدامیەکان، سوپای بەعسی لە کوردستان، بە عەرەب و تورك و کوردەوە لەگەڵ چەندەها فەوجی جاشی کوردەوە تەسلیم بە هێزی پێشمەرگە بوون، بێئەوەی کەسیان لێبکوژرێت !

(ئارشاك) لە (ل٣١) ی کتێبەکەیدا، ئەوەندە بە لێڵی وتەکەی (بەلازری) دەگوازێتەوە، کە گومان لای خوێنەر دروست دەکات، کە دەنووسێت : بە پێی ئەوەی، کە (بەلازری) دەیگێڕێتەوە، دوای ئەوەی عەرەبەکان لە داگیرکردنی (دینەور) سەرکەوتنیان وەدەست نەهێنا، بە سەرۆکایەتی (جەریر) لەگەڵ حەلواندا ڕێکەوتنیان مۆر کرد، ئینجا (کرماشان-قەرەمسین)ی داگیرکرد ." لە بەرگی ناوەوەی کتێبەکە نووسراوە: ئەدهەم شێخۆ و کۆمەڵێ مامۆستای مێژووی ئیسلامی لە زانکۆی(دهۆك) پێیداچوونەتەوە.

دەپرسین: ئاخۆ لە کاتی گرتنی (دینەوەر)دا، (حەلوان) نەگیرا بوو ؟ یان (بەلازری) لە (ل١٨٥) ئەوها باسی (دینەوەر) دەکات ؟

(بەلازری) دەنووسێت : " قالوا : انصرف ابو موسى الآشعرى من نهاوند وقد سار بنفسه اليها على بعث اهل البصرة ممدا للنعمان بن مقرن فمر بالدينور فأقام عليها خمسة ايام قوتل منها يوما واحدا ، ثم ان أهلها اقروا بالجزية و الخراج و سألوا الامان على انفسهم و اموالهم و اولادهم فأجابهم الى ذلك ....فلم يقاتله اهلها و صالحه اهل السيروان على مثل صلح الدينور..."

دکتۆر هەمزە کاکە لە (ل١٨-٢٣)ی ماستەرنامەکەی : "دەربارەی - حلوان - لە (ل٧٦)ی (زەمەخشەری) دەگوازێتەوە: شاری (حلوان) کۆتا بەشی ڕەشە خاکی عێراقە ."هەروەها لە (ل٢٢) دەڵێت : بۆچوون هەیە، کە شاری (حلوان) لە چوارچێوەی سنووری عیراق هەژمار کراوە . لەوە زیاتر لە (ئەستەخری) و (قلقەشەندی) دەگوازێتەوە، کە بە هۆی تۆپۆگرافیای ناوچەکەوە، (حلوان) وەکو بەشێك لە هەرێمی (چیا) دادەنرێت.

بەشەکەی تری وڵاتی کوردی نێو ئیمپراتۆریەتی ساسانی، ناسراو بوو بە:(ئەقلیم جیبال) ...

## ئەقلیمی جیبال :

ئەقلیمی جیبال وەك (شەرەفخان بدلیسی) لە (ل١٢٣) ی (شەرەفنامە) قسەکەی (ئیبن حەوقەل)، (ل٣١٥) دووبارە دەکاتەوە و دەڵێت : دەڤەرەکە وڵاتێکی کەژاوییە و ئەو کەژانەش بەربەست و لەمپەرن لە بەردەم هۆزەکان ."

جیۆگرافیای (ئەقلیم جیبال)ی ئەوسا، بریتی بوو لە: ڕۆژهەڵات : (خوراسان،فارس و ئەصفەهان)، لە ڕۆژئاواش: (شەهرەزوور و عیراق و جەزیرە و ئازەربایجان)، هەروەها لە باکوور ئەقلیمی: (دێلم و جیلان و ڕۆژهەڵاتی ئازەربایجان)، لە باشووریش، بەشێك لە وڵاتی: (عیراق و خوزستان) تەماشای: (ئیبن حەوقەل،ئەبو فیدا، ئەصتەخری )بکە، وەرگیراو لە کەلسومە جەمیل ..

دکتۆر عبدالله موستەفا لە (ل٣٩)ی (أمجاد الأكراد ) دەربارەی موسڵمانبوونی شارێکی وەك: (شەهرەزوور)، دەنووسێت : "بەڵێ لە (شەهرەزوور) شەڕ قەوما، هەروەها لە باکووری (هەولێر)یش، بەڵام ئەوەی قەوما ئەمڕۆ پێیدەوترێت ڕامالین - تەمشیت".
هەروەها دکتۆر عبدالله لە هەمان لاپەڕەدا، دەربارەی هێزی هاوبەشی عەرەب و کورد لە دژی فارس، بوونی دۆڵێکە لە نزیك گوندی (زیارەت)ی خۆشناوان لە نێوان: (هەولێر و کۆیە) بە ناوی: (دۆڵی سەحابە)، کە جەستەی عەرەب و کوردی لە خۆگرتووە .

بە حوکمی ئەوەی زەردەشتیەت ئایینی ڕەسمی ئیمپراتۆریەتی ساسانی بوو، زۆر کوردی دوورە دین و مێژوو، بەبێ هەبوونی هیچ بەڵگەیەك باس لەوە دەکەن، کە (ئاڤێستا) کوردییە، ئەوانەی بە ڕاستی (ئاڤێستا)ناسن، لەوانە: (جەمال نەبەز)، ئەو ڕایە ڕەتدەکەنەوە، هەروەها بە پێی دەقی ئایەتی﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ﴾ ابراهیم:٤، چوار کورد وەك قەومێك پێغەمبەری بۆ هاتووە، بەڵام پێغەمبەرەکە و کتێبە پیرۆزەکەی بە کوردی بووە.

ئەوەی دەربارەی: (زەردەشت) و (ئاڤێستا) هاتووە، هیچ مۆرکێکی کوردانەیان پێوە نییە، ئەوەی هەیە، پێکچوونی هەندێ وشەی (ئاڤێستا)یە بە وشەی کوردی! لای زمانەوانانی ئەوروپا ساخ بۆتەوە، کە وشە پێکچوونی دوو دەق، واتای یەك زمان ناگەیەنێت، ئەوەتە زمانی نەتەوەکانی: (ئەسکەندنافیا وەك دانیمارك و نەرویج و سوید) سەدان وشەیان پێکدەچێت، کەسیش بانگەشەی یەك نەتەوەبوونی: (دانیمارکی و نەرویجی و سویدی) ناکات، بۆیە دەپرسین (ئاڤێستا) کوردییە؟؟!!

# زەردەشتیەت لە نێوان کورد و ساسانیدا

(ئەردەشێر بابەکان) وەك کۆرشی ئەخمینی، ڕوخێنەری میدیا زەردەشتی بوو، بە واتای چۆن کۆرش پاش کودەتا لە سەر (ئەستیاگ)، دوا پاشای (میدیا)، هەر تەبەنی زەردەشتیەتی کرد.

دوای ئەوەی (ئەسکەندەری مەکدۆنی) لە شەڕی (ئەربێلا - گەوگەمێلا) لە (٣٣١ی پ .م) بە سەر (دارا) زاڵ بوو، تەواوی (ئاڤێستا)ی سووتاند، یان لە هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە کراوە، کە (ئەسکەندەر) بەشێك لە (ئاوێستا) ی گواستۆتەوە، چونکە ڕەگی (ئاوێستا) لە نووسینی فەلسەفی یۆنانیەکان هاتووە.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە ئاینی ڕەسمی (میدیا) زەردەشتی بوو . دکتۆر عبدالله لە (هیرۆدۆتس) لە (ل ٢٢) دەگوازێتەوە، کە هەموو قەبائیلی فارس، کە ئەوسا شوانکارە بوون، بە دەسەڵاتی (مید)ی ڕازیبوون.

هەر دکتۆر عبدالله لە (ل١٩) ی (مێژووی ئەدەبی وڵاتی فارس) سنووری (میدیا) دەست نیشان دەکات :

باکوور : ئازەربایجان (ئەترۆپاتین ).

باشوور : خوزستان ( سوسیانا ).

ڕۆژهەڵات : زنجیرە چیای (زاگرۆس).

باکووری ڕۆژهەڵات : هەموو یا بەشێك لە (مازندەران).

جیوگرافیای (میدیا) بە قەوڵی ئەمڕۆ بریتیە لە: "ئەم سنوورەی کوردستان، لورستان، بەشی باکووری خۆزستان، بەشی ڕۆژئاوای عیراقی عەجەمی، باشووری ئازەربایجانی دەگرتەوە." بە واتای: (میدیا)ی لە کوردستان زۆر فراوانتر بووە.

کۆرشی ئینقلابچی، کە زاوای (ئەستیاگ) بوو، هەر تەبەنی زەردەشتی کرد، چونکە ئەویش هەر زەردەشتی بوو .

(بابەکی) دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانی، دووبارە بە یارمەتی (مۆغەکان)ی زەردەشتی، لەوانە: (ئیستەر) ئاوێستایەکی دی و، نووسیەوە و کردیە کتێبی ئایینی ڕەسمی دەوڵەت .

جگە لە زەردەشتیەت، مەسیحیەت و مانیەت و مەزدەکیەت لە نێو دەوڵەتی ساسانی هەبوو .

پێکهاتەی ئەقلیم جیبال دەکات، کە سێ نەتەوە بوون، بڕوانە( ئەحمەد میرزا (١٩٩٥)ل(٣٣-٣٨) ماستەرنامەکەی).

کورد دانیشتوانی سەرەکی ناوچەکە بوون،بەڵام بە دیدی من: فارس بەحوکمی داگیرکردن، لەو ناوچانە هەبوون، هەرچی بنەماڵە عەرەبەکانن، تەنیا بۆ کاری بانگەوازی هاتوون، زۆربەی ئەو ماڵباتە عەرەبیانە، لە نێو کۆمەڵگەی کوردی توانەوە .

شاری شارەزوور لە ئەقلیمی جیبال، زۆرترین شارە، کە کوردی عەلمانی قسەی لە سەر کردووە .

**بۆیە پوختەیەك دەربارەی فەتحکردنی شارەزوور و، ئەفسانەی پێستەکە لە کتێبێکی خۆم دەگوازمەوە :**

# فەتحکردنی شارەزوور و ئەفسانەی پێستەکە

## دەروازەیەك:

زۆر پرس و مەسەلە لێرەو لەوێ دەوروژێنرێن، لەمیانەیاندا ڕەخنە لە ئایین و هەژموونی کەلتوری کوردی دەگیرێ. زۆرێك لەوپرس و باسانەش هێندە بێ بنەماو بەڵگەن، کە بۆسەردەمێکی وەك ئەمڕۆ، لە (ئەفسانە) و (حەکایەتی بەرئاگردان) دەچن!

هەبوونی پێستێك، چەرمێك، کەوڵێك، کەچەند دێڕەشیعرێکی لەسەر نووسراوە و، ڕەخنە لە ڕەفتار و گوفتاری موسڵمانە بەراییەکان لە کوردستان دەگرێ، یەکێ لەوپرسانەیە،کە زیاتر لە سێ چارەگە سەدەیە (١٩٣٠-٢٠١٧) لە دەرفەتی جیاجیا بەشێك لە ڕاگەیاندنی سیکۆلاریزمی کوردی، دەیوروژێنێ!

ئەم نووسینە، هەوڵدانێکە بۆ تاوتوێکردنی ئەم بابەتە، خوێندنەوەی دەقە شیعریەکە و، شرۆڤەکردنی لەسەر چەند بنەمایەکی ئەکادیمی، وەك بنەمای زمان - زمانی شیعرەکە پەهلەوی، یان گۆران، هەورامانی!

هەروەها قسەکردن لەسەر وشەو پەیڤەکانی شیعرەکە و خوێندنەوەی ئەو پرسە لەسەر بنەماکانی گۆڕانی زمان — بنەمای ئایینی، خوێندنەوەی بۆ شەڕ و ئاکامی شەڕ و قسەکردن لەسەر مەسەلەی ئەنفال، چونکە ئەدەبیاتی بەعس و بەشێك لە ڕاگەیاندنی سیکۆلاریزمی کوردی، هەردەم لە پێکۆڵ (هەوڵ) دابوونە، بۆئەوەی نەوەی نوێ ی کوردی لە ئایین و مێژوو و نەتەوەکەی لاڕێ بکەن!

مێژوو بنەمایەكی ترە كەقسەی لەسەر كراوە. لەدەقەكەدا ناوی: (شارەزوور) هاتووە، هەروەها بانگەشەی ئەوەكراوە، كە یەكەم شەڕی موسڵمان و (كورد) لە شارەزوور بووە! لەم بەشەدا، قسە لەسەر مێژووی (شارەزوور) كراوە و، بەبەڵگە ئەوە خراوەتە ڕوو، كە ئەوسا، كورد شارێكی نەبووە بەناوی شارەزوور!!!

وێڕای ئەمانەش، چەندەها بەڵگەی تر هێنراونەتەوە بۆئەوەی مەسەلەی ئەو پارچە پێستە هەڵبوەشێتەوە، هەرلەناو خودی دەقەكەدا، چەند مەسەلەیەك هەن دەقەكە هەڵدەوەشێننەوە! ئەو هەموو باسانە، لەژێر ناونیشانی چەند سەرباسێك قسەیان لەسەر كراوە، بۆئەوەی هەم نوسینەكە شێوەیەكی ئەكادیمی وەربگرێ و، هەمیش خوێنەر لە خوێندنەوەی چێژ وەربگرێ، تەركیز(جەخت) - لەسەر مەسەلەكە بكات.

## ئەفسانەی پێستەكە:

### چیرۆكی دۆزینەوەی پێستەكە:

ئەوەندە ژێدەرو سەرچاوەیەم لەبارەی ئەو پێستە و، مێژووی نووسین و (دۆزینەوەی) لەسەرچاوەی (حوسێن حوزنی موكریانی)م كۆنتر نەدۆزییەوە، (حوسێن حوزنی موكریانی) لە ژمارە (٢١)ی گۆڤاری (زاری كرمانجی) ڕێكەوتی (٦)ی نیسانی (١٩٣٠)، لەلاپەڕە (١٩) لە كورتە وتارێك بە ناونیشانی: "سەرمایەكی گران بەهای مێژووی كوردان» سەربردەی پێستەكە ئەوها دەگێڕێتەوە: " لە عصری حەزرەتی عومەر سالی نۆزدەی هیجری، شاعیرێكی كورد لەڕووی دڵگیری و سوكایەتی كوردانەوە هەڵی بەستووە. گەڕۆكێكی ئینگلیز لە سلێمانی دەروێشێكی دی لە كوچەیەكدا ڕوونیشتووە دەوروپشتی پڕ لە ژن وەستاون. ئەویش سەری خۆی دەباتە پێشەوە تەماشا دەكا بەخەتی (پەهلەوی) كۆن لە پارچە كاغەزان دەنوسێت و دەداتە ژنەكان.
گەڕۆكەكە لەوە دادەمێنێت، كە دەروێش چۆن لەخەتی (پەهلەوی) دەگات! دەڵێ: بابە دەروێش! تۆئەم نوسراوە لە كوێ فێربووی؟

دەروێش دەڵێ: کتێبێکم هەیە لەڕووی ئەو شکڵ نویس دەکەم - پیاوەکە دەڵێ: کوانێ پێم نیشان بدە. دەروێش لەهەمبانەکەی پارچە کەوڵێك دەردەخاو دەیداتە دەست کابرا. ئەویش لێی ورد دەبێتەوە و دەبینێ ئەوە چوار شیعری کوردی بەزمانی کۆن بەخەتی (پەهلەوی)یە، دەروێش دەیکاتە نوشتە و دەیدا بە ژنان."

سەدیق بۆرەکەیی چیرۆکێکی تر لەبارەی دۆزینەوەی ئەو پارچە چەرمە دەگێڕێتەوە: "وەکو ئەڵێن: ئیبراهیم پاشای بابان (١١٩٨-١٢١٨)ی کۆچی، کەلەساڵی (١١٩٩)ی کۆچیدا، کاتێ شاری سلێمانی ئاوەدان کردەوە، لەکاتی هەڵکۆڵینی شارەکەدا کرێکارەکان پارچە چەرمێکیان دۆزیەوە، لەبەر ئەوەی نرخی ئەومیان نەئەزانی، بەپارەیەکی کەم فرۆشتیانە لاوێکی ئینگلیزی و ئەویش ئەوپارچە چەرمەی بەرەو (لەندەن) برد ، پاشان دەرکەوت کەلەوەدا پارچە هەڵبەستێك بەخەتی (پەهلەوی) نووسراوە، ئەوسا ئەو پارچە هەڵبەستەیان ناردە ڕۆژنامەی (خۆرهەڵات) بڵاویان کردەوە، لەپاشان مامۆستا حەمە تەقی بەهار (١٠٣٨-١٣٧٢)ی کۆچی بۆ دووەمین جار ئەو پارچە هەڵبەستەی لەساڵی (١٣١٦)ی هەتاوی لە گۆڤاری (مێم) دا بڵاوکردەوە. "

لە "دۆزینەوەی" ئەوپارچە پێستەدا، هەردوو سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن، کە ئەوپارچە پێستە بە گەرۆکێکی ئینگلیزی دراوە! سەرچاوەی سێ یەم، کەباسی ئەو پارچە پێستەی کردبێ، کتێبەکەی: (ڕەشید یاسمی) یە بەناوی: "مێژووی نەژاد و پەیوەستەگی کورد" ئەو کتێبەی (ڕەشید یاسمی) بەفارسی نووسراوە، هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن، کە (ڕەشید یاسمی) ئەوکتێبەی بە ڕێنمایی دەزگای (ساواك)ی ئێرانی نووسیوە.

هەندێ نووسەری کورد وەك: (عەلائەدینی سەجادی) ڕاستەوخۆ ئەو چیرۆکەی لە دەقە فارسیەکەی (ڕەشید یاسمی) وەرگرتووە، بەڵام نووسەرانی دی کورد دەقەکەیان، یان لە وەرگێڕانی کتێبەکەی (ڕەشید یاسمی) وەرگرتووە، یان لە کتێبەکەی (عەلائەدین سەجادی)!

ئامانجەکانی بڵاوکردنەوەی شیعری سەر پێستەکە: هەردەقێك، بەگوێرەی میتۆدە رەخنەییەکان زیاتر لە تەئویل و خوێندنەوەیەك هەڵدەگرێ. ئەو دەقەش چەند ئامانجێکی دیاریکراوی هەیە، بەڵام هەموو ئەوانەی قسەیان لەسەر ئەو دەقە کردووە هاوئامانج نەبوونە! لەدەستپێك دا هەوڵ دەدەین پۆلێنێك بۆ ئامانجی نووسەرانی کورد بکەین، چونکە وەکو وتمان هەموو بۆیەك مەبەست و ئامانج بەکاریان نەهێناوە. پۆلێنەکە بەپێی ئامانجەکە دادەرێژین:

**یەکەم: ناشیرنکردنی ئیسلام:** بەرای من، ئەو دەقە، (د. سعید خانی کوردستانی) بۆ (حوسێن حوزنی موکریانی) ناردووە، ئەو راستیەش هەرلەگۆڤاری (زاری کرمانجی) ئامازەی پێکراوە. هەروەها سەدیق بۆرەکەیی لەبەرگی یەکەمی (کتێبی مێژووی وێژەی کوردی)، لەلاپەرە (٣٨) دەنوسێ: "لەسەر قسەی مامۆستا دوکتۆر سعید خانی کوردستانی، نزیکەی (سەد) ساڵ لەمەو پێش پارچە چەرمێك لە ئەشکەوتی (جێشانە)ی سلێمانی دا دۆزراوەتەوە، کەچەند هۆنراوەیەکی بەزاراوەی (گۆران)ی تێدا نووسراوە، گوایە لەوسەردەمەدا، کە موسڵمانان (شارەزوور) و (دۆکان)ی دەورووبەری داگیر دەکەن، ئەم هۆنراوانە چۆنیەتیەکی ئەو دەمە دەگێرێتەوە".

هەروەها سەدیق بۆرەکەیی لە کتێبێکی دەستنووسی دا دووبارە دەنووسێ: "دوکتۆر سعید خانی کوردستانی (١٢٧٩-١٣٥٨) ی کۆچی، کە خۆی ئەم پارچە هەڵبەستەی دیوە لەپەرتوکی (نزانی) - مزرگانی دا ئەڵێ: لەم دوایەدا پارچە چەرمێك لە سلێمانی، بەختی (پەهلەوی) دۆزراوەتەوە، کە داگری چەند هۆنراوەیەکە بەشێوەی هۆنراوەکانی (بابە تاهیر) و (سان سەهاك) و (پیرنیامیش) و (پیر داود) و (پیر موسا) دارێژراوە ..."

ئەمەو، (د. جەمال نەبەز) یش دەڵێ: هۆنراوەی (هور مزگان)، یەکەم کەس، کەباسی لێوە کردووە:دوکتۆر سعید خانی کوردستانییە..".

(حوسێن حوزنی موکریانی) هەر لە رستەی یەکەمی کورتە وتارەکە دا دەنوسێ: "لە عەسری حەزرەتی عومەر لە ساڵی نۆزدەی هیجری، شاعیرێکی کورد لە رووی دڵگیری و سوکایەتی کوردانەوە .. شیعری مزرگانی هەڵبەستووە".

ئەسیری ڕۆمەکان، جارێکی تر ببێتە ئەسیری موسڵمانەکان؟

ڕاستە شەڕی (نەهاوەند) خوێناویترین شەڕ بووە دوای جەلەولا، بەڵام کوردی نێو ئیدارەی ساسانی، بە هیچ جۆرێك گوزارشتیان لە کوردبوون نەکردووە، چونکە (شا نەرسی) (٢٩٣-٣٠٣م) لە پەیکری (پەیکۆڵی)دا، تەنیا ئاماژە بە دەسەڵاتدارە فارس و پارسەکانی کوردستان دەکات.

گەر خەلیفە عومەر، کوردستانی ئازاد نەکردبا، ئێستاش من و هەزارەهای وەك (مزوری)، کۆچەری فارس دەبوو، نەك خاوەن شوناسی خۆی. دکتۆر کەمال مەزهەر (١٩٨٣) لە (ل١٠٦) لە سەر کاریگەری ئیسلام لە سەر ڕەوشی مەعریفی کوردی دەنووسێت: "باری سروشتی کوردستان و ژیانی سەختی زۆربەی دانیشتوانی و، پەرەسەندنی کۆچەری و نیمچە کۆچەری لە ناویاندا لەگەڵ چەند دیاردەیەکی تر لەو بابەتە، بوونە هۆی ئەوەی نووسین و خوێندن و خوێندەواری لە ناو کورددا، درەنگ پەیدا ببن ...وا دیارە بەهۆی ئایینی ئیسلام و پێویستییەکانییەوە خوێندن و خوێندەواری بەناو کوردا بڵاوبوونەوە. "

کوردی فەیلی (لوڕ)، کوردی شیعەن . لە باشووری کوردستان لەم شوێنانە نیشتەجێن: (جەلەولا، خانەقین، مەندلی، شەهرەبان (مقدادیە)، زڕباتیە، بەدرە و جەصان)، هەرچی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانە بە (لوڕ) ناسراون لە پارێزگاکانی: (کەرمەنشا، عیلام، خۆزستان ( ئەهواز)، شارەکانی وەك قەصر شیرین ...دەڤەری لوڕەکان بە (کوردستانی کەلهوری)) ناسراوە، دەژین. (یاقوت حەمەوی، خەسرۆ گۆران، لمیا صافی) .

لە ڕووی جیۆگرافیەوە لە (ل٣٢)ی (المسالك و الممالك) هاتووە کە: "نەهاوەند لە نێو سنووری " کور الجبل" دایە، وێڕای ئەمە " شاری: (مازندەران و مهرجان و ماە کوفە (دینەوەر) و ماە بەصرە (نەهاوەند و هەمەدان و قوم) دەگرێتەوە." زیاتر هەر یەك لە بەیات، (ل٤٠٩)، ئەبو فیدا، (ل٤١٧)، تۆمابوا، (ل٢٤) لە دیاریکردنی سنووری (هەمەدان) دەنووسن: "لە ڕۆژئاوە (دینەوەر) هەیە، لە باکوور شاری نەهاوەند، لە ڕۆژهەڵات کەرمەنشاە، لە باشووریش برجرد." (ئیدریس دۆسکی (٢٠٠٦)، (همدان من الفتح الاسلامی الی سقوطها بید المغول)، ل٤٢-٤٣) .

کەواتە: کوردی فەیلی، لە ڕووی جیوگرافیەوە، چ پەیوەندی بە( نەهاوەند) بوون و (پەهلەوی) بوونەوەیە؟!!

لە لایەکی ترەوە، (مزوری) ناوی چەند صەحابەیەك دەهێنێ، گوایە بە پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامی کوردستان دەوڵەمەند بوونە، لەوانە:

**١- زوبێری کوڕی عەووام :**

ڕاستی تەواو پێچەوانەوایە، ئەوەتە (ئیبن کەسیر) لە (ل٢٧٧) ی (البدایة و النهایة) دەنووسێت :" زوبێری کوڕی عەووام لە تیجارەتەوە ماڵەکەی پێکە وەنابوو."

**٢- معاویەی کوڕی ئەبوسفیان :**

معاویە کوڕی دەسەڵاتدار و بازرگانی مەککە بوو. (شاکر مەحمود، ب ٣ -٤، ل٦٠).

**٣- عبدالرحمانی کوڕی عەوف :**

کوڕی عەوف نەك هەر لە مەککە دەوڵەمەند بوو، کە کۆچی بۆ مەدینەش کرد هەرزوو ڕووی کردە بازرگانی، بە واتای هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە زەنگین دەوڵەمەند و بازرگان بووە. (گوڵاوی سەرمۆر).

**٤- زەیدی کوڕی سابیت و زەیدی کوڕی حاریسە تێکەڵ یەك دەکات:**

کەرەڤان ئامێدی (٢٠٠١) لە (ل١٩١-١٩٢)ی ژمارە (٢٥)ی گۆڤاری (ڤەژین) ئەو تێکەڵکردنە بە (الطامة الکبری) لە پرۆسەی تێگەیشتنی (دەقی مێژوویی) دەزانێت."

زەیدی کوڕی سابیتی ئەنصاری (١٢ پ.ك -٤٥ ك) کاتبی وەحی و موفتی مەدینە بووە، هەرچی زەیدی کوڕی حارسەیە (٣٥پ.ك -٨ ك) قورەیشی بووە. هەتا دابەزینی سورەتی (الاحزاب) ناسراو بوو بە زەیدی کوڕی موحەممەد،ئەویش لە کاتی شەڕی (نەهاوەند) زیاتر لە (١٢) ساڵ بوو، شەهید ببوو.

وەك گوتمان ناو دەرکردنی (أبو لؤلؤة) بە هۆی غافڵکوژی عومەر بووە . ئەو کوشتنەش دوور بووە لە هۆکاری (قەومی) و ( مەزهەبی)، بەڵکو هۆکارەکە پەیوەست بووە بە "بار گرانی" کۆیلەبوونی لای (مغیرة بن شعبة) و، گوایە: خەلیفە عومەر ئاوڕی لێنەدایتەوە.

کەرەڤان لە (ل٢٠٢) لە کۆمەڵە سەرچاوەیەکی وەك: (ئیبن کەسیر (ل٩٩)، ئیبن جوزی (ل٣٢٩)، دمیری (ل٥٢)) دەگوازێتەوە، خەلیفە عومەر دوای خەنجەرلێدانی لای (أبو لؤلؤة) دەڵێت : " قاتله الله لقد امرت به معروفا : (الله) لە نێوی بەرێت، چاکەم لەگەڵ کرد" ئەمەش بەڵگەیە کە عومەر لە بارەی ڕەوشی ئەو، بە (موغیرە)ی وتووە و داوای لێکردووە لەگەڵی خراپ نەبێت، سەرانەی مانگانەی لێ کەم بکاتەوە (کەرەڤان، ل٢٠٢) هەروەها لە سەر کافربوونی (أبو لؤلؤة) لە سەرەمەرگدا، طبری لە (ل٥٧٠) ی بەرگی سێیەم و ئیبن ئەسیر لە بەرگی دووەمی (ل٤٤٧) بە جیا دەڵێن: عومەر وتویەتی:" الحمدالله الذي لم يجعل منيتى بيد رجل سجد لله سجدة واحدة."

**کورتەی قسان :**

(أبو لؤلؤة)، بکوژی عومەر وەك (وەحشی) بکوژی (حەمزە) بەو غافڵکوژیە بە ناوبانگ بوو، ئەگەرنا هەردوو کۆیلە بوون. (أبو لؤلؤة) نە شیعە بوو، نەکورد، سەرچاوە کۆن و نوێی مێژووی ئیسلامی، چ سوننی، یا شیعی جەخت لە سەر فارسیبوونی دەکەن.

زمان و زێدی، تەواو ئەو گریمانەی عەبدولرەحمانی مزوری ڕەت دەکاتەوە کە فەیلیەکی نەهاوەند بێ، چونکە نە وشەی "فەیلی" لە ئێران هەیە، نە خودی "فەیلی" لە نەهاوەند هەن، ئەو، چمکی (فەیلی) و (نەهاوەندی) پێکەوەگرێدانە وەك ئەوە وایە: بڵێی: "دۆسکیەکی هەولێر !!!"

# تیرۆرکردنی
# خەلیفە عومەر و
# تەواو نەبوونی فتوحات

خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب، هەرگیز وەك پاشا و ئیمپراتۆرێك نەدەژیا، بەڵکو وەك خۆشەویست ئاسا دەژیا، ئەو جۆرە ژیانە، زۆر دەرفەتی بۆ نەیارانی دروستکرد، کە دربی لێ بووەشێنن، ئەنجام لە (٢٣/١٢/٢٦) ی کۆچی بەرانبەر (٢)ی نۆڤمبەری (٦٤٤) لە نوێژی بەیانی بە دەستی (أبو لؤلؤة فەیرۆز نەهاوەندی) کوژرا لە تۆڵەی ڕوخاندنی ئیمپراتۆریەتی ساسانی. (طبری، ب٣، ل٣٥٧).

لە پاش تیرۆری عومەر، جوگرافیای ئیسلامی دەرەوەی نیمچە دوورگەی عەرەب زۆر فراوان بوو، بەڵام ئەفسووس، بەرە بەرە فیتنە کەوتە ناو پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە .

لە مەدینە (عوسمانی کوڕی عەففان) زاوای پێغەمبەر، کرایە خەلیفەی موسڵمانان، لە بەشێك ناوچەی ئازادکراوی ساسانی، هەڵگەڕانەوە دژ بەدەسەڵاتی ئیسلامی دەستی پێکرد، بە تایبەتی لە ویلایەتە غەیرە کوردیەکان، لەوانە: (ئەرمینیا، ئازەربایجان، هەرێمی فارس نشین وەك: (سیستان، خۆراسان، مەکران...) ئەو هەموو بزاڤانە، بە سەرکوتکردن کۆتایی هات - (طبری،ل٣٥٨).

# خەلیفە عوسمان
# و
# فتوحات

پێش وەفاتی خەلیفە ئەبوبەکر، عومەری کوڕی خەتابی دیارکرد وەك خەلیفە، بەڵام پێش تیرۆرکردنی، (عومەر) کەسی دیارنەکرد و وتی: " گەر ئەبو عبێدە لە ژیاندابایە یەکسەر دەمکردە خەلیفە، چونکە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەربارەی دەیفەرموو: " ئەبوعبێدە ئەمینی ئەم ئومەتەیە _طبری ل٦٠١،ب.٣".

خەلیفە عومەر پرسەکەی هێشتەوە بۆ (شورا). هەر طبری لە (ل٦٠٤) باس لەوە دەکات، کە پیاوچاکانی ئوممەت عوسمانیان هەڵبژارد، عەلیش بێدەنگی لێکرد، هەتا پرسیاریان لێنەکرد هیچ قسەی نەکرد ."

لە سەردەمی خەلیفەدا، نەتوانرا هەرێمی: (ئەرمینیا - ئازەربایجان - ئاران) ڕزگاربکرێ، کەواتە: فەتحکردنی کەوتە زەمەنی حوکمداری خەلیفە عوسمان . بەرلەوەی باسی فەتحکردنی ناوچەکە بکەین، دەمانەوێ پێناسەیەکی کورتی شوێنەکە بکەین .

چەمکی (ئەرمینیا) و چەمکی (ئازەربایجان)، چەمکی ئەتنیکی نیین. دکتۆر ئەحمەد خەلیل (٢٠٠٧)لە (ل١٤٢) دەنووسێت: زاراوەی: (ئەرمینیا) لە توراسی ئیسلامی، هەڵگری دەلالەیەکی کارگێڕییە، کە زۆر فراوانترە لە دەلالەتی ئەتنیکیە.

کوردستان لە سەردەمی پێش ئیسلام و پاش ئیسلام، لە سەر سێ دەوڵەت

دابەشکرابوو : ((ساسانی لە ڕۆژهەڵات، ئەرمینیا لە باکوور، بێزەنتی لە ڕۆژئاوا)) ." کەواتە: وشەی (ئەرمینیا) وڵاتی (ئەرمەنستان) ناگەیەنێت، بەڵکو میرەکانی ئەرمەنی بە پاڵپشتی ڕۆم دەستیان بە سەر باکور و ڕۆژئاوای کوردستان داگرتبوو - (ل١٤٢) .

ئیبن حەوقەل لە (ل٢٨٥)ی (صورة الارض) دەنووسێت : ارمينية و الران و اذربايجان وقد جعلتها اقليما واحدا ....والذي يحيط به مما يلي المشرق فالجبال و الديلم و غربي بحر الخزر ، والذي يحيط به مما يلي المغرب حدود الارمن و اللان و شيئ من حدود الجزيرة ، والذي يحيط به من جهة الشمال فاللان و جبال القبق والذي يحيط به من الجنوب حدود العراق و شيئ من حدود الجزيرة."

**ئەبو فیدا لە (تقويم البلاد) دەنووسێت : ئەرمینیا لە سێ بەش پێکدەهات :**

١- بەشی یەکەم: (قالقیلا، خەلات، شیمشاتی) دەگرتەوە.
٢- بەشی دووەم: بریتی بوو لە: (خەرزان - جۆرجیا - تفلیس و باب اللان).
٣- بەشی سێیەم: (بەردعە - مەراغە - ڕان) دەگرێتەوە."

محسین مامل لە (ل١٥١) ماستەرنامەکەی لە (ئەلمقدسی) دەگوازێتەوە، کە ئەویش وەك (ئیبن حەوقەل) هەرسێ هەرێمی کردۆتە یەك، بەڵام ئەو ئەو هەرێمەی بە ناوی: ( الرحاب) ناوناوە، کە ئاران سێیەکی ڕووبەری ئەو هەرێمە پێکدەهێنێ.

پۆلێنی کۆن، لە سەر جیوگرافیا دانەمەزرابوو، بەڵکو لەسەر کارگێڕی دامەزرا بوو، بەپێی ئەو کارگێڕییە، کورد لە کارگێڕی (ئازەربایجان) هەبوو، هەروەها بەشێکی زۆری باکوور ناسراو بە: (زۆزان) لە کارگێڕی ئەرمەنی داندرابوو، وەك: (وان و بەدلیس و موش و ئارزنجان).

ئەو کەمینەئەرمەنیەی ئەو شارانەی باکور، کە ئەرمەن بە زەبری مەسیحیبوونی لەگەڵ ڕۆم، دەیویست لە باکوری کوردستان دایببڕێ، هەتا بیستەکانی سەدەی (بیست )،بە زەوی ئەرمەنی دەزانی.

گەر (ئیبن حەوقەل) و (ئەبو فیدا) لە ڕووی جیوگرافی و تێکچرژانی ناوچەکە، هەرسێ شوێنیان لە یەك هەرێم کۆکردۆتەوە، هەروەها (مەقدیس)یش لە ڕووی سەقا و کەشوهەوا، ناوی شوێنەکەی ناوناوە: (ڕەحاب) .

دکتۆر عەلی حسون (٢٠٠٧) لە (ل١٧) باس لەوە دەکات، کە (ئەرمەن) زۆر شاری کورد لە ڕۆژهەلات و باکوری کوردستان بۆ خۆی گلداوەتەوە، ئەوەتە سنووری مەملەکەتی ئەرمەن بریتی بوو لە: (خوی، سەلماس و یەریڤان و بەشێك لە ڤان - وان و بایەزید).

سەبارەت بە پرسی فتوحات لەو دەڤەرە، ڕای جیاواز هەیە، بەڵام جیوگرافی شوێنەکە بەرەو ئەو ڕایەمان دەبات، کە هەردوو قۆڵی: یەکەم و سێیەم، بەشداریان کردبێت لە ئازادکردنی هەرێمەکە .

**قۆڵی یەکەم:** کە لە (جەلەولا) دەستیپێکرد و لە (نەهاوەند) کۆتایی هات، لەوێشەوە: (دینەوەر و ماسبزان و هەمەدان...ئازەربایجان)- بەلازری، (١٨٢-١٩٩).

**قۆڵی دووەم:** موصڵ - بادینان - جەزیرە...+ قۆڵی سێیەم جەزیرە + ئەرمینیا - (طبری، ئیبن ئەسیر) .

بەلازری لە (ل١٩٥-١٩٦) باس لەوە دەکات، کە (حوزەیفەی یەمان) بە فەرمانی خەلیفە عومەر بووە والی ئازەربایجان، ئەوکاتە (حوزەیفە) لە نەهاوەند بوو، پاش ماوەیەك خەلیفە عومەر، حوزەیفەی لادا، (عوتبە بن فرقەند)ی لە شوێن دانا، ئەویش لە موصڵ هاتبوو، یان دەوترێ: لە (شەهرەزور) هاتبوو."

ئەو وەسفە کارگێڕیەی (بەلازری) و وەسفی جیۆگرافی (ئیبن حەوقەل) بۆ هەرێمەکە، وا پیشاندەدەن: هەرێمەکە لە دوو سێ لاوە فەتح کرابێت : (نەهاوەند و موصڵ و شەهرەزور...).

هەرچی پرسی فتوحاتە، بەلازری لە( ل١٩٧) دەنووسێت: پاش ئەوەی هاوبەشپەیداکەرەکان لە نەهاوەند شکان، ئەهلی حیجاز گەڕانەوە حیجاز و بەصرەییەکان گەڕانەوە بەصرا، حوزەیفە لە نەهاوەند لەگەڵ کوفەییەکان مایەوە و شەڕی ئازەربایجانی کرد و لە سەر (٨٠٠) هەزار درهەم، صوڵحی لەگەڵ کردن...

ئیبن ئەسیر لە (ل٤٢٩، ب.٢) دەنووسێت : یەکەم شەڕ لە نێوان (بەکیر) سەرکردەی موسڵمانان و (ئەسفندیار) فەرماندەی فارسەکان لە ئازەربایجان قەوما، لە شەڕەکەش سوپای فارس شکا و (ئەسفەندیار) ئەسیر بوو."

لە ڕیوایەتی (ئیبن ئەسیر)دا، کە (بەکیر) بەشێکی وڵاتەکەی ڕزگارکردووە و، عوتبە بن فرقەند بەشێکی تر، پاش ئەسیربوونی (ئەسفندیار)، (بەهرام فەرخزاد)، سەرکردەی دی فارس لەگەڵ عوتبە کەوتە شەڕەوە، ئەویش وەك ئەسفندیار شکا، بۆیە ملی بۆ ئاشتی دا و صوڵح کرا و ئاگری شەڕ کوژایەوە...

لە ساڵی (٢٤ك) (عوسمان) بە ڕاوێژو شورا، بووە خەلیفە، دکتۆر ئەحمەد خەلیل لە (ل١٥٩)دا دەنووسێت : خەڵکی: (ئەرمینیا - ئازەربایجان - ئاران) پاش تیرۆرکردنی خەلیفە عومەر پەشیمان بوونەوە، کە ئەو پارەی صوڵحیان لە سەر کردبوو، بدەنە خەلیفەی ئیسلامی نوێ،" بۆیە طبری، لە (ل٦١٦-٦١٧)ی (ب.٣) باسی فتوحات لەو هەرێمە لە سەردەمی خەلیفە عوسمان دەکات . لێرەدا طبری دوو ڕیوایەت دەگێڕێتەوە: یەکیان لە ساڵی (٢٤ ك) بووە، ئەویتریش لە ساڵی (٢٦ك) بووە ."

**ئەو پۆلێنە کارگێڕییە بەشێکی گەورە لە شوناسی ئەتنیکی کوردستان دابڕی، چۆن ؟**

١- ئەقلیم جیبال، هەر تەنیا ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، بەشی باشوور شوناسێکی تێکەڵاوی هەبوو، بە ناوی: (عیراقی عەجەمی - ناعەرەبی) .

٢- بەشی (زۆزان)ی باکوری کوردستان، ناونرابوو: ئەرمینیا، ئازەربایجان. کەواتە ڕوبەرێکی زۆری کوردستان لە کوردستانی گەورە دابڕا .

# کوشتنی یەزگورد
# و
# کۆتاییهاتنی ساسانی
# لە ٣١ك/ ٦٥١ی میلادی

پاش تیرۆرکردنی خەلیفە عومەر لە نوێژدا، ئازادکردنی تەواوی دەوڵەتی ساسانی کۆتایی پێ نەهات بوو، بەڵام کوردستانی رۆمی لە زەمەنی عومەر تەواو ببوو .لەم بارمیەوە (بلازری) لە (ل١٠٩)ی (فتوح البلدان) دەنووسێت : " لم يبق بالجزيرة موضع قدم الا فتح على عهد عمر بن الخطاب رضي الله عنه على يد عياض بن غنم فتح حران ، و الرها ، و الرقة ، و قرقيسيا ، و نصيبين ، و سنجار ...... لە سەردەمی عومەر لە سەر دەستی عیازی کوڕی غەنەم شوێن پێیەك لە جەزیرە نەما بوو ئازاد نەکرێت، وەك :(حەران، ڕەها، ڕەقە، قرقیسیا، نصیبین، سنجار) ."

پاش گرتن و دەمکوتکردنی فارسەکانی خۆراسان، (یەزگورد) بەرەو سنوور هەڵات و لەوێ داوای یارمەتی لە (خاقان)ی تورك و پاشای (صەغد) و ئیمپراتۆری (چین) کرد، بەڵام کەسیان، تەنیا (خاقان)ی تورك نەبێ، نەیانتوانی بە هاواریەوە بچن ! پاش ئەوەی (خاقان)ی تورکیش پشتی تێکرد، (یەزگورد) ناچار بوو ڕوو بکاتە ماڵی (مەرزبان مرو) ناسراو بە: (ماهویە)، (ماهویە)ش ئەوەی لە ئاسمان دەخواست لە ماڵی خۆی بینی.

بۆیە بە هۆی کۆنە قینی لە (یەزگورد)، لە هەولێك دەگەڕا ئەو میوانە ڕەزا قورسە لە نێو بەرێ، بۆیە هاوپەیمانی لەگەڵ (نیزك تەرخان) تابعی (مزربانی تەخارستان) کرد، (یەزگورد) توانی خۆی لە (نیزك) ڕزگار بکا و بەرەو ماڵی ئاشەوانی سەر کەناری (مەرگاپ)بچێت، و دوو شەو لەوێ مایەوە، ئاشەوانەکە لە پێناو زێڕ و گەوهەرەکانی، کوشتی و فڕێیدایە ناو ڕووبارەکەی بەر دەرگای ماڵی - (طبری، ل ٣٥٨) .

لەمەدا بەدەردەکەوێت: زۆربەی شار و شارۆچکەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە ئاشتی موسڵمان بوون، ئەوەندە شەڕەش، کە لێرە و لەوێ لەگەڵ کوردی ناو دامودەزگای ساسانی بووە، بە هیچ جۆرێك بە قەد نیوەی ئەو شەڕانە نەبوو، کە ئیسلام لەگەڵ دەسەڵاتی عەرەبی و دەشتەکی ناو نیمچە دوورگەی عەرەبی کردی.

دکتۆر عبدالله مصطفى لە (ل٤٣-٤٤)لە عبدالحمید حسێن، نوسەری کتێبی (الفتح الإسلامی فی العراق و الجزيرة) - ل١٧٧ دەگوازێتەوە: " كما سكن الكوفة اربعة الآف او خمسة الآف من الفرس الذين اسلموا و التحقوا بالجيش العربي في القادسية و بعدها و قد كان الحرب يسمونهم بالحمرا دَيلم - نسبة الى رئيسهم دَيلم-" ئەو کورد دیتنە بە فارس لە پەراوێزی هەمان کتێب - (ل١٣١) ڕوونکراوەتەوە: " كان الذين التحقوا بالجيش العربي من الجند الفارسي من الاكراد و قد كانوا ناقمين على الدولة الفارسية ، و قد سماهم العرب فيما بعد-الحمراء ."

**ئەو سەرکەوتنە بەربڵاوەی سوپای ئیسلام لە ئەو دوو بەشەی کوردستان: ( باشوور و ڕۆژهەڵات ) بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە :**

١- کۆمەڵێك لەو مرۆڤانەی ناو سوپای ئیسلام، هەڵگری خەسڵەتی موحەممەدی خۆشەویست بوون، بە واتای: لە ئەدگار و کردەوەدا، تەواو موحەممەدی بوون، مەحوی شاعیر لە وەسفی ئەو کۆمەڵە موسڵمانەی مەدینە لە (ل٤٤٠) ی دیوانەکەیدا دەڵێت :

به سـەریانا، به سەر بـاقیی صەحـابه و ئـال و یـارانـا
ببارێنێ خودا هـەر ئـان و وەقـت و سـاعه ( رضـوانه)
به نوری عەکسی پێغەمبەر ئەوەنده مونعەکیس بووبوون
غـەریبی تـازه هاتوو دەیـوت :ئەم پێغـەمبەرسـتـانه

٢- ئەو سیفات پێغەمبەرانه و ڕقی کورد له دەوڵەتی ساسانی، وەیکرد (٤-٥) هەزار کوردی (دێلم)ی هەر له شەڕی قادسیەوە (١٦)ی کۆچی بچنه پاڵ سوپای ئیسلام .

# فتـــوحـاتی
# کوردستانی ڕۆمــی یا بێزەنتی

وشەی ( ڕۆمی ) لە کەلتووری کوردیدا، وشەیەکی قێزەونـە . وشەکە لە دوو لاوە قێزەونە : لایەنی داگیرکاری و، لایەنی خودانەناسی .

(سافراستیان) لە (ل١٢)ی کتێبی: (کورد و کوردستان) دەربارەی ڕقی کورد لە ڕۆم دەنووسێت: "تا (چل) ساڵ لەمەوبەر، ناتۆرەی ڕۆمی بە هەر داگیرکەر، دەستدرێژکەر، یا کەسێك دەوترا، کە لە ناوچەکانی: (بسفۆر و ئاسیای بچووك)ەوە هاتبێ. سنووری ڕۆمی بەگشـتی، لە ڕۆژهـەڵاتی خەتی (سـامسـۆن - سیواس - کلیکیا)وە دەستی پێکرد.

چ ڕۆمەکان، چ بێزەنتییەکان، چ تورکەکان، هەموو بێ سەروبەر و جیاوازی ڕۆمی بوون . بێگومان وشەکە، لە دووتوێی خۆیدا، پڕ بوو لە سووکی و خوانەناسی و، هەرچی سیفەت و خووی خراپ هەیە، دەکەوتە سەر ئەو کەسەی بە ڕۆمی ناو دەبرا."

ئازاد دێرکی لە (المدن الكردية) و خەسرەو گۆران لە (ل١٨٨)ی: (کوردستان لە مێژوودا)، بە کوردستانی ڕۆمی دەڵێن: وڵاتی (کوردۆئین) ، جارویار بە (کوردیا) ناودەبەن . لە سەرچاوەکان کێشەیەك لە ناوی (جزیرە) هەیە، ئاخۆ مەبەست لە جزیرە، باکووری کوردستانە ؟ یا باشوور و باکووری کوردستانە؟ یا ڕۆژئاوای کوردستانە؟

## چەمکی (جزیرە) شارێك بوو، یان هەرێمێك ؟

چەمکی (جزیرە) لای نەوەی نوێ، شارێکە لە شارەکانی باکووری کوردستان. ئەو شارە زیاتر بە شاری (بۆتان) ناسراوە بۆتە شاری جەزیرەی بۆتان . ئازاد دیرکی لە (ل١٠)ی کتێبی (المدن الكردية) دەنووسێت : جەزیرەی بۆتان دەکەوێتە باشووری کوردستانی تورکیا، ئەم شوێنە شوێنی بەیەکگەیشتنی سنووری سوریا و تورکیایە لە سەر زێی (دجلە)، بۆیە پێی دەوترێ: (جزیرە)، چونکە دەکەوێتە لای ڕاستی زێی (دجلە) و لە سێ لاوە دایدەپۆشێ، شێوەی وەك (هیلال)ی لێدێ، لەو کاتەی لە بەهاران لافاو هەڵدەستێ، بە تەواوی لە ناوچەکانی دی دایدەبڕێ، لەو ناوچەیە هۆزێکی ئازا دەژین بە ناوی: (بۆت)."

لە ڕۆژئاوای کوردستانیش شارێك هەیە بە ناوی شاری (جزیرە) . بەناز (٢٠١١) لە (ل٢٩) لە (زەمەخشەری) دەگوازێتەوە، کە لای ئەو ئەقلیم (جەزیرە)، جەزیرەی شام، لە لای توێژەرە نوێیەکانیش بە جەزیرەی (فەراتی) ناسراوە ."

فەڕەنسا لە ماوەی مانەوەی لە سوریا، چوار دەوڵەتی لە سەر بنیاتی نەتەوە و مەزهەب لە سوریا دروستکرد و، لوبنانی لە شام جیاکردەوە: دەوڵەتی حەلەب، دەوڵەتی شام، دەوڵەتی دروز، دەوڵەتی عەلەوی .

بۆ ئەوەی ئینگلیزی شەریکی لە عیراق هەراسان نەکات، هیچی بۆ کورد نەکرد، بۆیە لە سوریا بەیتوبالۆری موهاجیر و کوردە عەرەبەکان و عەرەبە کوردەکان پەیدابوو - (مۆنتگۆمری ٢٠٠٩، ل٩٤ )کوردەکانی (جزیرە) هەر لە ساڵی (١٩٢٧)ەوە داوای بنیاتنانی ڕژێمێکی کوردی وەکو: (سەنجاق) و (ئەسکەندەرۆنە)یان کرد، بەڵام ڕژێمی دیمەشق بە یاریدەی فەڕەنسا بە زەبری هێز، کوردیان دەمکوتکرد - (ناوخۆش ٢٠١٥، ل٦٥).

پێش کودەتای بەعس لە سوریا،ئازاری (١٩٦٣)، عەرەبە شۆڤینیەکان هەر لە ساڵی (١٩٦١) و سەرژمێری (١٩٦٢) ناسنامەی قەومی کورد پشدێنەی ئەمنییان داهێنا، دێرك کینان لە (١٩٦١)، (ل٥١) پشدێنەی ئەمنیان قووڵتر کردەوە و کوردی بەرانبەر ئەو سیاسەتە ڕاپەڕی، بەعسیش لە (١٩٦٣)ەوە سیاسەتی

بەعەرەبکردنی جزیرەی توندتر کرد ."

پانتایی ئەو (جزیرە)ی ئێمە مەبەستمانە، لە هەردوو (جزیرە)ی باکوور و ڕۆژئاوا فراوانترە.

مەبەست لە کوردستانی ڕۆمی، کوردستانی بندەستی دیانە ڕۆمانیەکان و ئەرمەنیەکانە. ئەو کوردستانە زۆربەی باکوور و ڕۆژئاوای کوردستانی دەگرتەوە. زۆربەی کوردەکانی ئەو بەشەی کوردستان، بە پێچەوانەوەی ئەقلیم جیبال، کوردی دیان بوون . ئەو دیانبوونەش لەوانەیە بە دوو شێوە بێت:

١- کوردەکان بە خۆویستی خۆیان (دیان - کریستان) بوون.

٢- بە زۆری دیان بوون، چونکە ئایینی ڕەسمی دەوڵەتی ڕۆمی بوو .

## هەبوونی دیان لە کوردستانی باکووردا ؟

بە پێی گێڕانەوەی ئینجیل، کوردی زەردەشتی، پێش جوو، مەسیحی بوونە، بە واتای (٢٢٥) ساڵ بەر لەوەی دەوڵەتی ساسانی دابمەزرێت. لە لایەکی تریش لە ماوەی (٣٣١)ی (پ .ز) کوردستان کەوتە ژێر دەستی یۆنانی .

لەوان و ئەرمەنیەکانی باکووری کوردستان، (دیان) لە کوردستان دروست بوون. ( لە بەشی پێنجەم لە باسی شارەکانی جەزیرە و شامی کوردی تەواو ئەو دیاردە کریستانیە لەو شارە کوردیانە روون دەکەینەوە ).

کەواتە: بوونی دیان لە بەشەکانی کوردستان، پرسێکی گرینگە، گەر ئەوانە لە بنەڕەتدا کورد نەبن، چ وڵاتێك هەیە جیوگرافیەکەی ئاوای بێت؟؟!

# فتوحاتی ئیسلامی
# و
# کوردستانی بندەستی ڕۆمی و
# هێڵە سەربازییەکان

پاش گرتنی (یەرموك) و (دیمەشق) و (ئەجنادین) و (حمص)، ڕێگا خۆشبوو لەشکری ئیسلام بەرەو بەشی ڕۆژئاوای کوردستان و باکووری کوردستان بێت، کە زۆربەیان مەسیحی بوون.

ئەو داگیرکراوی و مەسیحیبوونە، هۆکار بوون، کە موسڵمان بن یا ئامادە بن، سوڵح بکەن (جزیە) بدەن لە سەر مەسیحیەت بمێنن . ڕەوشی ئێستای دیانی (ڕەها) و (هەکاری) .. پیشاندەدەن، کە لەشکری ئیسلام، کوردە دیانەکانی ئازاد کردووە لە نێوان دوو هەڵبژاردە موسڵمان دەبن، یا (جزیە) دەدەن ؟ بەلازری لە (ل١٠٩) باسی نامەی (عەیازی کوڕی غەنەم) دەکات بۆ (ئەسقفی ڕەها)، کە وتویەتی: من و موسڵمانان، خوێن و سامان و ژن و منداڵ و پیاو و دەوروبەری شاری ئێوە.. دەپارێزین، ئێوەش پردەکان و گومڕاکانتان ...ئاراستە بکەن ." هەر لە هەمان لاپەڕەدا (بەلازری) باس لەوە دەکات، کە هەموو بستە خاکێکی هەرێمی (جزیرە) لە سەردەمی عومەر پاککرایەوە .

(سیپان) لە( ل٤٤) لە (ل٣٩) (تأریخ ماردین) دەگوازێتەوە کە (واقدی) لە (فتوح الجزیرە). و الخابور لە عەیازی کوڕی غەنەم دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: " و لم یبق بلد في امر الجزیرة الا ملکناه ، و قد فتح الله تعالی ..ماردین و الرها و حران و حولها واطعنا بلاد کثیرة کدیار بکر و ما حولها و حسنکیفا و الموصل و نحوها"

محەمەد ئەمین زەکی لە (٩١-٩٢)ی (خولاصەی)... دەنووسێت : " لە دوای فەتحی تکریت و لە ساڵی (١٨)ی هیجریدا حەزرەتی (سعد بن وقاص)، لە قوماندای عیاز بن غنم دا و بەئەمری حەزرەتی عومەر - ڕەزای خوای لێ بێ- بۆ فەتحی جزیرە...مەقصەدی حەزرەتی عومەر لەم حەرەکەتە : هەم فەتحی جزیرە و هەم مەنعی کۆمەکی رۆم لە جزیرەوە بۆ سوریە بوو ..

عیاز چووە سەر ئۆرفە و لە دوای فەتحی، هات (نصێبین)ی گرت و ڕووی کردە شیمال بۆ تەڕەفی: (ماردین و دیاربەکر و ئەرمەنیە) ."

سیپان لە (ل٤٥) لە (الواقدی) و (بەلازری) و (ئیبن فەقیە) و (طبری) دەگوازێتەوە، کە تەواوی ناوچەکانی هەرێمی جزیرە لە سەر دەستی عیازی کوڕی غەنەم بووە و زۆربەی ناوچەکان بە سوڵح فەتح کراون هەروەها طبری لە (٥٤) دەربارەی هەرێمی (جەزیرە) دەڵێت : (اسهل البلدان امرا، و ایسره فتحا)..... پرسی جزیرە لە هەموو وڵاتان ئاسانتر بوو، فەتحەکەشی هەر ئاسان بوو.

کوردی باکوور و ئەرمینیا، لە چاو کوردی ساسانی ئاسانتر موسڵمان بوون، لە بەرانبەر ئەو زوو موسڵمانبوونەش، پەیوەست بوو بە گریمانی ئەم توێژینەوەیە، کە لە کوردستانی ڕۆمیدا، مەسیحیەت هەژموونێکی بەرهەمداری هەبوو، چونکە وەك قورئان ئاماژە بەوە دەکات، نەصرا - مەسیحی زۆر نزیك بوونە لە ئیسلام، لەم بارەیەوە

دکتۆر فرسەت مەرعی لە (ل١٧١) ی (الکورد مصادر او معالم تأریخیة في صدر الاسلام) نموونەیەك بە موسڵمانبوونی خەڵکی (حسنکیفا) دەهێنێتەوە "، کە نەك خەڵکی (حسنکیفا) هەر زوو موسڵمان بوون، بەڵکو سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەکەش بوونە ئاراستەکەر و بەڕێوەبردنی کارگێڕی ناوچەکە ."

# فەتحی کوردستانی ئەرمینی
# یان
# ویلایەتی: ئەرمینیا - ئازەربایجان - ئاران

وەك لە پێشەوە گوتمان: ناوی (ئەرمینیا - ئازەربایجانی کۆن) ناوی ئەتنیکی نین، بەڵکو ناوی کارگێڕین، هەروەها باسمان لەوە کرد، کە لەشکری ئیسلام هەم لە نەهاوەند ( هێڵی کوردستانی ساسانی )، هەروەها لە قۆڵی شام و ئەوبەڕی باکوور هەرێمی (ئەرمینیا - ئازەربایجان)یان فەتحکرد.

لە قۆڵی نەهاوەندەوە،لە سەرەتادا موسڵمانەکان بەرەو ئازەربایجان پێشڕەوی عەسکەریان نەکرد، بەڵکو صوڵحیان کرد. لەوبارەیەوە طبری لە (ل٦١٦-٦١٧،ب.٣) ی (تاریخ الملوك ...) دەنووسێت: وەلیدی کوڕی عەقبە پاش شەڕی نەهاوەند لە ساڵی (٢٢ك) لە سەر (هەشت سەد) هەزار درهەم صوڵحی لەگەڵ خەڵکی ئازەربایجان کرد،بەڵام پاش تیرۆرکردنی خەلیفە عومەر، دەسەڵاتی ئازەری لەو صوڵحە پەشیمان بوونەوە،...

هەمان سەرکردەی ئیسلامی ناچاربوو لە (٢٤-٢٦ك) لە سەردەمی خەلیفە عوسمان، غەزووی ئازەربایجان و ئەرمینیا بکات.

کەواتە ناوەکانی سەردەمی ئیسلامی (ئەرمینیا-ئازەربایجان) هەمان شوناسی قەومی ئەو دوو وڵاتەی ئەمڕۆ نیین.

ئیبن حەوقەل (ل٢٨٥-٣٠٣) بە (٢٣) خاڵ باسی ئەو ئەقلیمە دەکات . ئەوەی لێرەدا گرینگە، باکووری ناوچەکەیە، کە بریتین لە چیای: (قەبەق و قەوقاز - قەپقاس)و هەرێمی ئاران و شارەکانیەتی وەك: (تەورێز، مراغە، خوی، ورمیێ، ئەردەبیل - دوین -، شنۆ، سەلماس .....). ئیبن حەوقەل لە (ل٢٨٥)

دەڵێت: " و الذي به ارمينية و الران و اذربايجان ، و قد جعلتها اقليما واحدا لانها مملكة انسان واحد فيما شاهدته سائر عمري ....".

مینۆرسکی لە (ل١٥)ی (الاكراد) ئاماژە بەوە دەکات، کە کورد لە کۆنەوە ئەو دەڤەرەی کردۆتە نیشتیمانی خۆی و هەردەم زۆرینە بووە."

(میرنشینی ڕەوادی لە دەوروبەری (٣٣٧-٤٦٣) فەرمانڕەوایی (مراغە و تەورێز و ئەردەبیل و ورمێ و خوی و سەلماسی کردووە). هەرچی ئەرمەنیی و ئازەرەکانن، هەر بە چاوی ئەتنیکی تەماشای هەرێمەکەیان کردووە .

د.فەرهاد پیربال لە وتارێکی نێو کتێبی: (زێڕی ناو زبڵ)دا بە ناوی: (بزووتنەوەی کورد لە تۆماری ئەرمەنییەکان) باس لەوە دەکات، کە بوونی کورد لە باکووری کوردستان بە "غەوارە" دەزانن، کەچی زۆر پێش ئیسلامیش، کورد لەو دەڤەرەدا، هەر زۆرینەی ڕەها بووە .

وەسفی حەسەن (٢٠١٥) لە (ل١٨)ی ڕۆژنامەی (باس)، ئاماژە بە (١٥) شار و شارۆچکەی هەرێمی (ئاران) دەکات، وەك: (باکۆ، قەرەباغ، نەخچەوان .....)" کەچی لە سەردەمی ئێستادا ئەو شارانە بە (ئەرمەنی)، یا (ئازەری) کراون !

## فتوحاتی ئیسلامی کوردستانی ڕۆمی :

وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بەوەدا، کە جۆری دین، گرینگی هەبووە لە سەر چارەنووسی هەرێمەکە . ئەو شارانەی تەواو زەردەشتی بوونە، درەنگ تر موسڵمان بوونە، شاری: (مەدائین و جەلەولا و نەهاوەند) بەشاهێدی: (واقدی و طبری و ئیبن ئەسیر و بەلازری) لەو شارانە بوونە، کە گەورەترین شەڕیان تێدا کراوە .

کەچی زۆربەی شارەکانی کوردستانی ڕۆمی مەسیحی بوون، هەرێمی ئەو مەسیحییە کوردانە، بە صوڵح و ئاشتی و جزیەدان فەتحکراون . سەرچاوەکانی دژ بە فتوحات بەرانبەر ئەو زوو موسڵمان و تەسلیمبوونە، هیچیان بۆ نەماوەتەوە،

تەنیا دانان نەبێ، بۆیە پرسی کوردستانی ڕۆمی، هێندە ناوروژێنن .

دکتۆر زرار صدیق لە زۆر لاپەڕەی کتێبی: (کورد و کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا)، فتوحات بە داگیرکردن ناودەبات، کەچی لە (ل٢٠-٢١) ی هەمان کتێب دا، گرتنی کوردستانی ڕۆمی، بە صوڵح و ئاشتی ناودەبات : "زۆربەی شار و باژێرەکانی هەرێمی (جەزیرە) بە ڕێککەوتن و بە شێوەیەکی ئاشتیانە و بەبێ شەڕ و بەرگری خۆیان دابەدەستەوە .."

لە (ل١٣٠-١٣١) ی (تاریخ خلیفة) و (ل١٧٩)ی (فتوح البلدان) دەگوازێتەوە، کە "عیاض لە ساڵانی: (١٨-٢٠ك/٦٣٩-٦٤١ز) شیا بە ساناهی و بێ شەڕ و لێکدانی قورس شار و باژێرەکانی: (شنگار، نەصیبین، میافارقین، ماردین، تورعابدین، قردی - جەزیرەی بۆتان، بازبدی - گوندی بازفتێ، ئامەد، بەدلیس، ئەرزن، خەلات، دەڤەری زوزان، تا ناوجەرگەی خاکی ئەرمینیا) بگرێت، پاش ئەوەی دانیشتوانی هەریەك لەم شوێنانە دوای سوکە بەرگریەك، خۆیان ڕادەستکرد و رازیبوون ساڵانە باجی سەرانە بدەنە عەرەبەکان، بەو مەرجەی ئەوانیش مڵك وماڵ و سامانیان بپارێزن و کاری کوشتن و بڕین و تاڵانی ئەنجام نەدەن .."

لە (طبری) و (ئیبن ئەسیر) و (بەلازری) باسی ئەوە هاتووە، کە (عیاز بن غنم) لە هەر شارێك، ڕێککەوتنێکی صوڵحی لەگەڵ خەڵکەکەی بەجێهێشتووە."

ئەو تێکەڵبوونەی کورد لەگەڵ ئیسلام، جارێکی تر "میدیا" یەکەی بەبۆیەی ئیسلامی بۆ گەڕاندەوە. ڕۆژهەڵاتناسەکان بۆ ئەوەی ئەو پرسە تاریك و لێڵ بکەن، کوردیان وەك بەشێك لە وڵاتی ساسانی و ( هەتا ساسانی ) ڕۆمی شوبهاندوە، زۆر سیکیولەری مارکسی و ناسیۆنالیستی کورد، بۆ ئەوەی شوێنی خۆیان لە کۆمەڵگای کوردی بکەنەوە، وروژاندنی گومانەکانی ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسەکانیان کردە ستراتیژیەتی بانگەشەکانی خۆیان !

لەو بەشەی دادێ، باسی شاری کوردی سەردەمی فتوحات دەکەین و دەپرسین: ئاخۆ ئەو شارانە بە ناوی کوردی بوونە، هەتا موسڵمانە عەرەبەکان بە عەرەبیانکردبێت ؟!

# ئایینداری کورد
# لە هەردوو کوردستان دا

بە پێی دەقی قورئان، هەر (٢٣) پێغەمبەری نێوان ( ئادەم ) و ( خۆشەویست) پێغەمبەری قەوم و لۆکالی بوون، هەروەها خودی پەیامە ئاسمانیەکەش بە زمانی قەومەکە بووە، ئەو دیاردە ئایندارییە، وەیکردووە خودی دینداریش پەیوەست بێ بە قەومی خۆیەوە .

زمانیش هەڵگری کەلتووری قەومە، بۆیە قەوم لە مێژووی نەتەوەکاندا تایبەتمەندیەکی بە نەتەوە داوە، بۆ نموونە: پاش دەربازبوونی (موسا) و قەومەکەی لە دەریای نیل، کەسانێکیان بینی ( بت ) دەپەرستن، بۆیە پیاوەکانی دەوری (موسا) داوایانکرد، کە (موسا) خوداوەندێك بۆ ئەوان دروست بکا، چونکە ئەو قەومە بتپەرستە لە دەرەوەی قەومی (موسا) بوو، (موسا) بانگەوازی نەکردن بۆ دینەکەی خۆی-تەورات، بە واتای چۆن (تەوڕات) تایبەت بوو بە بەنی ئیسرائیل، بە هەمان شێوەش (ئینجیل) تەواوکەری (تەوڕات) بوو بۆ بەنی ئیسرائیل.

گریمان (ئاڤێستا) تایبەت بوو بە کورد، ئەدی فارس و پاکستانی و ئەفغانی لە نێو (ئاڤێستا) چ دەکەن ؟! ئاڤێستاناسەکان هەتا ڕێبەری ڕۆحی زەردەشتییەکان ( ئەنداز حەوڕێزی )نەیتوانی بانگەشەی قەومیبوونی (ئاڤێستا) بکات ! زۆری تر پێش (حەوڕێزی) نەیانتوانیوە بانگەشەی کوردیبوونی (ئاڤێستا) بکەن. گەر بزانین دوای ئینقلابی کۆرشی ئەخمینی لە سەر (میدیا) هەمان زەردەشتیزمی میدیەکانی کردە دینی دەوڵەت .... پاش زیاتر لە (شەش) سەدە ساسانیەکان، زەردەشتیان کردە دینی ڕەسمی دەوڵەت !

کەواتە: جۆری دووەمی زەردەشتیەت وەك دینی دەوڵەت بە سەر کورد سەپێندرا!

بزربوونی گوتاری کوردی زەردەشتیزمی یەکەم، لە نێو کەلتووری فارسی دا، جۆرێکی تر بوو لە زەوتکردن، چونکە زەردەشتیەتی داگیرکاری بوو لە ڕێگای فارسەوە، بە فارسەکانی: پاکستان و ئەفغانستان گەیشت .

شوناسی دینی و قەومی کورد لە ئینقلابی (کۆرش) دزران، گەرنا شوێنی لەدایکبوونی زەردەشت (ورمێ ) گوزارشت لە کوردیبوونی زەردەشت دەکات .

کەلتووری ئەو زەردەشتیە ئاسمانیە، هیچ ئامادەگی لە نێو کورد نییە، بەڵکو ئەوەی هەیە زەردەشتی ساسانیە، چونکە زیاتر لە چوار سەدە لە کوردستان وەك دینی ڕەسمی دەوڵەت مایەوە . ئەو دیاردە لە دینی مەسیحیش هەیە، پێش مەسیحیبوونی قوستەنتین، مەسیحیەتێکی دوور لە عەقیدەی سێینە هەبوو، بەڵام پاش ئەوەی قوستەنتین مەسیحیەتی کردە دینی ڕەسمی دەوڵەت، لەوساوە ئەو مەسیحیەتە لە کۆمەڵگا حزوری هەیە، نەك ئەوەی ئاسمانی !

ئێمە کە باس لە دوو کوردستان: ( کوردستانی زەردەشتی و کوردستانی مەسیحی بە پێوەری دینداری ) دەکەین، باسی دوو قۆناغی دینداری کورد دەکەین :

١- قۆناغی دینداری دینی قەومیەت.

٢- قۆناغی دینداری دینی دەوڵەت، یا دینی هاوسێ .

وەك گوتمان لە (٥٤٩)ی پێش میلادەوە، کورد شوناسی قەوم-ی و ئاینداری قەوم-ی خۆی لە دەست داوە . ئەوەی هەیە بەرماوەی دینی دەوڵەت بووە . ئەو دینەی دەوڵەت نیگەرانی رۆحی لای تاکی کورد دروستکردووە، چونکە لە بۆشاییەکی دینی ژیاوە .

(فیلیپ گرینبۆرك) (٢٠٠٨)لە (ل ١٣٠) ی (کولتوور و ناسنامەی کورد) ئەو ڕاستیەمان بۆ تۆمار دەکات : "بە هەر حاڵ هیچ بەڵگەیەکی نووسراو

سەبارەت بە وردەکارییەکانی ژیان و کولتووری کورد، تا سەردەمی ئیسلام - کە دەورەیەکی دوو هەزار ساڵەیە - لە دەست نییە.

کەوابوو: هەر چەشنە هەوڵێك بۆ تاوتوێکردنی لایەنە مێژووییەکانی ئایین لە کوردستان دەبێ بە گوێرەی زانیارییەکانی ئایینەکانی ناوچەکانی دەوروبەری کوردستان ئەنجامبدرێ ."

وڵاتەکەی هەر لە سەردەمی ئەشکانییەکانەوە ( ١٤٧ پ .م -٢٢٤ ) بووە دوو وڵاتی دین جودا . لە تەرەفی (ئەشکانی) سروشت پەرست و، لە تەرەفی رۆمیش، هەتا مەسیحیبوونی رۆمەکان، بت پەرستی بوون بووە .هەر (گرینبۆرك) لە (ل١٣٠-١٣١) باس لە ڕەگەکانی ئایینی هیندۆئەورووپیەکان لە کوردستان دەکات، کە مەبەست لێی ستایشکردنی توخمەکانی سروشت وەك: ئاو و ئاگر بوو ."

هەر ئەمەش وەیکرد شارەکانی کوردستانی ساسانی، ئەدگاری زەردەشتی وەربگرێ و کوردستانی ڕۆمی شێوەی مەسیحیبوون وەربگرێ. شاکر مستەفا (١٩٨٩) لە (ل٣٠٧)ی (المدن فی الاسلام) دەنووسێت : "في فارس و الجبال و خراسان و غيرها فقد كان المجوس هم الاكثرية الساحقه - لە وڵاتی فارس و ئەقلیم جیبال و خوراسان، ئاگرپەرستی زۆربەی زۆر بوو." هەروەها لە (٣٠٨) لە مەقدیسی (ل٣٩٤) دەگوازێتەوە، کە لە ئەقلیمی جیبال دا ( جوو ) لە نەصارا - مەسیحی و مەجووس زیاتر بوون ...کەچی لە (جەزیرە) دا هیچ (مەجووس) و (صابیئی) لە (ڕەها) و (حەران) نەبوون - (مەقدیسی، ل١٤٢ ).

هەر شاکر مستەفا لە (ل٣٠٩-٣١٠) دەڵێت : شارێکی وەك (کرمان) لە زەمەنی عومەرەوە هەتا تەواوی ماوەی (ئەمەوی) هەر لە سەر مەجوسیەتی خۆی مایەوە، هەتا سەردەمی عەباسی. لە شاری حەلوان کوردستانی ساسانی و شاری ڕەهای رۆمیش خەلیفەی ئەمەوی کەنیسەی نوێژەن و دروستکردووە.

ئەو دوو ڕەوشە ئایندارییە، هەتا ئێستاش بوونی هەیە بە جۆرێك لە کوردستانی ساسانی دا، ڕەگی زەردەشتی لە هەندێ شوێنی وەك: (هەورامان و

سنه و کرمانشاه..).هەر بمێنێت، لە کوردستانی ڕۆمیش دیاردەی مەسیحی لە: (هەکاری و ڕەها و حەران و بادینان ...) هەر بمێنێت.

ئەو دینداریەی زەردەشتی و مەسیحیەی کورد لە سەلیقەوە دروستنەبووە، چونکە بەرهەمی خۆرسکی دینی قەومیەت نەبووە، دینی هەژمووندارى داگیرکەر بووە.
هەر لەم ڕوانگەوە، (تۆمابوا، ل١٢٧) و (گرینبۆرك، ل١٣٢) بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە دینداری لە گوندی کوردی بە سەلیقە نییە، بەڵکو ڕەگی ئایینە کۆنەکانی تێدایە، وەك دیاردەی: چوونە سەر قەبران بۆ موتفەرك و منداڵ، بیروباوەڕی خورافی، نوشتەکاری، سروتی جادوویی. " ئەو هەموو سروتە دینیە، دوور و نزیك پەیوەندی بە ئیسلامەوە نییە ..

لە سەردەمی ئاشنابوونی کورد بە ئیسلام، پێنج کوردستانی سنوور جیاوازی وەك ئێستا نەبوو، بەڵکو هەر پێنج کوردستان هەبوو، بەڵام لە سنووری قەڵەمڕەوی دوو ئیمپراتۆریەت و مەملەکەتی (ئەرمەنی) دابوون، ئەویش: ئیمپڕاتۆریەتی ساسانی و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمی و دەسەڵاتی ئەرمەنی بوون .

زۆربەی گەڕیدە و وڵاتناس و مێژوونووسی موسڵمان، باسی هەبوونی (کورد) یان لەو هەرێمانە کردووە، کەچی هەندێکی تر، کورد بە کۆچەری فارس تێدەگەن.

ژیان لە شار لە دوای کەوتنی (میدیا) دژوار بوو . ئەو کوردەی لە شار مایەوە، دەبوو ببێتە بەشێك لە کەلتووری فارسی، هەروەها لە دامودەزگای ساسانی کار بکات، ئەوەی ڕازیش نەبوو، دەبوو لە نێو کەژوو کێوی سەخت ژیان بگوزەرێنێت، بۆیە (ئیبن ئەسیر) بە کۆچەری (فارس) ناویان دەبات .

لە لایەکی دی هەر لە هەرێمی (فارس) چەندەها زۆم-هۆبەی کوردی هەبوون، ڕەنگە ئەوانەش ئەو کوردانە بووبن، کە دەیانەوێ دوور بن لە دۆزی کوردی، وەك چۆن ئێستا کورد لە بەغدا و دیمەشق و تاران و ئەستەمبۆل هەیە.
یاقوت حەمەوی لە (ل٧١) ی (معجم البلدان) باسی جۆرەماڵێکی دی کورد دەکات، کە لە وڵاتی فارس بووە، ئەویش ناسراوە بە: زۆم - هۆبە گەڕیدە و جیوگرافیناسانی پێشوو، وەك: (ئیبن حەوقەل) و (مەقدیسی) باس لە پێنج

زومی کورد دەکەن لە وڵاتی فارس .

هەژار موکریانی (١٩٧١)، (ل١٢١) لە (ئیستەخر) دەگوازێتەوە، کە (٣٣) تیرە و بەرەبابی کوردی لە دەڤەری (فارس) ژیاون .لەولاوەش کوردی ڕەوەند هەن، کە زۆربە مەڕدارن، ئەوانەش لە پێناو بزن و مەڕەکانیان، کوێستان و گەرمیان دەکەن.

ئەوەی فارس و کوردی کۆدەکردەوە، دین هاوبەشی بوو، چونکە زەردەشتیەت، ئایینی زۆربەی کورد و فارس بوو .

تۆمابوا (٢٠١٠) لە (ل٣٨-٤٠) ی کتێبی (الکرد) باسی شوێنی نیشتەجێبوونی کورد دەکات، کە پێیان دەگوترێ: (کۆن ) بە کرمانجی، (ڕەشماڵ) بە سۆرانی، ئەو ڕەوەندی و کۆچەرییەی کورد، تا ڕادەیەکی زۆر لە خێمەی عەرەبی جودایە، ناو ڕەشماڵەی کورد، ناوەوەی بە لباد، یا دوگرد داپۆشراوە . گوند، یا لادێ، خانەماڵی مانەوەی کوردە، کە تابلێی بەراییە."

ئەو وەسفەی (تۆمابوا) بۆ ڕەوشی ماڵی کوردی، تەواو دەلالەت لەوە دەکات، کە کورد لە سەردەمی ساسانیدا، زەردەشتی بە سەلیقە وەرنەگرتووە، بەڵکو بەسەری سەپێندراوە !

ئیسماعیل بێشکچی لە (ل٢٣٠) (ڕژێم لە ئەنادۆلی شەرقی) دەنووسێت: ((کۆچەریی، کۆمەڵگەیەکە بە خانوبەرەی جێگیر نەبەستراوەتەوە، هەمیشە بەدوای مێگەل و لەوەڕاندنە لە دەشتەوە بۆ زۆزان بە پێچەوانەش....)).

ئەو کۆچەری و هۆزگەلیەی کورد، دەگەڕێتەوە بۆ ڕەوشی داگیرکراوی، (تۆمابوا) لە بەرایی (ل١٩ی) (الکرد) باس لەوە دەکات، کە لە کوردستان شار کەم هەیە.

هەرکە ڕۆشنبیری کورد لە نێو ئیسلام توایەوە، مرۆی بە جەرگی وەك: (ئیبن خەلەکان و ئیبن صلاح شارەزووری .....مەلای گەورە و خاڵ و نورسی و عبدالکریم مودەریسی، لێهەڵکەوت .

**لە کۆتایی پرۆسەی فتوحاتدا، باسی ڕەوشی زۆربەی شارەکان کراوە، کە بە صوڵح و جزیەدان و مانەوە لە سەر دینی خۆیان کراوە، لێرەدا دوو قسە لە سەر ئەم حاڵەتە دەکەم:**

١- ئامانجی (فتوحات) بریتی بووە لە: ناساندنی زاتی (الله) بە دینەکانی تر، نەك تواندنەوەی و سڕینەوەی دینەکانی تر .دکتۆر (زیگرید هونکی) لە (ل٤٧-٤٨)ی (الله لیس کما تروجون) دەڵێت : "دەقی: (لا اکراه فی الدین) ئامانجی فتوحاتی ئیسلامی دەخاتەڕوو، کە بریتیە لە: بڵاوکردنەوەی چەمکی وشەی (الله)، نەك بڵاوکردنەوەی عەقیدەی ئیسلامی، بەمەش مەسیحی لە سەر مەسیحیاتی خۆیان مانەوە، یەهودی لە سەر یەهودیاتی خۆیان مانەوە، بەبێ ئەوەی هیچ کەس لەمپەریان بۆ دروست بکەن .." ئەو ئازادیە عەقیدەییە، تەواو لە پرسی ئازادکردنی شارەکانی کوردستان دیارە .

٢- لە کتێبی: (کورد لە نێوان بە ئیسلام کردن و ئیسلام بوون دا....)(٢٠٠٣) و کتێبی: (خوێندنەوەی پراگماتیکی قورئان) (٢٠١٥)بە درێژی قسەم لە سەر (جزیە)دان لە پێناو بەرگری و مانەوە لە سەر دینی خۆیان کردووە . دکتۆر ئەحمەد میرزا لە (ل١٧-١٨)ی توێژینەوەکەی: (انتشار الاسلام في كوردستان ) باس لەوە دەکات: لە هەموو مێژووی ئیسلامی، (جزیە) لە چوار دیناری ساڵانە زیاتر نەبووە، بەڵکو لە نێوان: دینارەك و دوو دینار بووە." بۆ ڕاستی دیتنەکەشی، قسەی هەندێ مێژوونووس و نووسەری ڕۆژئاوا دەهێنێت، لەوانە :

١- مێژوونووسی جولەکە: (بنیامین) لە گەشتی بنیامین...دەڵێت : "جولەکە لە هەموو وڵاتانی ئیسلامی، تەنیا یەك دیناریان داوە."

٢- (تۆماس ئەرنۆلد) لە کتێبی: (الدعوة الى الاسلام) دەڵێت: "مەبەست لە سەپاندنی باج بە سەر مەسیحیەکان، بە هیچ جۆرێك مەبەست لە سزا نەبووە بەرانبەر موسڵمان نەبوون، بەڵکو مەبەست لێی پاراستنی ئەمنی ئەهلی زیمە بوو.

٣- (ویل دیورانت) لە (قصةالحضارة) دەڵێت : "ئەوانەی خوارەوە لەو باجەدا دەبوران (باجیان نەدەدا) :

- ڕەبەن، پیاوی ئاینی، ئافرەت،نێرەی نابالَغ بوو،کۆیلە، پیرەمێرد، پەککەوتە ....نەبوو - نەدار ..".

ئێستاش پاش نزیکەی (١٤٠٠)ساڵ دیان و جوولەکەیەکی زۆر لە کوردستان ماون، بێئەوەی ڕۆژێك لە سەر دینی خۆیان سزا درابن.

## درۆی تەعریبی ئیسلامی :

پاش تێوەگلانی سوپای ئیسلام بە خاکی کوردانەوە لە عێراقی عەرەبی، هەتا وڵاتی کوردان، لە کارگێڕی (ئەرمینیا-ئازەربایجان)، چەند ماڵباتێکی صەحابەکان، بۆ تێگەیاندنی کورد لە پرانسیپەکانی ئیسلام هاتنە وڵاتی کوردان.

طبری و ئیبن ئەسیر و هتد، ئاماژە بەوە دەکەن: ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب زانایەکی ئایینی لەگەڵ ئەم سوپایە ڕەواندەکردووە، هەروەها کوردی موسڵمان بە فەرمانی خەلیفە عومەر کراونەتە والی زۆربەی شارە کوردیەکان.

(بلازر)یش ئاماژە بە هەناردنی چەند بنەماڵەیەکی عەرەبی چەکدارەکان دەکات بۆ موصڵ. ڕێژەی ئەو چەند بنەماڵە عەرەبە بۆ شارە کوردی و فارسیەکان نێردران، هێندە بە ژمارە کەم بوون، زۆربەیان لەناو کۆمەڵگای کوردی توانەوە.

بەڵگە بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە، کە ئەو موسڵمانە عەرەبانە بۆ هەموو بەشەکانی وڵاتی کوردان بوو، خێرە تەعریب لە کوردستانی: باکوور و ڕۆژهەڵات و ئەرمینیا و رۆژئاوا نییە، تەنیا لە باشووری کوردستان هەیە؟؟!!

**لێرەدا ئاماژە تەنیا بە دوو سەرچاوەی نا -ئیسلامی دەکەین، کە تەواوتر درۆیەکە دەردەخەن:**

**١- سەفەرەکەی گەڕیدە (جاکسۆن) بۆ باشووری کوردستان:**

ئەو ئاشنابوونەی کورد بە ئیسلام، لە چلەکانی سەدەی حەوتەمی میلادی بووە، گەڕیدە (جاکسۆن) لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم بە دروستی لە تەمووزی (١٧٩٧) بە گەشتێك هاتۆتە باشووری کوردستان. لە (ل٦٥-٦٦) دا باس لە شارۆچکەی (پردێ) نزیك کەرکوك دەکات بەوەی، کە خەڵکی شارەکە هەموو لە ڕەچەڵەکی کوردن." قامووسی ئەعلامی عوسمانیش، باس لەوە دەکات: زۆربەی دانیشتوانی کەرکوك کوردن . هەر (جاکسۆن) لە (ل٧١)یش باسی شاری مووسڵ لە تەموزی (١٧٩٧) ئاوا دەکا :" لە شاری موسڵ، چەندین ئایین بەدی دەکرێ، زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن."

ئەرێ تەعریب لە کوێیە؟؟!!!

**٢- الموصل فی القرن التاسع عشر لە نووسینی: (الاب سهیل قاشا):**

لە (ل١٣) دا (قاشا) دەنووسێت : "سجل عام (١١٩١/١٧٧١ هـ) بداية جديدة في تأريخ الموصل السياسي ، فقد وافق الباب العالي ، و لأول مرة منذ استلام الجليليون السلطة فيها عام (١١٣٩/١٧٢٦هـ) على الحاق ولاية الموصل بولاية بغداد (ال الجليلي ) قدم جدها الاعلى ملكو - عبدالملك- من حضن كيفا بتركيا وكان مسيحيا نسطوريا."

هەروەها قاشا لە (ل١٦٤) لە (ل٣٨) بکنغهام دەگوازێتەوە : يؤلف المسلمون القسم الرئيس من سكان الموصل و هم نسب متساوية من العرب و الأتراك و الاكراد ."

هەروەها لە (ل١٦٨) دەنوسێت : " و قد بنى النساطرة لهم كنيسة جديدة و كذلك فعل اليعاقبة و هاتان الكنيستان جميلتان و خاصة كنيسة النساطرة التي لها مثيل في جميع بلدان الشرق."

ئەرێ تەعریب لە کوێیە؟؟!!

# شاربوون و شاری کوردی
# لە سەردەمی فتوحات

## چەمکی شـــاربوون:

شاربوون، بەشێکی سەرەکی لە کۆمەڵناسی شاربوون دادەگرێت، بەڵام ئەو زانستە کۆمەڵایەتییە، هۆکار نییە لە سەر دروستبوونی شار، بەڵکو کاردەکات لە سەر پەیوەندییە جڤاکیەکان و غەمە جڤاکیەکانی تاك و کۆمەڵ.

شاربوون، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیە، چەندەها هۆکاری: سروشتی، جیوگرافی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری، هەتا هۆکاری دینی لە کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکان لەوانە: کۆمەڵگای کوردی دەوریان هەیە لە دروستبوونیدا.
(سجۆریگ) (١٩٦٠) دەڵێت: کۆمەڵگا بە سێ قۆناغ تێپەڕیوە :

١- قۆناغی بەر لە کشتوکاڵ.

٢- قۆناغی تەقلیدی.

٣- قۆناغی شاربوون و پیشەسازی.

(مارکسیەکان بەو پۆلێنەی (سجۆریگ) ڕازی نین، بەڵکو قسە لە سەر قۆناغی دوای شاربوونیش دەکەن، وەك قۆناغی (سۆشیالیستی)، کەچی حوکمڕانی شیوعی خاوەنی بیرۆکەی قۆناغی سۆشیالیستی، هەر بە (حەفتا)ساڵ حوکمڕانی ئەو بیرۆکەیان کۆرکردەوە.)

لای (ئیبن خەلدون)، دوو ئەدگار دەوری سەرەکیان هەیە لە دیارکردنی شوناسێکی کۆمەڵایەتی، ئەویش :

١- کۆچەری.
٢- عەمرانیە .

لە پرسی نەتەوەی کۆچەری ( وەك قۆناغێکی کۆمەڵایەتی ) ناوی عەرەب و کورد و تورك دەبات، ڕێژەی بەدەوی بوونی عەرەب لەو قۆناغە کۆمەڵایەتییە، بە هۆی ژینگەی بیابانی زیاتر بووە، زۆر نوسەری عەلمانی کورد، وەك: (ئەحمەد شەریف و غەفور مەخموری و ڕەفیق سابیر) ویستیویانە ئەو دیتنە کۆمەڵناسیە بە سەر تەواوی ژیانی عەرەبەکان پیادە بکەن، دەشڵێن: گەر باوەڕ ناکەی سەیری (المقدمة)ی (ئیبن خەلدون) بکە، کەچی (ئیبن خەلدون) ئەوها ناڵێت !

## ئەدگاری کۆمەڵایەتی شار :

جوگرافیای ،شار بەشێکی سەرەکی جوگ،رافیای بەشەرییە، بە واتای بە دروستبوونی شار، کۆتایی بە کۆچەری نەهات، بەڵکو لایەکی مەعریفی و عیمرانی بە ڕەوشی کۆچەری دا.

جیوگرافیای شار، پەیوەندی بە سیاسەتەوەش هەیە، چەمکی جیۆپۆلیتیکی پەیوەندی بە ( جیۆگرافیا ) و ( سیاسەت )ەوە وەیە . هەر باری سیاسی و دینی نەتەوە بەرەو مەدەنیەت، کە شاربوون و موئەساسات هەبوون بەشێکن لێی، دەبات.

هەروەها کودەتای سیاسیش، نەتەوە دەگەڕێنێتەوە بۆ کۆچەری، بۆ نموونە: عەرەب پێش ئیسلام، نەتەوەیەکی زۆربە کۆچەری دوا کەوتوو بوو، هەروەها نەتەوەیەکی تا بڵێی نێرسالاری بوو، بەڵام هەر لە پاش موسڵمانبوون، ماڵەکانیان لە ئەسپانیا، بە هەبوونی گەرماو - حەمام لە جولەکە و نەصرانی جیادەکرانەوە.

کوردیش لە (١٥٠)ساڵی حوکمڕانی (میدیا)دا بە شاهێدی زۆربەی ئەو

بیانیانەی لە سەر ئەزمونی میدیاکان نووسیویانە، دەڵێن: ئەو دیموکراسیەی لە ئەمریکا هەیە، ڕەگەکەی لە ( میدیا )وە سەرچاوە دەگرێت، ئەو پڕ مەدەنیبوونە لە دوای کودەتای کۆرشی ئەخمینی لە (٥٤٩ پ.م)، ئەو نەتەوەی هێندە گەڕاندەوە پشتەوە، (ئیبن ئەسیر) پێیان بڵێت : " کۆچەری فارس ."

هەرکە کورد بە تەواوی پەیوەندی بە ئیسلامەوە کرد، زۆربە لە کۆچەری و کۆچەری فارس دەرباز بوو، بەرەو عیمرانیەت چوو .

لە پێش ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕین، کۆمەڵە ماستەرنامەیەك لە سەر شاری کوردی نووسراون، لەوانە: (دینەوەر، ئەربیل،خەلات، هەکاری، هەمەدان، حلوان...)،
لەم بەشەدا پێناسە و مێژووی چەند شارێکی کوردی، بە پێی هەرێمەکان دەخەینەڕوو.

بەر لەوەی باسی شارەکانی بکەین، گرینگە ئاماژە بە سەرژمێری وەختێکی نزیك لە ڕووداوەکان بکەین، هەتا وێنەیەکی دروستی ماوەی (٩ك-٤٠) پێشکەش بکەین:

لێرەدا گرینگە وەختەکە (٩-٤٠)ی کۆچی بە نەزەر ئیعتبار وەربگرین، کە کورد ئەوسا، ژمارەیەکی زۆر نەبووە، هەتا زۆربەی شارەکان تەواو کورد نەبوون.

د.کەمال مەزهەر (٢٠٠١) لە (ل٤٧٥) لەژمارە پێنجی گۆڤاری (الشهبأ) کانوونی یەکەمی ساڵی (١٨٧٧) دەربارەی ژمارەی دانیشتوانی کورد تەنیا لە ویلایەتی کوردستانی عوسمانی دەگوازێتەوە :

"ساڵی (١٦٨٨) ١,٣٧٠,٠٠٠ کورد.
ساڵی ١٨٧٢ ٨٠٠,٠٠٠ کورد.
ساڵی ١٨٧٦ ١,١٤٠,٠٠٠ کورد.

"ئەدی دەبێ لە ناوەڕاستی شەش سەدەکان چەند بوویێ؟

شارەکانی ئەو پێنج بەشەی کوردستانی ساسانی و ڕۆمی بریتین لە :

## یەکەم: شارەکانی کوردستانی ساسانی:

سنووری جیوگرافی و کارگێڕی هەردوو ئەقلیمی عیراقی کوردی و ئەقلیمی جیبال، لە لای هەموو جیوگرافیناس و مێژووناسانی پێشین جیاوازن، هەندێك هەر تێکەڵ یەکتریان کردووە .

لە لایەکی دی، سنووری ئەو ئەقلیمانە بە پێی حوکمڕانیەت دەگۆڕێت، بۆ نموونە: هەرسێ ئەقلیمی ناو قەڵەمڕەوی فارسی، لە زەمەنی سلوکی یۆنانی (٣٣١-١٢٧ پ .م)، ئەشکانی (٢٤٧ پ .م) (٢٢٦) ی میلادی، هەروەها ساسانی (٢٢٦-٦٥١) میلادی جیاواز بوونە، چونکە لەو ماوەیەدا بەشێك لە شارەکانی ئەو سێ ئەقلیمە لە بندەستی ڕۆمی بووە.

زۆربەی مێژوونووس و گەڕیدەکان سەدەیەك دوو سەدە، زیاتریش پاش فتوحات، کتێبەکانی خۆیانیان نووسیوە، ئەو دەمەش سنووری جیوگرافی لە بەینی هەرێم و شارەکان نەبوو، بۆ نموونە:

دەوڵەتی عەباسی، ئیمپراتۆریەتی خۆی کردبووە چەند ئەقلیمێك، لەوانە: (ئەقلیمی عیراق، ئەقلیم جەزیرە، ئەقلیم جیبال، ئەقلیم ئازەربایجان، ئەقلیم شام....)(ع .یوسف،ل٦٩). لە پێش ئیسلامبووندا، دابەشکردنی ئەقلیمەکان بەو جۆرە نەبوو، بەڵکو تەنیا ئەقلیمێك ناوچەی دوو ئەقلیمی ئێستای تێدابوو، بۆ نموونە: دەوڵەتێك بە ناوی (حەدیابی جوو) پاشان (حەدیابی مەسیحی) لە کوردستانی باشوور هەبوو .

د.جەمال ڕەشید لە (ل٤٥)ی (دراسات کردیة...) دەڵێت : "...هەرێمی ئەدیابین بریتی بووە لە ناوچەکانی ئامەد و نەینەوا و ئەربیلا." لە سەردەمی بەرایی ئیسلامی ئەقلیمی عیراق، بریتی بوو لە: عیراقی عەرەبی و ئەقلیمی عەجەمی. سنووری ئەو عیراقە عەجەمیە، لە چیای حەمرینەوە دەستی پێدەکرد، هەتا ناوچەی حەلوان - الوان، درتنك - زەهاو، کاتێ بە عیراقەوە لکێندرا مالیتەشی ( خانەقین،قصر شیرین) بۆ زیادکرا)) .

**١- عیراقی کوردی - کوردستانی باشوور:**

ناوچەی عیراقی عەجەمی، هەژار موکریانی لە پێشەکی (شەرەفنامە)دا دەڵێت : عیراقی عەجەمی بریتی بووە لە: عیراقی کوردی، ئەویش بریتیە لە بەشێکی کوردستانی باشووری ئەمڕۆ....

دکتۆر (نائل حنون) باسی زۆربەی ناوە ئاشوریەکانی عیراقی عەجەمی دەکات . کەلسومە جەمیل لە باسی هەڵمەتەکانی دەسەڵاتی ئاشووری بۆ سەر کوردستان، دەسەڵاتی ئاشووری لە کوردستان وەك داگیرکەرێك دەناسێنێ ..."، بۆیە کوردەکان ناچاربوون هاوپەیمانییەك لەگەڵ بابلیەکان بکەن و کۆتایی بەو دەسەڵاتە فرانخوازە بێنن.

لە دیدی دیارکردنی ناوی شار و شارۆچکە و دێهات، پێویستە چەند ئەدگارێك رەچاو بکرێت، لەوانە:

١- لایەنی مێژوویی شوێنەکە.

٢- ئیتیمۆلۆژیای وشەکە لە زمانەکان.

٣- لایەنی مۆرفۆلۆژی وشەکە.

٤- کەلتووری خەڵکە رەسەنەکە، یا داگیرکەرەکە.

ئەو چوار ئەدگارە مۆرفۆلۆژیە، لە ناوی زۆربەی شارەکان قسەی لە سەر دەکرێت .

**لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامیدا، چوار شاری عیراقی عەجەمی(کوردی ) ناویان زۆر دێت، کە بریتین لە:**

**١- جەلەولا :**

ئەو هەموو ناوەی بۆ ناوی (جەلەولا) پێشنیاز دەکرێن، هەموو ناوی جیوگرافین، نەك کەلتووری . کاتێك لە شکری ئیسلام گەیشتە (جەلەولا)، (١٣٠٠) ساڵ بوو ئەو ناوچەیە داگیرکرابوو .

لە ماوەی دەسەڵاتدارێتی: (ئەخمینی، تا ساسانی)، هیچ ناوێکی کوردی پێوە نەمابوو .

(ڕۆژبەیانی) باوەڕی وایە: لە کۆندا ئەم شوێنە ناوی ( قەراخان )بوو . پاش کودەتای فارسی بە سەر کورد ئەو (قەراخان)-ە بووە ( کرخ جدان) - بابان، (ل٩٣-٩٤) . لای (ڕۆژبەیانی) کەرخ جدان ( قەرە حەسەن )ی ئێستایە - ل٢٣.

شارەکە سەرەتای عیراقی کوردیە . پاش هەرەسی تەیسەفۆن(سەلمان پاك) لەبەردەم سوپای ئیسلامدا، لەم شارەدا کوشتارێکی زۆر لە بەینی ساسانی و موسڵمانەکان ڕویدا .

(بەلازری) لە کتێبی: (فتوح البلدان) و (ل١٠٨-١٠٩) ی (العراق الشمالی) وا باسی ئەو ڕووبەڕوونەوە دەکەن، کە خودی ناوەکە بە واتای: کوشتاری گەورە دێت .

ئەو کوشتارەش لە (١٦)ی کۆچی لە نێوان موسڵمانەکان و ساسانییەکان ڕوویداوە، لەوێوە کورد وەك میللەتێکی ستەمدیدە بە ئیسلام ئاشنا بووە . پاش هاتنی عوسمانیەکان بۆ ناوچەکە، جارێکی تر ناوی: (قەراخان ) بە ( قەرەغان) کرایەوە . (بابان) لە (ل٩٣) دەڵێت : لەم زوانە ناوی جەلەولا ( قەرەغان ) بووە،" ئەو گۆڕانە فۆنەتیکیە لە نێوان / خ / ی کوردی /غ/ ی عوسمانی، زۆر وشەی کوردی گرتۆتەوە، وەك:

باخ باغ
داخ داغ
ساخ ساغ

تەها هاشمی (١٩٢٧) لە (ل ١٠٤ و ١٠١)ی (جغرافیة العراق) دەڵێ: (قەرەغان) سەرە ڕێگایەك بووە بۆ بە یەکگەیاندنی بەغدا بە کفری و کەرکوك، هەروەها بەغدا و کەرمەنشا."

ئیدارەی کوردی ئێستا، باوەڕی وایە: (جەلەولا) پێشتر ناوی (گوڵاڵە) بووە، بەڵام نە خەڵکی ناوچەکە ، نە هیچ سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو، ئەمەیان

پشتراست نەکردۆتەوە .

گەر ئەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە مەبەست لەو کوشتاری گەورەی (جەلەولا)، کوردە، پاش هەرەسی دەوڵەتی عەباسی، کورد (قەراخان) و (قەرەغان) و (ئارمیتا)ی بەکاردەهێنایەوە، بەڵام ئەو شەڕە لە نێوان لەشکری ئیسلامی و لەشکری ساسانی بووە، نەك لەشکری ئیسلام و کورد، هەروەها هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن، کە (٤-٥) هەزار سەربازی کورد لە شەڕی قادسیەوە دژ بە لەشکری ساسانی بەشداری کردووە.

پاش دیارکردنی ئیتیمۆلۆژی ناوی شارەکە، هیچ کامێك لە ناوەکان، کوردی نەبوونە، بۆیە (جەلەولا) وەك خۆی ماوەتەوە.

**٢- خـانەقـین :**

بە پێی سەرچاوە ئیسلامییەکان، (خانەقین)، دووەم شارۆچکەی کوردی عیراقی عەجەمیە، کە بەبێ شەڕ موسڵمان بووە . جەمال رەشید (١٩٨٤) لە (ل١٢٠) لە کتێبی: (دراسات کردیة فی بلاد سوبارتو) دەربارەی شارۆچکەی (خانەقین) دەنووسێت: "لە سەردەمی ئیسلامی، (خالونیتیس) حەلوان بوو، کە بریتی بوو لە: (خانەقین، قەصرشیرین و سەرپێڵ).

ئەو ناوە لە کۆندا بە: (هەلبن) لە فارسی ناوەڕاست دەناسرا، ئەو ناوەش لە (هالبان)ی یۆنانی وەرگیراوە ." لەوانەیە ئەو ناوە لە ماوەی (٣٣١-٢٤٧) پ.م بوبێت، چونکە لەو ماوەیە دا، یۆنان حوکمی کوردستانی کردووە .

لە لایەکی دی عەبدلرەقیب یوسف لە (ل٨٣)ی کتێبی (حدود کردستان الجنوبیة ..) دەنووسێت: "خانەقین لە سەردەمی سلوکی یۆنانی (٣٣١-١٢٧ پ . م) پێیدەوترا: (ئارتمیتا)."

کوردەکانی قەڵەمبەدەست بە ڕوباری شارەکە دەڵێن: (ئەلوەن)، بەڵام کەسی عەوام هەر وشەی (خانەقین) بەکار دەهێنن .

موحەممەد مندەلاوی، دەربارەی عەشیرەتی باجەلانی ناوچەکە لە (لغت

نامەی دهخدا) و (مەردۆخی) دەگوازێتەوە، کە (باجەلان) عەشیرەتێکی کوردی سوننەیە لە هەرێمەکەدا: "دهخدا لە (ل٣٩١٤) ئینسایکلۆپیدیای (لغت نامه) دەڵێت:

بأنّ (باجلان) فرع من القبائل الكوردية في إيران، في (سربل زهاو) و مذهبهم التسنن."
هەروەها موحەممەد مەردۆخ لە (٧٨)ی (کورد و کوردستان) دەربارەی (باجەلان) دەڵێت: "إن ل"باجلان" فرعان هما (جمور) و (قازانلو) و هم من أفخاذ قبيلة (اللك) الكوردية و التي هي بدورها فرع من اللور و كانوا يتألفون آنذاك من حوالي (١١٠٠) بيت في أطراف (قورتو) و (هورين) و(شيخان) و (قصرشيرين) و (قازاني) و (مندلي)"

مەندەلاوی، کە دێتە سەر ڕای (بەلازری) دەربارەی (خانەقین)، سێ هەڵەن دەکات:

١- دەڵێت: (بەلازری) لە (ل١٠٩) (فتوح البلدان) دەڵێت:.. کەچی لە ڕاستیدا، وتەکەی (بەلازری) لە (ل١٦١)نەك ل١٠٩).

٢- ئەعجەمی لەو کۆنتێکستەی (بەلازری)، مەبەستی سوپای ناعەرەبیە، ئەوساش لەو شوێنە تەنیا (ساسانی) هەبوو،

٣- لە هەمان لاپەرە (بەلازری)، باسی هەڵاتنی (یەزگورد) دەکات، هەروەها پاش سوڵح، ساسانیەکان غەشیان کردووە، ئەوجا کوشتنی سەربازەکانی ساسانی ڕویداوە، هەروەها لە دوای ئەو هەواڵە، (بەلازری) باسی هەڵوێستی (عومەر) دەربارەی گیراوەکانی (خانەقین) دەکات، کە بریتی بوو لە: "فلم يعرض لهم عمر بن الخطاب و لم يخرج الارض من ايديهم و ازال الجزية عن رقابهم" واتە: عومەر ڕوو بەڕوویان نەبۆوە، زەویەکانی لێ نەستاندن، هەروەها (جزیە)ی لە سەر ئەستۆ هەڵگرتن"!

ئایا ئەم قسەی (بەلازری)، تەواو پێچەوانەی لێکدانەوەی (مەندەلاوی) نییە؟!

ئەوانەی (جریر) کوشتنی، سەربازی شەڕکەر بوون، (یەزگورد)ی سەرۆکیان

هەڵاتبوو، ئەوان هەر شەڕیان دەکرد ! ئەگینا لەشکری ئیسلام نە لێیانی دا، نە دەریکردن، هەروەها (جزیە)شی لە سەر (دەهقانەکان)ی دەوروبەر هەڵگرت!

(حەمەوی ) لە بەشی سێی "معجم البلدان" دەربارەی (خانەقین) دەنووسێت":
خانقين بلدة من نواحي السواد في طريق (همدان) من (بغداد) بينها و بين (قصر شيرين) ستة فراسخ لمن يريد (الجبال).

خردازبه لە (ل ٧) ی" المسالك و الممالك" ئاماژە بە نێوانی: (خانەقین و جەلەولا) دەکات، کە بریتی بووە لە (٧) فەرسەخ ( نزیکەی ٤٢ کم ) و (خانەقین) و (قصر شیرین) شەش فەرسەخ ( نزیکەی ٣٦کم )."

لەوانەیە وشەی (خانەقین) لە دوو وشەی کوردی پێکهاتبێت : خان + ناوگر + قین : شوێنگای ڕق، ماڵی ڕقلێبونەوە، کیندار .. وشەی کوردی ( خانەقین ).

جەمیل ڕۆژبەیانیش لە (ل٢٨٥)ی (اسماء المدن...) دەڵێت: (خانەقین) بە عەرەبی کراوە، بەڵکو لە (خان ) و (طین) خانطین هاتووە " ئەم ڕایەی (ڕۆژبەیانی ) ڕاست نییە، چونکە لە بریتی */ط/ی* کوردی، */ق/ی* عەرەبی نایەت، چونکە */ق/* لە کوردیش هەیە .

بۆیە هەر بە خانەقین مایەوە!

## ٢- قەصر شیرین:

(قەصر شیرین) لە ئێستادا قەزایەکی (کەرمنشاه) دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای ئێران. ئەم قەزایە لە ئێران لە ڕووی کارگێڕیەوە ناسراوە بە: (سومار). ئەو شارۆچکەیە لە سنووری (عیراق - ئێران)ە، بەپێی ڕێککەوتنامەکەی (قەصر شیرین) شارۆچکەکە بووە بە بەشێك لە مەملەکەتی (صەفەوی)، ئەگەرنا بەشێك بوو لە عیراقی عەجەمی .

(عبدالوهاب عزام) (١٩٣٩) لە گەشتێکدا بۆ ناوچەکە، دەربارەی (قەصر شیرین) دەڵێت: "شارێکی بچکۆلانەیە، دەکەوێتە سەر ڕێی (خوراسان) لە سەر ڕووباری (ئەلوەن)...".

زۆر بیروڕا هەن دەربارەی قەصری شیرین: یەکێ لەوانە، دەڵێت: (خەسرەوەی پەروێز) ساسانی لە نێو (٣٠٠) ژنەکەی بۆ (شیرین) ناوێکی مەسیحی دروستی کردووە، لە نوێیەکان (عەزام)یش باوەڕی وایە: خەسرەو پەروێز بۆ (شیرین) ی دروستکردووە . خەسرەو لە شیرین دا دوو کچی بەناوبانگی هەبوو، کە بۆ ماوەی (٦٢٨-٦٣٢) هەردووك لە دوای یەك بوونە پاشای ساسانی، پاشان لای پیاوانی کۆشك تیرۆر کران.

(قەصر شیرین) لە زۆر لە نوسەرانی کتێبی مێژوویی سەردەمی (فتوحات) ناوی هاتووە، لەوانە: (بەلازری و ئیبن حەوقەل).

کاتێ مرۆ لە (قەصرشیرین) بەرەو (کرمانشاە) ڕێدەکات، کێوێك لەوێ هەیە بە ناوی (کێوتاق). هەروەهالە دەشتەکەیدا شارێکی پڕ بەساتین لە ڕێگا هەیە بەناوی: (شائاباد)، ڕوبارێك بەناوی (قەرەصوٚ-ئاوی ڕەش) هەردوو شارەکە لەیەك جیادەکاتەوە.

لە تێڕوانینی جەمال ڕەشید لە (ل١٢٠)ی (دراسات کردیة...)قەسری شیرین لە سەردەمی ئیسلامیدا قەسرین شیرین بەشێك بووە لە پارێزگای (حلوان - ئەلوەند)."

(کریستنسین) لە (ل٥٦٥) دەربارەی بیرۆکەی قەصرشیرین دەنووسێت : "هێندێك لە لای سەرووی ئەو ڕێگا لەشکرییەی نێوان: (خانەقین و ئەلوەن)، هەرەسەڕووخاوی کۆشکێك وەبەرچاو دەکەوێت، کە وا دیارە لە مێژووی (خوسرەو پەروێز)دا دەوری هەیە، ئەویش (قەصری شیرین)ە.

بە گوێرەی چیرۆك و نەزیلە باوەکان، کە ڕەنگە ڕاست بن، شیرینی گراویی ( کەنیزەکی ) لەوێ نیشتەجێ بووە."

ئەو شیرینە دایکی (پوران شا) و (ئازەرمیدۆخت) شا بووە. ئەو سێیە، ماوەیەك بە تایبەتی لە پاش ساڵی (٦٢٨) هەتا (٦٣٢) دەورێکی گرینگیان لە مێژووی حوکمڕانی ساسانی بینیوە.

قەصر شیرین ناوێکی بە عەرەبیکراوە؟؟ کۆشکێکە لە ماوەی حوکمڕانی خەسرەوی پەروێز (٥٩٠-٦٢٨) بۆ شیرین خانی دۆستی دروستکراوە.

بە حوکمی ئەوەی لای زۆربەی مێژوونووسانی ئیسلامی، لەوانە: (ئەبوفیدا) جیاوازی لە نێوان (عیراقی عەجەمی) و (ئەقلیم جیبال) نەکراوە، بۆیە لە (تقویم البلدان) شارەکە بە شارێکی ڕۆژئاوای (ئەقلیم جیبال) دانراوە، جگە لەوەی (ئەبوفیدا) هەمان زانیاری دەربارەی ناوی شارەکە تۆمار دەکات، بەڵام لە دووری شارەکە لە (خانەقین) و (حلوان) ئاشکرا دەبێت، کە شارەکە لە سەردەمی (فتوحات) لە ناو سنووری (عیراقی عەجەمی) بووە، نەك (ئەقلیم جیبال).

موحسین مامل (٢٠١٤) لە (ل١٣٦) ماستەرەکەی لە (ئەبوفیدا) دەگوازێتەوە : "قەصری شیرین لە حلوان (٥٠) فرسەخ ( ٣٠٠کم) و لە خانەقین (٧) فرسەخ (٤٢ کم ) دوور بووە ." گەر بزانین (حلوان) یەکەم شاری ئەقلیم جیبال بووە!!!

کەواتە قەصر شیرین لە سنووری عیراقی عەجەمی بووە، لە ڕووی ئیتیمۆلۆژیەوە لە مۆرفۆلۆژیای فارسیەوە هاتووە، تەنیا ئەوەندە پەیوەندی بە کوردەوە بووە، لە خاکی کورد بووە، ئەگەرنا ناوەکە، ناوێکی فارسیە و وەك خۆی ماوەتەوە !

هەندێ شاری دی ئەو ئەقلیمە، زۆر کەم لە ماستەر و دکتۆرانامەکان ئاماژەیان پێنەکراوە.

## ٤- شـــارەبان :

جەمیل ڕۆژبەیانی لە (ل٥٠) (یاداشتەکانی مأمون بەك) کاریگەری فارسی، چ زمان، چ کەلتوور بە سەر ناوی گوند و شاری کوردی دەبینێت، بۆ نموونە: لە بارەی ناوی (شارەبان) دەنووسێت : شارەبان بۆ (شەهربانو) دەگەڕێتەوە، کە کچی (یەزگورد) بوو و بووە هاوسەری ئیمام حوسێن. .." لە پەراوێزی یەکەمی (ڕەشەخاك...)(ل٢٢) شارەکە بە ( دەسکەرە ) دەزانێت .

سەرچاوەی تریش هەن، ناوەکە دەبەنەوە سەر ( شیرین )ی دۆستی خەسرەو ! بابان) لە (ل١٨٦) ئاماژە بەوە دەکات، کە (مقداد بن اسود کەنەدی) یەکەم سەحابی بووە هاتۆتە دەڤەرەکەوە، بۆیە کراوەتە (موقدادیدیە)، بەڵام

(ڕۆژبەیانی) لە (وڵاتگیری)، کە میقداد کەنەدی نە کوردستانی بینیوە، نە لە کوردستان نێژراوە، ئەوە میقدادێکی ترە.

ئەو هەموو ناولێنانە لە لێکدانەوەی فارسییەوە سەرچاوە دەگرن، جا گەر ناوی - مقدادیە-ی ڕزگارکەر، داگیرکردن بێت، ناوی بنەماڵەی داگیرکەر، وەك: (شیرین)ی دۆستی خەسرەو بێ، یا (شەهربانوی کچی یەزگورد) بێت، ناوی داگیرکەری کوردستان نین، یان ئەوان پسمامی کوردن؟؟؟.

دکتۆر عبدالفتاح بۆتانی لە (ل٦)ی پێشەکی نامیلکەی (بادینان) لە عەباس عەزاوی دەگوازێتەوە، کە کورد زۆر بە خاکەوە گرێدراون، نەك ناوی کەسێك، بەڵکو ناوی شوێنەکە، یا گوندەکە..."

**لە سەر ئەو بنیاتە کەلتوریە، خوێندنەوەیەکی مۆرفۆلۆژی بۆ ناوی وشەکە دەکەین:**

شارۆچکەی (شارەبان)، هەڵگری دوو خوێندنەوەی مۆرفۆلۆژییە :

**١- شار - شەهری فارسی + بانو:**

مامۆستا جەمال بابان لە (ل١٨٦) ئەو خوێندنەوەیە دەکات . ئەو خوێندنەوەیە پشت ئەستورە بە گۆڕانی وشە، چونکە (شارە) بۆتە (شار) و (بانو) بۆتە (بان) !

**٢- شار + ناوگری (-ە)+بان:**

دکتۆر جەمال نەبەز لە (ل٧٦) ی (وشەنامەکی ئیتیمۆلۆژیای...) دەنووسێت: "(بان) بریتییە لە ڕووی سەرەوەی خانوو ." هەروەها هەژار موکریانی باسی هەندێ واتای (بان) دەکات، کە بریتین لە —لای سەرو وەك لە بان ئەو کێفە، سەربانی خانوو ، بانو : زەمینی دەشت و بڵند وەك بان هۆ بە تو ، تاڵەبان.
هەروەها لە (ل٤٦٣) دەڵێت : شارە : شارا، لە (ل٤٦٤) دەڵێت : شارەمێرو : کونی مێرولان."

ئەو دوو شرۆڤەی: (نەبەز و موکریانی)، واتای تر بۆ وشەی (شارەبان)

دروست دەکەن :

١- نەبەز : شارەبان : سەرووی شار : دەنگەکە لە سەرووی شار دێ.

٢- موکریانی : کونی بان - کونی سەربانی خانوو، واتە: خانوەکە دڵۆپە دەکات.

هەروەها سەرزەمینی شار ! (بان) واتایەکی بەرجەستەی هەیە، کە ( سەربان ) دەگەیەنێت وەك :

- لە بانەکە فڕێی دەنە خوارەوە .

- لە بان کەوتووم .

هەروەها وشەی ( بان ) واتایەکی میتافۆریشی هەیە، کە واتای "سەر" دەدا، وەك :

- بان چاو: سەر چاو.

- بان سەر: سەر سەر، یان سەر تەپلی سەرم!

**٥- بەندەنیجین - مەندەلی :**

ڕۆژبەیانی لە (ل٢٢)ی (وڵاتگیری ڕەشەخاکی عیراق) دەڵێت: شاری (بەندەنیجین) شاری (مەندەلی)یە بە ئاشتی گیراوە . جیوگرافیای شوێنەکە ئیسپاتی ئەوە دەکات ،کە لە نێو سنووری عیراقی عەجەمی دایە . بابان لە (ل٢٨٣) دەنووسێت: (مەندەلی) پێشتر هەر (بندنیجین) نییە، بەڵکو بندنیج-یشی پێوتراوە.

(البندنیج) وشەیەکی فارسیە و بنەرەتەکەی (بندنیك)ە.

(بەندنیجین) لە سێ بڕگە پێکهاتووە :

**بڕگەی یەکەم :** بند - بەند واتای: سەکنی دەدا.

**بڕگەی دووەم :** نی - نەوی، بە واتای: نزم و پێچاو پێچ.

**بڕگەی سێیەم :** جین - جێ، بە واتای: شوێن دێت .

هەموو بڕگەکان بە واتای: شوێنێکی، سەر جێیەکی پێچاوپێچ دەدەن.

بابان لە (ل٢٨٤) وشەی مەندلی لە (وردنیکا)، یا (ئەردریکا) بۆتە (بەندنیج)، یا (بەندنیجین - مەندلیجین) هاتووە، کە بە واتای مەلاکی باش دەدا.

مەندەلی لە هەر ناوێك هاتبێ، هیچی کوردی نین، کەواتە: گوتاری تەعریب و بەعەرەبکردنی ناوی شاری کوردی، گوتارێکی بۆشە!

## ٢- ئەقلیم جیبال - ڕۆژهەڵاتی کوردستان :

کەس نکوڵی لەوە ناکات، کە شوێنێك هەبووە بە ناوی: (ئەقلیم جیبال)، یا (غەربی ئەقلیم جیبال)، بەڵام ئەوەی کێشەیە: جیوگرافیای (ئەقلیم جیبال)ە . پێش هاتنی عیراقی عەجەمی و ئەقلیم جیبال، هەردووك یەك شوێن بوونە، لەوانەیە هەڵگری یەك پۆلێنی کارگێڕی بووبن .

عەبدلرەقیب یوسف وەك مێژوونووس و شوێنەوارناسێکی کورد لە (ل٦٩) ی (حدود..) دا دەڵێت : عیراقی عەجەمی، یان ناوچەی کوردی، لە سەدەی (سێی ) کۆچیەوە لە عیراق جیابۆوە و لکێندرا بە (ئەقلیمی جەبەل) ."

هەر هەمان نووسەر لە (ل٨٣)ی هەمان کتێب لە: (ئیستەخری، ئیبن حەوقل، مقدەسی..) دەگوازێتەوە، کە ئیقلیمی جیبالی گەورە ( عیراقی عەجەمی + ئەقلیمی جەبەل ) وای لێهات لە حەلوانەوە دەستپێبکات و ناحیەی خانەقین بگرێتەوە، بە واتای: لە چیای حەمرینەوە، هەتا ڕەی - تەهران ."

ئیبن حەوقل (١٩٧٩)، لە (ل٣٠٤) دا دەڵێت: لە پاشان، (ڕەی) و (قەزوێن) و (ئەبهەر) و (زنجان) لە ئەقلیمی جیبال..جیاکرانەوە ."

ئەوە ئەوە دەگەیەنێت، کە پێشتر عیراقی کوردی-لە سەردەمی بەرایی (فتوحات) ،یەکەیەکی سەربەخۆ بووە و بەشێك نەبووە لە (ئەقلیمی جیبال) .

(ئەقلیم جیبال) بەشی دووەمە لە کوردستانی بندەستی ساسانی .دکتۆر ئەحمەد خەلیل (٢٠٠٧) لە (ل١٣٧)ی کتێبی (تأریخ الکرد..) دەنووسێت :ئەو ئەقلیمە لە سەردەمی حەمورابی بابلی (١٧٩٢-١٧٥٠ پ . م) .بە شێوەی (ماتیوم علیتوم) وڵاتی بەرز ی دەهات، ئەوسا بریتی بوو لە: (ماراهشی، ئۆرکیش، ناوار، گوتیوم، زاموا، سیموروم، ئۆبیلیوم ..) فارسەکانیش پێیاندەوت:

(قوهستان)، عەرەبەکانی سەردەمی ئیسلام بیلاد جەبەل ."

لە سەردەمی حوکمی ئەشکانی(١٤٧ پ.م). (٢٢٤) میلادی ئەو (بیلاد جەبەل)ە، بە بیلادی پەهلەوییەکان ناسرابوو، وەك (ئیدریسی ) دەنووسێت: بیلادی پەهلەوییەکان هەر بیلادی جەبەلە."

**ئەبو الفیدا لە (تقویم البلدان) دا (ل٤١٢-٤١٣) ئاماژە بە (١٣)ی شاری ئەقلیم جیبال دەکات . لە پرسی ئەو (١٣) شارەدا دوو شت تێکەڵاوی یەکتر دەکەن :**

١- پۆلێنی کوردستانی ساسانی سەردەمی فتوحات لەگەڵ هەمان کوردستان لەگەڵ سەردەمی عەباسی،

٢- پۆلێنی جیوگرافی و پۆلێنی کارگێڕی .

**ئەوەی ئێمە لەم توێژینەوەدا کاری لە سەر دەکەین، دوو شتە :**

١- ئەوانەی بەشی کوردستانن، جا بەش جودا بن، یا ئەقلیم جودا٠

٢- لە ڕووی جوگرافیاوە بەشێك نین لە کوردستان وەك: (تکریت) و (ئەهواز)، بەڵام لە ڕووی کارگێڕیەوە سەر بە ئەقلیمەکانی کوردستانن.

وەك گوتمان عیراقی عەجەمی و ئەقلیمی جیبال بریتی بوون لە: (جەلەولا.. لە حەلوان، شەهرەزوور، قەصر شیرین، قرمیسین، دینەوەر،هەمەدان ئەصفەهان، لوڕ). لە پۆڵینی کارگێڕی ئابووریش،ئەو هەموو شارەش لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامی، سەر بە (کوفە) و (بەسرە) بوون .

## شارەکانی ئەقلیم جەبەل :

لە ماستەرنامە و دکتۆرانامەکاندا، ناوی هەندێ شار و شارۆچکەی کوردی قسەیان لە سەرکراوە. چەندی بکرێت شارەکان بە پێی زانیاری ناو کتێبەکانی: (واقدی، طبری، ئیبن ئەسیر، بەلازری، ئیبن فیدا ..) و جیوگرافی ناوچەکان دەکەین:

**١- حەلوان:**

ئیبن حەوقەل (١٩٧٩)، لە (ل٣١٤) هۆکاری تۆپۆگرافی و سەقایی، دەکاتە خاڵی جیاکەرەوەی شوناسی ئەم شارە، وەك لە خاڵی -١١- دەنووسێت : " و حلوان مدينة في سفح الجبل المطل على العراق....و يزعم بعض الناس ان حلوان من العراق و يزعم الاكثرون انها جبلية ...من الجبال. واتە: حلوان شارێکە لە چیا بە سەر عیراق دەڕوانێ (هەندێ ) بانگەشەی عیراقیبوونی دەکەن، بەڵام ( زۆربەی خەڵك) بانگەشەی جەبەلیبوونی دەکەن و دەکەوێتە هەرێمی چیا، یا ئەقلیم جیبال."

لە خانەقین هیچ شەڕێکی ئەوتۆ نەکرا، ساسانییەکان بەبێ شەڕ دەستبەرداری بوون. (حەلوان) کۆتا شار بوو، کە عیراقی عەجەمی لە ئەقلیم جیبال جیادەکردەوە .

ڕۆژبەیانی دەڵێت : (حەلوان) پارێزەری سنووری پێدەشت بوو، هەروەها لە (ل٢٢)ی (وڵاتگیری) دەڵێت : (حەلوان) لەو شارانەیە، کە بە ئاشتی گیرا. مامۆستا حەسەن لە (ل٣٤)ی (فەتحی ناوچە...)، هەمان شت دووبارە دەکاتەوە و دەنووسێت : "شاری (حەلوان) وەك: (خانەقین و سەرپێڵ و قەصری شیرین) بە ئاشتی ڕزگارکراون، خەڵکەکە بە بێشەڕ پێشوازیان لە ئیسلامکرد..

لە عیراقی عەجەمیدا، عەرەبی شوانکارە و خاوەن مەڕ وماڵات لە سنوورەکە هەبوون، بەڵام ناوچەکە، زۆربەی کورد و هەندێ فارس هەبوون، بۆیە زۆربەی مێژوونووسە عەرەبەکان بە عیراقی عەجەم ناوی دەبەن .

ئەو هاوتخووبیەی (حلوان) لەگەڵ شارەکانی: (جەلەولا و خانەقین ....) وا لە موحەممەد ئەمین زەکی دەکات لە (ل١٢٣)ی (خلاصە تاریخ الکرد) دەربارەی شارەکە بنووسێت : "لە حەلوان یەکەم پەیوەندی لە نێوان موسڵمان و کوردەکان دروست بوو." بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت، زۆربەی کورد لە شەڕی (جەلەولا) بە ئیسلام ئاشنا بوو .

ئەحمەد میرزا لە (ل٨١)ی ماستەرنامەکەی دەنووسێت : "(قەعقاع)

(سوورەکانی ) لەوێ نیشتەجێ کرد، کە بە عەجەم، یا کۆچەری فارس ناسرابوون، کەچی د.عبداللە مستەفا لە (امجاد الاکراد ) دەڵێت : "ئەو (سوورانە) کوردی (دێلمی ) بوون، دکتۆر عبداللە هەر لەو کتێبە دا دەڵێت : یەکێك لەو (دێلمان) ە بە فەرمانی (عومەر) بووە والی شارەکە ."

**ناوی شارەکە، چ لە عەرەبی، چ ئاشووری، چ لە کوردی هاتبێت، هەندێ شرۆڤەی زمانەوانی بۆ کراوە، لەوانە:**

١- لە ڕووی ئیتیمۆلۆژیەوە، وشەکە لە ( هەڵم~+ ان ) هاتبێ، ناوچەکە زۆری گۆگرد هەبوو بێت، لە زستانان هەڵم هەستا بێ، بۆیە ناویان لێ نابێت: (هەڵاوان) دوایێ بە پێی ڕێسای گۆڕانی وشە گۆڕابێت بۆ: (حلوان) - (هەمزە ٢٠١٣، ل ١٨-١٩).

٢- وشەکە لە (حەل +وان )هاتبێ . هەژار موکریانی لە (ل٢٣٠)ی (هەنبانەبۆرینە) دەربارەی وشەی ( حەل ) دەنووسێت : ڕاست و دروست ، شیاو .." هەروەها لە (ل٩٠٦) دەربارەی ( وان ) دەنووسێت: "پاشگری ئاگاداری - ئاگالێبوون وەك: باخەوان، گاوان، پسپۆر وەك ڕازەوان ....".

لە لێکدانی واتای هەردوو وشەکە: - حەل + وان - دەبێتە ( پاسەوانی شیاو)، زۆر نوسەری کۆن و نوێش باوەڕیان وایە:(حەلوان) پارێزی دەشتی عیراقی عەجەمی بووە، لەلایەکی دیش لە دروستکردنی وشەی: "ڕۆژهەڵاتوان" لای حوزنی موکریانیش لە چلەکان بۆ زاراوەی "ڕۆژهەڵاتناس"، کەواتە بەرانبەر ئەو شرۆڤە زمانەوانیەی سەرەوە پشت ئەستوورمان دەکات.

کەواتە چۆن خودی شارەکە "پارێزەری پێدەشتی ڕەشەخاکی عیراق بووە" ناوەکەشی پارێزەری شیاو و ڕاستی نەبووە، گەر بشزانین زۆربەی نوسەرانی وەك (طبری) ...نوسەری وەك: (ڕۆژبەیانی)، دژ بە(فتوحات) دەڵێت: شاری (حەلوان) بە ئاشتی گیراوە.

٣- لە دیتنی ئاشووریەکان ناوی شارەکە - خلمنو - بووە بۆتە (خالمان)، ئینجا بۆ حلوان - هەمزە،١٧.

٤- لە لای ئەدی شێر لە (حلح) هاتووە .

٥- لای عەرەبەکانیش لە ناوی (حلوان بن عمرانی عەرەبی) ناوی قەلەمڕەوی ساسانی هاتووە، ئەو عەرەبەی لایەنگری دەوڵەتی ساسانی بوو .

حەلوان لە هەر لێکدانەوەیەك هاتبێ، ئیسلام نە تەعریب و بەعەرەبی کردووە، ناوەکەشی لە تەواوی حوکمی ئیسلامی وەك خۆی ماوەتەوە هەتا کۆربۆتەوە.

**٢- شـــارەزوور :**

(شارەزوور) هەم ناوی شار هەم ناوی هەرێم بووە . ئەبوفیدا لە (ل٤١٣) ی (تقویم البلدان) ناوی شارەزوور وەك دووەم شاری ئەقلیم جیبال دەهێنێت، ڕۆژبەیانی لە (ل٢٢) (ولاتگیری ڕەشەخاکی عیراق) لە پاش ناوی (حەلوان) ناوی شارەزوور دەنووسێت.

(شارەزوور)، لە مێژووی ئیسلامیدا، بەتایبەتی عەباسی و عوسمانی، ناوێکی دیارو ناسنامەی دەرکەوتنی چەندەها ڕوناکبیری کوردیی بووە، بۆیە هەواداارانی شیعرەکە - شیعری هورمزگان - هەوڵیانداوە ئەو مێژووە ئیسلامییەی شارەزور درێژبکەنەوە بۆ قۆناغی بەرلەئیسلامی!

ئەو دیماگۆجیەتە بە عەقلێکی ئاگا لە مێژووەوە کراوە بۆ ئەوەی وێنەکە وا لەزەینی خوێنەری سادەی کورد جێگیر بکەن و، سیفەتێکی داگیرکاری بۆ پرۆسەی ڕزگاری کوردستان، لە ژێر هەژموونی کەلتووری سیاسیی ساسانی دابڕێژن. لێرەدا، بەگرنگی دەزانین، سەرەتا لە ڕامان و فۆرمی جودای وشەی (شارەزوور) بە گوێرەی سەرچاوەکان بدوێین.

**ڕامان و فۆرمە جوداکانی وشەی شارەزوور:**

وشەی (شارەزوور) لەسەرچاوە مێژووییەکاندا ناوی (شارەزوور) بەچەندەها شێوە هاتووە، هەروەها چەندەها ڕاڤەی جیاواز بۆ وشەکە کراوە.
وەبزانم (تۆفیق وەهبی)، پێش هەر توێژەرێکی کورد لە ڕەگ و ڕیشە و

واتاکانی ناوی (شارەزوور)ی کۆڵیبێتەوە. لەو ڕووەوە لە گۆڤاری: (سۆمەر) ژمارە (٧)، ساڵی (١٩٦١) لاپەڕە (١٢٩-١٤٤) چەندەها ڕای جیاواز بۆ ناوی (شارەزوور) هێناوەتەوە، کە دەکرێ لەچەند خاڵێك کورتیان بکەینەوە:

١- (زوور)ی بڕگەی دووەم لە فارسی (رزور) بووە، بڕگەی یەکەمیش (سیا - ڕەش) بووە، وشەکە لە (دارستانی ڕەش) هاتووە.

٢- (مینۆرسکی) دەڵێ: وشەکە (شە - رزور) بووە واتاکەشی: (دارستانی پادشایەتی) دەگەیەنێ، هەروەها لە ڕوانگەی (ئاڤێستا)وەش، دوو ڕای جیاواز دەهێنینەوە بەوەی (زور)، وشەیەکی ئاوێستاییە، واتای: (ستەم) دەگەیەنێ.

کەواتە: (شارەزوور) (شاری ستەمە)ە هەروەها دەڵێ: شارەزوور لە (شەهر زەفەر) هاتووە و، (زەفەر) واتای: (هێز، چالاکی) دەگەیەنێ، هەروەها دەڵێ: (زوور) لە عەرەبی بە واتای (نزم) و (قووڵ) دێت، ئەمەش لەگەڵ سروشتی خاکناسی ناوچەکە تێکناکاتەوە!!

هەرچی مامۆستا جەمال بابانە ئەوە لە لاپەڕە (٢٣٢ هەتا ٢٣٩) چەندەها ڕای جیاواز لەسەر بنەچەو واتای وشەکە لە زمانی: (ئاوێستا، فارسی، عەرەبی، کوردی) دەهێنێتەوە.

سەرەتا ئەو "ڕا" یانە دەهێنینەوە، کە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن، کە "شارەزوور" وشەیەکی لێکدراوە.

لەم بەشەدا، زۆربەی نووسەران هاوڕان لەسەر بەشی یەکەمی وشەکە (شهر - شار)، کە (شەهر) فارسی یە و واتای شار دەگەیەنێ، بەڵام لەسەر بەشی دووەمی وشەکە (زوور) هاوڕا نیین.

هەندێك، ڕێنووسەکە ئەوها دەنووسن: (زۆر)، یان (زڕ) (زۆل) (زل) (زەر - زەهر، ژەهر) زۆربەی ئەو شرۆڤانە بەشێك لە ڕاستیان تێدایە و، گوزارشت لە سروشت و واقیعی شارەکە دەکەن، عەرەبەکان دوو لێکدانەوەی جیاواز لەوەی (فارسی) و (کوردی) بۆ شارەکە دەکەن.

یاقوت حەمەوی، کە بەوە ناسراوە دیدێکی عەرەبی بۆ هەندێ وشەی کوردی و فارسی هەیە، بۆیە لە (معجم البلدان) لاپەڕە (٣٧٤-٣٧٥) دەنووسێ: ئەو شارە،(زوری کوڕی زوحاك) دایمەزراندووە، کەواتە: کە دەگوترێ شهر زور - بە واتای: شاری (زوری کوڕی زوحاك) دەگەیەنێ - دوورنیە ئەم "ڕا" یە بۆنی (عروبە)ی لێبێ، چونکە (حەمەوی) لە ناوهێنانی چەند شارێکی کوردی، لێکدانەوەیەکی عەرەبی بۆ شارەکە دەکات، کەچی دەزانین پێش هاتنی ئیسلام، هیچ عەرەبێك لە شارەزوور نەبووە!!

هەروەها "ڕا"یەکی دی عەرەبی هەیە،کە شارەزوور لە "شهر زەوار" - شاری کاروانچی" هاتبێ، لەم بارەیەوە، جەمال بابان، شیعرێکی مەولەوی دەهێنێتەوە!

دەنگ زەیلەی زەنگ زەواری مەیۆ
دەنگی قافلەکەی جەهاری مەیۆ

"ڕا"ی تریش هەیە، کە وشەی (زور) (زۆر)، کویر-قووڵ" هەتا "زەوڕەق" بێ!

**وشەی "شارەزوور" لەسەردەمی دەقی (هورمزگان) (١٨)ی کۆچی:**

لە واتای کوردی، وشەی (شارەزوور) لە ئینسکلۆپیدیای: "بەریتانی" و "ئەمریکی" و "کامبریدج" و چەندانی تر گەڕام، وشەی: (شەهرەزوور، شارەزوورم) نەدۆزیەوە. لە نێو کوردانیش کەسانی وەك د. هەورامانی لە "مێژووی جوگرافیای کوردستان لە ئاڤێستادا" باسی زۆر شوێنی کردووە، بەڵام باسی "شەهرەزوور"ی نەکردووە!!

(ڕیچ) لە لاپەڕە (١٢٠)ی گەشتنامەکەی بۆ کوردستان لە ساڵی (١٨٢٠) دەنووسێ: " کوردەکان تێکڕا پێ لەسەر ئەوە دادەگرن، کە لە کۆندا شارێك نەبووە ناوی "شارەزوور" بووبێ، سوریشن لەسەر ئەوەی، ئەم ناوانەی ئێستاش وەك زانراوە، هەر ناوچەکە بووە."!!

(مینۆرسکی) و ئەمین نەقشبەندی و جەمال بابان، باس لەو ناوانە دەکەن، کە لە کۆندا ناوی (شارەزوور) بوونە. (ڤلادمیر مینۆرسکی) لە "لە

بنچینەكانی كورد و وتارێكی كوردناسی، وەرگێڕانی د.نەجاتی عبدالله، لاپەڕە (١٢٥)، هەتا (١٣٣) باس لە (شارەزوور) دەكات. لە لاپەڕە (١٢٧) دەنووسێ: شارەزوور (بەشێوەكی وردتر "دوزدات") لە چەند ئەفسانەی تەوراتیدا بە(ساول تاوت) یان(ساول داود) ناوی هاتووە. هەروەها (مینۆرسكی) باوەڕی وابووە، كە شارەزوور لە سەردەمی ساسانیەكاندا بەناوی: رنیم شەز ڕای - نیمڕاه" - نیوەی ڕێگەی نێوان تەیسەفۆن و ئاتەشگای شیز" هاتووە.

ئەو ڕایە زۆرێكیتر جەختیان لەسەر كردۆتەوە. هەر لەو كتێبەدا لاپەرە(١٢٩) (مینۆرسكی) دەنووسێ: شارەزوور لەمێژووی كەلیسای (نەسترویەكاندا) بە بەشێكی دێرەیی (Diorese)، یا گەرمای (Badjarmak) ناو نراوە.

هەروەها لەسەر چاوە ئاشوریەكاندا ناوی شاری(دور ئاشور) هاتووە، هەندێ دەڵێن: ئەو شارە ئاشورییە گۆڕانی بەسەر داهاتووە و بووە بە شارەزوور! كەمال نوری مەعروف لە لاپەڕە(٢٤٧)ی كتێبی" هەندێك شوێنەواری دێرین بەر لە مێژوو مێژووی كوردستان" دەنووسێ: ناوی شارەزوور، یان شارەهرەزور، كە بەسەر دەشتەكە دا وتراوە، لەوە دەچێت بۆ دوای فەرمانڕەوایەتی ساسانیەكان بگەڕێتەوە، بەڵگەش بۆ ئەمە هەتا سەردەمی ساسانیەكان، بەپێی سەرچاوە مێژووییەكان ئەو ناوە نەبیستراوە، یان لە ناو ڕووداوەكاندا نەهاتووە، بەڵكو هەر بە (نیم ئەزرا) - نیوەی ڕێگا ناسراوە".

لەمانە دەردەكەوێ، كەناوی (شارەزوور) لە چەند زمانێك هاتبێ، بەهیچ كلۆجێك پەیوەندی بەسەردەمی ئیسلامیەوە نییە، ئەو ناچەیەش لە سەردەمی ئیسلامیدا ناوی: (شارەزوور) نەبووە، هەروەها ئەم ناوە لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامیدا، لە زمانی (پەهلەوی) و شێوە زاری (هەورامی)دانەبووە، بەڵكوی ناوەكە زۆر هی دوایی ئەو قۆناغە مێژووییە. هەروەك وتمان، شارەزوور لە سەردەمی ئیسلامی: عەباسی، ئەیوبی، عوسمانی، بۆتە ناوچەیەكی ناسراو لە جیهانی ئیسلامیدا، هەتا چەندەها زاناو فەقیهە و شەرعزان لەو سەردەمە، سەدەی دوازدە و سێزدە(نەك سەدەی حەوت!!) هەڵكەوتوون و بوونەتە ناوی دیار لە مێژووی ئیسلام دا.

هەروەها لەسەردەمی دەسەڵاتی عوسمانیدا، شەهرەزوو یەکێك بووە لەو سێ لیوایەی ویلایەتی موسڵ، لەمەش زیاتر، (شەمسەدین سامی) لە قاموسی (ئەعلا می)دا، کە ئەحمەد تاقانە لە تورکیەوە وەری گێڕاوە بەناوی " کورد و کوردستان لەیەکەم ئەنسکلۆپیدیای تورکی لە مێژوو دا" لە لاپەڕە (٢١٦) دەنووسێ: "لیوای شارەزوور کراوەتە (٦) قەزاو (٨) ناحیە، قەزاکانی ئەوسا ئەمانە بوون: کەرکوك، هەولێر، ڕانیە، ڕواندز، سەلاحیە (کفری) و کۆیە (کۆیسنجەق).

بەکورتی لەسەردەمی عەباسی و عوسمانیش دا، (شارەزوور) ناوێك نەبووە بۆ "شار"ێك، بەڵکو هەرێمێکی فروانبووە، کە نزیکەی زۆربەی باشوری کوردستانی گرتۆتەوە.

لە مێژووی شاری شارەزووریش دەگەینە ئەو ڕاستیەی، کە شیعری (هورمزگان) شیعرێکی ساختەیە، چونکە هەروەك چۆن زمانی دەقەکە نوێ یە، هەروەها زۆر بەهەڵە دەقەکە لە ڕووی ئاینیەوە لێکدراوەتەوە، هەروەها ئەوسا، لە ساڵی (١٦-٢٢)ی کۆچی، شارەزوور چ وەك وشە، چ وەك ناوی شارێك لە هیچ دەقێکدا نەبووە، لە هەمووش سەیرتر، ڕۆژبەیانی دژ بە فتوحات لە (ل٢٢)ی (وڵاتگیری ڕەشەخاکی عیراق) دەنووسێت : "وەك مەندەلی حەلوان، شارەزوور بە ئاشتی داگیرکراون .." لە (ل٥٢)ش دووبارە دەکاتەوە (عیزرە کوڕی قەیس) و (عوتبەی کوڕی فەرقەد) شارەزووریان بە ئاشتی گرتووە، نەوەك بە شەڕ!!

کەواتە بانگەشەی شیعری (هورمزگان) بانگەشەی سیکیولەری کوردی سەدەی بیستە، نەك حەوتی میلادی!!

**سەبارەت بە شاری سێیەم ڕای جیاواز لای مێژوونووسان هەیە :**

أ- طبری لە (ل٤٤١)ی، (ب ٣٠) باسی هێڵی دووەم دەکات، کە لەلایەك لە تکریتەوە بەرەو (ماسبەتان) دەستپێدەکات، (تکریت- موصڵ) لە لایەکی تر .

ب- ئیبن ئەسیر لە (ل٣٦٨)ی (ب.٢) باسی هێڵی (تکریت-موصڵ) پێش (ماسبەتان) دەکات.

ت- بەلازری لە (ل١٨٢) ی (فتوح البلدان) باسی (نەهاوەند) دەکات .

ث- ئەبوفیدا لە (ل٤١٧)ی (تقویم البلدان) باسی (نەهاوەند) دەکات .

ج- مەحمود شاکر لە (١٧٥)ی (ب.٣-٤) باسی (تکریت-موصڵ) پێش (ماسبەتان) دەکات .

ح- جەمیل ڕۆژبەیانی لە (ل٢٢-٢٣) باسی (حەمرین) بەرەو گەرمیان دەکات .

خ- دکتۆر زرار لە (ل١٣) گەرمیان - شارەزوور دەکات .

دوور نیە ئەو حەوت ڕایە هەموو دروست بن، چونکە لە پاش (حلوان) قۆڵی لەشکری جیا دروستبوون .

تکریت لە ڕووی کارگێڕیەوە سەر بە (ئەقلیم جیبال) بێت، ئەوا لە ڕووی جیوگرافیەوە کوردستان نییە، بۆیە لە گەرمیانەوە دەست پێدەکەین.

**٣- گەرمیان :**

وڵاتی (گەرمیان) لە سەردەمی (فتوحات) هەم بە ناوی: (بیت گەرما) ی ناسرا بوو، هەم چەند شار و شارۆچکەیەکی لە خۆ گرت بوو. د.زرار صدیق لە (ل١٣) دەربارەی (گەرمیان) هەندێ شتی تەواو جیا لە (جەمیل ڕۆژبەیانی) بەکاردێنێت لەو لاپەڕەیە دەڵێت : "هاوکات (سعد بن ابی وقاص) فەرماندەی گشتی بەرەی عیراق، فرمانی بە ( هاشم بن عتبة)دا ڕوویکاتە دەڤەری گەرمیان، ئەویش بە یاوەری سەرکردەیەکی تر، توانی بە سەر (داقوق) و (خانیجار - خورماتوو) و (سەرپاك)ی دەڤەری گەرمیان، تا سنووری شارەزور زاڵبێت، وا دیارە ئەم هەوڵەش مایەپوچ بوو، گرتنی گەرمیان دواکەوت، تا دەوروبەری ساڵی (٢٠ك/٦٤١)."

ڕۆژبەیانی و دکتۆر زرار، هەردووکیان، فتوحاتی کوردستان بە داگیرکاری دەزانن، بەڵام ڕۆژبەیانی بە پێچەوانەی د.زرارەوە، وێنەیەکی دی گەرمیان

دەخاتە ڕوو، هەروەك لە (ل٢٢-٢٣) دەربارەی گەرمیان و شار و شارۆچکەکانی دەنووسێت: "هێزێکی دیکەی ئیسلام لای تکریتەوە ڕوی کردۆتە کوردستان لە چیای حەمرین هاتۆتە (باوەزی - بوازیج) لەوێوە بە کەناری شیوی (خاصە)ی خواروودا کە تێکەڵ بە - رۆخانە - دەبێت و زەیتون دێنێتە بەرهەم - کە پێیان ئەوت :- عیب ڕوو ئەکەنە ڕازانات = دەشتی افتخار - عەلی سەرای - و لەوێوە ڕوو دەکەنە (خویَ لێن - خۆڵنجان) توز خورماتوو و دێ کوك - دقوقا -، ئینجا کەرخینی - کەرکوك - و کەرخ جدان - قەرە حەسەن و خانیجار - قەرەهەنجیر - هەزار کانی ....ئەم ناوانە هەمووی سەر بە ئوستانی باجەرمی: بیپ گەرمای: ولاتی گەرمیان . "هەروەها ڕۆژبەیانی درێژەی بە باسەکە دەدات و دەڵێت : ئەم ولاتە بە ئاشتی گیراوە .

ناوی کۆنی گەرمیان لەوانەیە لە (با + گەرمی) هاتبێت، چونکە زۆر عەرەب /گ/ دەکەنە / ج / .

لە کوردی جاران بۆ پێوانی دوور/ درێژی وشەی (قەدەم - پێ )، ( شەقاو - هەنگاو )، ( ئەوەندە ڕۆژە )، ( گەز)... بەکاردەهات. عەرەبەکانیش لە سەردەمی ئیسلامی، وشەی ( مرحلە ) و ( فرسخ)یان بەکاردەهێنا. ئەوەی گرینگە لە نێوان دوو شار لای: (ئیبن حەوقەل و ئەبو فیدا و ئەستەخری و حەمەوی..)وشەی فرسخ - یان بەکارهێناوە. لە هەرسێ فەرهەنگی: (ئەلمونجید) و (مەورید) و فەرهەنگی (ماجد مەردۆخی)، وشەی فەرسەخ بە ٦-٨ کم داندراوە. (ئەلمونجید) لە (ل٦٢٩) ئاوا وەسفی فەرسەخ دەکات : "قۆناغێك / فرسەقێك ڕێگا کە نزیکەی سێ میلی هاشمییە، دەوترێت: (١٢) هەزار گەزە، نزیکەی (٨)کیلۆمەترمیە." (مەورد) لە (ل٨٢١) فەرسەخ بریتیە لە: درێژی پێو . هەرچی ماجد مەردۆخیە لە (ل١٠٠٠) ی فەرهەنگەکەی دەنووسێت : فرسەنگ مەودایەکی مێژینەی ڕێگایە بەرانبەر بە (٦) کم."

**٤- مــەرگە:**

لە زۆر لە کتێبە مێژوویەکان دا ناوی ( مرج - مرجە ) یا (مرکە ) هاتووە. ڕۆژبەیانی لە (ل٢٨)ی پەراوێزەکانی وڵاتگیری ناوی ئەوها دەهێنێت: "مەرگە ناوچەیێکی بەناوبانگی سەر بە (ئۆستان)ی سلێمانییە، بە ناوی عێلی مەرگەوە."

(واقدی) لە (ل٢٠) وا ئاماژە بە (مەرگە) دەکات، کە نزیك بێ لە: (هەرمووت و میرزا ڕۆستەم و پشدەر...)"

بابان لە (ل٢٧٧) دەڵێت: (مەرگە) گوندێکی کۆنە لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامی بەناوی (مرجین) هاتووە، لە دەڤەری پشدەر چەند میرێکی کورد بەناوی فروخ ( فەروخ )و دانیکۆر و هشتر (ئەژدەر) حوکمیان کردووە ."

ڕۆژبەیانی لە (ل٤٠-٤١) دەڵێت : ئەو سێ ناوە، تەنیا لە لای (واقدی ) و (مەلا رەئوف) هاتوون، ئەگەرنا هیچ ئاغا و میرێك بەو سێ ناوە لە سەردەمی فتوحات نەبوونە ." لەوانەیە هەبووبن، بەڵام ئاغای ستەمکار و زۆرداری دەسەڵاتی ساسانی بوونە.

لەوانەیە وشەی (مەرگە) کرابێتە (مرجین) یا (مرکە). گرینگ گۆڕینی وشەکە نییە، بەڵکو وشە کوردیەکە بە فۆنەتیکی عەرەبی خوێندراوەتەوە . بە عەرەبیکردنی وشەی کوردی ئەوهایە: کەرکوك بکرێتە (تأمیم)، نەك مەرگە بکەیە (مەرکە)، یا مرجین، چونکە /گ/ لە عەرەبی نییە.

**٥- مــاسـبـتـان:**

ئەو شارە بە قسەی مەحمود شاکر لە (ل١٧٥) دەکەوێتە لای ڕاستی - حلوان لە سەر ڕێگا بەرەو هەمەدان . لای (ئەبو فیدا) شاری (ماسبتان) شاری سیروان -ە-مامل (ل١٣٥). وشەی: (سیروان) بەڕای جەمال بابان (١٩٨٩)، (ل١٧١) لە دوو وشە پێکهاتووە : سێ + روان ( جۆگە)، ڕوبارێك لە ناوچەکە هەیە بە ناوی ڕوباری سیروان - ڕوباری تورنات-ە." قەزوێنی لە (ل٢٦٠)ی ئاساری بیلاد(ماسبتان) سیروان نیە، بەڵکو دەکەوێتە نزیك سیروان .

**٦- نەهاوەند**

پێش هاتنی ئیسلام شاری نەهاوەند، ناوێکی تری هەبووە . ڕۆژبەیانی لە (ل٢٢) دەڵێت : "نەهاوەند، شاری نارەوەن بووە."

(واقدی) و (طبری) و (ئیبن ئەسیر) و (بلازری) باسی ئەوە دەکەن، کە چۆن شەڕی (مەدائین)، ڕێگە خۆشکەر بووە بۆ (جەلەولا) و (حلوان)، بەهەمان شێوەش شەڕی نەهاوەند ڕێگە خۆشکەرێك بووە بۆ هەمەدان ...

(لسترنگ) لە (ل٢٣٢) و (ئیستەخری) لە (ل١١٨)، نەهاوەند هەم نزیکی هەمەدان بووە . دەوترێ: ناوی شارەکە لە (نوح + اوند) هاتووە و بەهۆی گۆڕانی وشەوە بۆتە نەهاوەند، کەواتە وشەکە بە قەد تەمەنی مرۆڤ کۆنە، ئەو ناوەش وەك خۆی ماوەتەوە.

**٧- قرمیسین - کرمنشاه - بەختەران - قەهرمان:**

شاری (کرمنشاه) کۆمەڵە ناوێکی لە خۆ گرتووە، کە هیچیان کوردی نیین. (سوخابی)، لە (ل١٥١) ناوی کۆمەڵە کۆنیارناسەك دەهێنێتەوە لەوانە: (هێرتسفیلد و ژۆرژ کامیرۆن و ۆلفرام کلایس....)،کە ناوی شاری (کرمنشاه) لە دەوری لولییەکان و گووتییەکان و عیلامییەکان ناوی بە - (ئالیپی)، یا (ئاڵیبی) هاتووە.

لە کۆندا شارەکە بە سێ ناویتر ناسرابوو، کە بریتی بوون لە فۆرمی جیا و نزیك لە یەك: قرماسین، قرمیسین و قرماشین( ئەبو فیدا و ئیبن فەقیە ...) هەرچی ناوی (کرمانشاه)یە کەلسومە (ل٢٣-٤)ی ماستەرنامەکەی لە (ل٤٨ی) (ئەصفەهانی) دەگوازێتەوە، کە (بەهرامی شاپور) کە ئەو دەمەی والی کرمان بوو.وەك بەلازری لە (ل٢٣٤)ی (فتوح البلدان) و ئیبن حەوقل لاپەڕە (٢٦٦-٢٧٤) تەرخانکردووە بۆ کرمان .

( مامل) (٢٠١٤) لە (ل١٣٣) لە ئەبو فیدا دەگوازێتەوە، کە ئەو شارە دەکەوێتە نێوان حلوان و هەمەدان و نزیکە لە شاری (دینەوەر) بە دووری سێ فەرسەخ / ١٨کم." کەلسومە لە (ل٢٣)ی ماستەرنامەکەی لە (ل١٩٥)

(مختصر البلدان)ی ئیبن فەقیە دەگوازێتەوە، کە (قرماسین) وشەیەکی فارسیە، واتای: (کرمانشاه) دەدات .

ئەو ناوانە هیچیان کوردی نین، هەروەها دەسەڵاتی لە ڕووی کارگێڕیەوە ناوەکەی کردبووە: ( بەختەران ) و( قەهرەمان )، ئەو دوو ناوەش هەر کوردی نین!
جا موسڵمانەکان ناوی ( کرمانشاه ) یا (قرمیسین)-یان بەکارهێنابێت، دوور و نزیك پەیوەندی بە بەعەرەبکردنی وشەی کوردی نییە.

**٨- دینەوەر :**

شاری (دینەوەر) هێندە لە (کرمانشاه) دوور نییە . ئیبن حەوقەل لە (ل٣٠٨) ناوی (دینەوەر) لە تەك ناوی (قرمیسین - کرمانشاه) دەهێنێ هەروەها لە (ل٣٠٦-٣٠٧) دەڵێت: ڕێگا لە (هەمەدان)ەوە بۆ (دینەوەر) هەیە ." یاقوت حەمەویش لە (ل٥٤٥) دەڵێ: نێوان ئەو دوو شارە (٢٠) فەرسەخ/١٢٠کم ." هەرچی ئیبن حەوقەلە لە (ل٣٠٨) دەڵێت : لە نێوان ئەو دوو شارە (٢٠) فەرسەخ و نیوە، بە واتای: (١٢٣)کم لە یەك دوورن . لە بارەی دووریەکەی نێوان هەمەدان و دینەوەر لە ماستەرنامەکەی: (کەلسومە) و (میرزا) و (مامل) ...نووسراوە (١٢٠کم)، بە واتای: تەنیا جەخت لە سەر ڕای (ئەبوفیدا) کراوە، نەك ئەبو فیدا و ئیبن حەوقەل .

دەگوترێ: وشەی (دینەوەر)، وشەیەکی لێکدراوە لە ( دین ) + (وەرگر ) بە واتای: دین وەرگری زەردەشتی .

گەر ئەو شارە هەڵگری ناوێکی زەردەشتی بێ، کارگێڕی دەوڵەتی ئیسلامی، ناوی شارەکەی بە هیچ جۆرێك تەعریب نەکردووە، هەر دینەوەر-ی بەکارهێناوە.

**٩- هەمەدان:**

گەر شاری (حلوان) یەکەم شاری (ئەقلیم جیبال) بێت، ئەوا لە ڕووی گەورەییەوە و جیۆگرافی لە شارە گەورەکانی ئەقلیم جیبال-ە. ئەبولفیدای ئەیوبی لە (ل٤١٧)ی (تقویم البلدان) دەڵێت : حلوان (٦٧) فەرسەخ / (٤٠٢کم) لە هەمەدان دوورە."

هەموو ئەو نووسەرانەی لە سەر حوکمڕانی (میدیا)یان نووسیوە، باسی پایتەختی ئەو حوکمڕانیە بە (ئەکباتان) دەکەن .دکتۆر ئەحمەد میرزا (١٩٩٥) لە (ل٣٩)ی ماستەرنامەکەی، لە (قەلقەشندی) دەگوازێتەوە، کە شاری هەمەدان دەکەوێتە ناوەندی ئەقلیم جیبالی غەربی .
بەلازری (ل٨٦-٨٨)تایبەت کردووە بە فەتحکردنی (هەمەدان)، لە بەرایی دەڵێت: (موغەیرەی کوڕی شوعبە) لەساڵی (٢٣)ی کۆچی بەرەو (هەمەدان) چوو، خەڵکی دەڤەرەکە لە بەرایی، شەڕیان لەگەڵ کرد بە شێوەیەك چاوی بە تیرێك پێکرا . دوایی هەمەدانی بە سوڵح فەتح کرد.
یاقوت حەمەوی دەڵێت: هەر لە دێرینەوە ئەو دەڤەرە هی کوردان بووە، ئەحمەد خەلیل لە (ل١٣٩) دەبێژێت: (هەمەدان) بڕبڕەی پشتی پەهلەوییەکان بووە . (سیوتی) لە (تأریخ الخلفاء) دەڵێت : هەمەدان لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب لە (٢٢)ی کۆچی فەتح کراوە.

ئیدریس دۆسکی (٢٠٠٦) لە (ل٣٩-٤١) ی ماستەرنامەکیدا لە (یاقوت حەمەوی) و (لسترنگ) ...دەگوازێتەوە، کە ناوی (هەمەدان) لە بنەڕەتدا (هەمەدانە)، نەك (هەمەژانە)، چونکە فارس هەندێ جار / ذ / دەکەنە / د / هەروەك لە وشەی هەمەدان دا ." بەلازری لە پەراوێزی (ل١٨٧) باسی شوێنێك دەکات بەناوی ( سیسر ) کە هاوتخوویی هەمەدان بووە و کەوتۆتە نێوان (هەمەدان و ئازەربایجان)، ژمارەیەکی لە ( کانی ) لێبووە، ئەو شارەش لە سەردەمی ئەمینی کوڕی هارۆنە ڕەشید دروستکراوە ..." وەك وەلایەك بۆ فارس و کورد .

لە پرسی ناوی (هەمەدان) میسۆلۆژیا و مێژوو دەور دەبینن، بۆ نموونە: ئیدریس دۆسکی دوو نموونە لە میسۆلۆژیا و مێژوو دەهێنێتەوە، کە هیچیان

قەبووڵکراو نیین:

١- ئەفسانە و میسۆلۆژیا دەڵێن: لە ناوی نەوەیەکی (نوح) پێغەمبەر هاتووە بە ناوی (همدان بن الفلوج بن سام بن نوح) ...ئەمە ڕای (ئیبن فەقیە) بوو، یاقوت حەمەویش ناوەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ (جم بن نوجهان....بن سام بن نوح)!

٢- پێکچوونی ناو لە دوو جیوگرافیای جیاواز، بۆ نموونە: (دۆسکی) لە (سەمعانی) دەگوازێتەوە، کە ناوی (هەمەدان) لە ناوی ئاغایەکی قەبیلەیەك لە یەمەن هاتووە بە ناوی (همدان بن مالك بن زید...قەحتانی)، هەر (دۆسکی) ئەو ڕایە هەڵدەوەشێنێتەوە بەوەی، ناوی ئەو کابرایە هیچ پەیوەندی بە(هەمەدان) ەوە نییە، چونکە عەرەب لە سەردەمی (فتوحات) لە ناوچەکە نەبوون" هەروەها زۆر پێشتر ناوی (هەمەدان) هەبووە .

ناوی (همذان) لە فەرهەنگەکانی ( معجم المعانی الجامع - معجم عربی عربی و قاموس المعانی. قاموس عربی عربی) بە واتای خۆش ڕۆیشتن، خێرا ڕۆیشتن، دێت.

وشەکە لە فارسی بە (هەگمتان)ە، بە ئازەریش پێی دەوترێت: (ئاقبەتان) (ڕایەخی سپی). (هەمەدان) ئێستا، گلکۆی بابەتاهیری هەمەدان و (ئیبن سینا)ی لێیە - ئەنتەرنێت.

لێرەدا دەمەوێ بڵێم: نە (ئەکباتان) کوردیە نە (هەمەدان) عەرەبیە، بەڵکو هەردووك فارسی و ئازەرین، هەردوو ناوی ئەکباتانی سەردەمی (میدی)، هەروەها هەمەدانی سەردەمی (فتوحات) لە نووسینی کوردی هەن .

ڕاستە لە (هەمەدان) کوردێکی زۆر هەیە، بەڵام لە کاتی حوکمڕانیەتی کوردی، ناوی: (ئەکباتان) بووە، بەڵام ئەوەی ناوەکەی گۆڕیوە لە (ئەکباتان بۆ هەمەدان - همذان یا ئاقباتان)، موسڵمانان نەبوونە، بەڵکو ئەشکانی و ساسانی و ئازەری بوونە !

**١٠- شاپوور خواست - خورەم ئاباد:**

(شاپوور خواست) یەکێك لە شارەکانی (ئەقلیمی جیبال)ە. ئەو شارە لە ساڵە بەراییەکانی دەوڵەتی ساسانی لە لای شاپوری یەکەم (٢٤١-٢٧٢) دروستکرا. (لسترنگ) لە (ل٢٣٧)ی (بلدان الخلافة الشرقیة) لە سەردەمێکدا ئەو شارە کۆربۆوە." (سورخابی) لە (کتێبی مێژووی شوێنەوارناسیی...) (خورەم ئاباد) ناوەندی پارێزگای لورستانە هەروەها لە (ل٢٤٦) دەنووسێت: چەندان شوێنەوار لە (خورەم ئاباد) هەن لەوانە: قەڵای (فەلەکول ئەفلاك) لە ناوەندی شاری (خورەم ئاباد) و لە سەر گردێکی مێژوویی و سروشتی هەڵکەوتووە ."

**١١-** کۆمەڵە شارۆچکەیەکی وەك: (ئەسەد ئاباد و بروجرد و قصر اللصوص و سەهرود) - ئیبن حەوقەل لە (ل٣٠٤-٣١٧) چەند شارۆچکە و شوێنی تر، وەك: (روزراور، صحنە، ڕامن،کەرەج، بێستون، صیمرە، ئەشتر، لوڕ....) ئیبن حەوقەل بە فەرسەخ نێوانی ئەو شوێنانە دیاردەکات.

# ئەو شارانەی ئەقلیم جیبال کەباس نەکراون

مەلا عبدالعزیزی واعیزی، کە سیپارەکەی (واقدی) لە عەرەبی کردۆتە فارسی، لە دیپاچەی سیپارەکەدا، (ل٢٠) دەنووسێت : (لەشکری ئیسلامی لە شارۆچکەکانی: (پژدەر و سلێمانیەوە بەرەو سابلاغ و لەوێوە بۆ ئورمیە و، هەروا بۆ بانە و هەموو وڵاتی ئازەربایجان ...)هەمووی بە ئاشتی و بەبێ شەڕ خرانە ژێر دەستی موسڵمانەکان).

ئەوە تەنیا (واقدی) و (واعیزی) و (مەلا رەئوف)ن، کە بەبێ سەرچاوە باس لەو شارانەی کوردستان دەکەن ، بۆیە ناوی هەندێ شاری ئەقلیم جیبال دەهێنین، شارەکانیش بریتین لە :

## ١- سنە - کوردستان:

سنە شارێکی کۆنیاری کوردییە .عوبەید سورخابی (٢٠١٣) لە (ل١١٨) ی (مێژووی شوێنەوارناسیی ڕۆژهەڵاتی کوردستان) دەنووسێت: " وڵاتی (ماد-میدیا) لە سەردەمی: (هیخامەنێشیەکان - ئەخمینیەکان) بەولاوە - سلوکی و ئەشکانی و ساسانی- بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی ئێرانی بووە و زۆر جار بەناوی - ماە- ناوی هاتووە . ئەم هەرێمە بە دوو بەشی - ماهەی خواروو(مادڕازی ) و - ماهەی سەروو(ماد نەهاوەند دابەشکراوە ."

ئەم شارە لە سەردەمی حوکمداری ئەشکانییەکان بە ناوی وڵاتی پەهلەوییەکان بەناوبانگ بوو. لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامییشدا، ساسانییەکان پێیاندەووت:

(قەهوەستان)، موسڵمانەکانیش کردیانە (الجبال)، کوردیش لە لای خۆی لە (قەهوەستان) و (جبال) کردیانە (کێوستان).

**سەبارەت بە ناوی کوردستان سێ پرس هەیە :**

١- کوردستان وەك ئەقلیم.
٢- کوردستان وەك ناو.
٣- کوردستان وەك پارێزگا .

سەبارەت بە خاڵی یەکەم، سەلجوقیەکان وڵاتی کوردستانیان هێندە بچووککردەوە، کە ناوی کوردستانیان لە "قەڵازێویەی سەقز، ئەشکەوتی کەرەفتوو، گوندی قاپلانتو، بەردەنووسی تەنگیوەر، گردی تیانە و گردی توبرە بزە..." (سورخابی، ل١١٩)، جگە لە گوندەکان، (سنە) ناوەندی پارێزگایە و شارۆچکەی وەك: (سەقز، بیجار، قوروە، مەریوان، بانە، دیواندەرە وکامیاران) دەگرێتەوە.

ئەم پارێزگایە هاوتخوویە دەگەڵ پارێزگای (کرمنشاە) و هەمەدان و عیراقی عەجەمی..

ناوی کوردستان، لە سەدەی سێزدەی میلادەوە سەریهەڵداوە، هەروەها لەو سەدەیەدا بۆتە زاراوەیەك لە شیعری سلجوقی، بەڵام کە دەوترێ: لە سەدەی یازدە بەکارهاتووە، (ئارشاك پۆلادیان) نە لەو لاپەڕەیە، نە ناوی کتێبەکەی بە کوردستان نەهێناوە.

هەروەها دەوڵەتی ئێرانی، لە شەستەکانی سەدەی بیستەم، ناوی کوردستانی لە پارێزگایەك نا.

## ٢- مەهاباد - ساپلاغ:

وشەی (مهاباد) وشەیەکی فارسیە و لە دوو وشەی ( مە ە ) و (ئاباد) پێکهاتووە .ماجد مەردۆخی لە (ل١٣٢٢)ی (فرهنگ فارسی - کردی) دوو واتای سیمانتیکی و میتافۆری وشەی - مەە - دەنووسێت : "(مەە) سووکەڵەی مانگ، هەروەها (مەە )مانگ زۆر جوان، وەکو مانگ" کەواتە وشەی - مەە - بە سیمانتیکی و میتافۆری، واتای: مانگ دەدات .

ئازاد دێرك لە (ل٨٦)ی (مدن كردية) لێكدانەوەیەكی جیاواز بۆ ناوی مهاباد دەكات و دەنووسێت : گوتەی - مها - لە هندیش (مهاتما) بە واتای: گیانی پیرۆز دێت!!

لە (ل٥)ی هەمان فەرهەنگ، دەربارەی - ئاباد - دەنووسێت: ئاوا، ئاوەدان..." كەواتە: مەهاباد واتای: ئاوایی مانگ - مانگاوە، ئاوایی قەشەنگ. هەژار موكریانیش لە (ل٨٢١)ی فەرهەنگی (هەنبانە بۆرینە) دەڵێت : "مەهاباد شارێكە لە كوردستان بەرێ ناوی سابڵاغ بوو ."

بە شرۆڤەكردنی موكریانی بێت، ناوی (سابڵاغ) پێش ناوی مەهاباد هەبووە، سابلاغ-یش بە واتای - كانی سارد دێت - (دێركی، ل٨٦ ).

هەردوو وشە كوردی نیین، (سابڵاغ) وشەیەكی عوسمانییە و، مەهاباد وشەیەكی فارسیە.

**٣- ورمێ یا ئورمێ:**

(ورمێ) لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامیش، شارێكی تەواو كوردی نەبوو. شاری (ورمێ) هێندە كۆنە، هەتا لە كتێبی پیرۆزی نەصرانیان هاتووە، هەروەها شاری لە دایك بوونی زەردەشتیان بووە .

شارەكە بە دەریاچەیەك مەشهورە بە ناوی دەریاچەی (ورمێ)، ئاوی دەریاچەكە خوێاویە، كە گەورەترین دەریاچەی (شرق الأوسط)ە .لە (ل٨٠)ی (وڵاتگیری...) بە خوێندنەوەیەكی ئەفسانەئامیزی، باسی گرتنی ئەو شارە لە سەردەمی خەلیفە عومەر دەكات و، ناوی دوو سەحابەی وەك: (خالید و ئەنەسی كوڕی مالك) دەهێنێت، كە كەسیان چاویان بە كوردستان نەكەوتووە .

**٤- ئیـــلام:**

(ئیلام) لە كۆندا زۆر بەناوبانگ بوو، هەتا پەیوەندی بە (بابلی) و (ئاشووری) هەبووە. سورخابی (٢٠١٣) لە (ل٢٦٤-٢٦٥) دەنووسێت : لە بەڵگە كۆنەكانی (بابیلیدا)ناوی: (عیلام) بە-ئالامتۆ - یا (ئاڵام) هاتووە، كە بە ڕای

هەندێك لە مێژوونووسان مانای کوێستان، یا وڵاتی خۆرهەڵاتە. " لە ماوەی حوکمڕانیەتی (ماد)دا (٧٠٠-٥٥٠ پ.م). جیوگرافیای دەڤەری (عیلام) ببووە دوو بەش: بەشی یەکەم :بەشی باکوور لە ژێر دەسەڵاتی (مادەکان) و، بەشی باشوور لە ژێر دەسەڵاتی (پارسەکان) - ئەشکانیەکان بوو.

(سورخابی) لە هەمان لاپەڕەدا دەنووسێت : لە سەردەمی (هێخامەنێشیدا) بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی ئێران بوو . لە سەردەمی ساسانییەکاندا (عیلام) بەشێك لە ویلایەتی (پەهلە) بوو،کە دوای هاتنی عەرەبەکان بۆ ئێران بەویلایەتی (جیبال) نێودێر کرا.."

(فەرامەرز ئاغا بەیگی) لە (ل٩٤)ی (کورد لە سەفەرنامەکاندا) دەڵێت : کۆمەڵگای (ئیلامی)، کۆمەڵگەیەکی تەبەقی بوو، پلەی کۆمەڵایەتی وەك: ئیلخان/ خان / ئاغا، کەیخودا، ڕیش سپی یە."

## ٣- ئەقلیم جەزیـرە:

زۆربەی هەرێمی (جزیرە) لە زەمەنی نەوشێروانەوە بووە ساسانی.

نەوشێروان پەروێز بە سوپایەکەوە بەرەو ڕۆم چوو، بەتایبەتی هەرێمی جەزیرە، شارەکانی ئەوێی گرت، هەتا (فورات)، لەوێوە بەرەو شام پەڕیەوە، شارەکانی: (حەلەب و قنسرین و حمص و ئەفامیەی گرت) - (نصیر الکعبی ٢٠٠٨، ل١٢٧).

ئەقلیمی جەزیرە، سێیەم ئەقلیمی کوردی بوو لە کوردستانی ساسانی .

ئەقلیمی جەزیرە، سەد لە سەد ئەقلیمێکی کوردی نەبوو، لە سنووری ئەو ئەقلیمەدا، عەرەبیش هەبوو، بە تایبەتی عەرەبی ڕەوەند. ئەقلیمی جەزیرە لە سنووری: تکریت، هەتا شاری (ڕەقە) دەگرێتەوە، لە باکوورەوە، هەتا دیار بەکر و سەرچاوەی دجلە، لەسنووری ڕۆژهەڵاتەوەش ڕووباری دجلە و هەولێر و کەرکوك خراونە سەر ئەو ئەقلیمە، هەروەها لە ڕۆژئاوای فوراتەوەش (سمیات - نادیمان) لە دیار مزرەوە و سنووری دیار بەکر لە دەروازەی باشووری موزیقی

بدلیس، هەروەها درێژدەبێتەوە، هەتا ویلایەتی (سەعرەد) و ناوچەی بۆتان...

ئەو ئەقلیمە زۆر فراوان بوو، ئێستا هەولێر و کەرکوك و دهۆك و شارۆچکەی شێخان و تلکیف و حەمدانیە و ناحیەی زمار و قەزای سنجار و جەزیرەی حەسەکە و ماردین وئۆرفا و ئادیمان و دیار بەکر و باتمان و سەعرەد و شەرناخ دەگرێتەوە..(عەبدلرەقیب، ٨٦) ."

عەبدلرەقیب یوسف لە (ل٩١-٩٢) لە (ل١٣٦-١٥١) لە (مقدیسی) دەگوازێتەوە، مەقدسی، هەرێمی جەزیرەی بە ئەقلیمی: (ئاقور - ئەقلیمی ئاشوور) دادەنا، ئەو ئەقلیمەش دەکەوێتە نێوان: عیراق و شام."

ئەقلیمەکە وەك ئەقلیمی (جیبال) نەبوو، بەشێکی بە دەست ساسانیەکانەوە بوو، بەشێکی بە دەست ڕۆمەکانەوە بوو، هەرچی بەشی تری بە دەست ئەرمەنیەکانەوە بووە.

### ئەو شارانەی ئەقلیمی جزیرە، لە بندەستی ساسانی و ڕۆمی بوو:

عەبدلرەقیب یوسف لە (ل٨٣) دەنووسێت : "هەولێر و کەرکوك و شەهرەزوور، بە ئەقلیمی جزیرە لکێندرا، لە سەردەمی هارونە ڕەشید (٧٨٦ - ٨٠٩ م) . شەهرەزوور لە موصل دابڕا و بووە ئەقلیمێکی سەربەخۆ ." سنووری عیراقی عەرەبیش، هەتا چیای حەمرین مایەوە !

**شارە ناسراوەکانی ئەقلیمی جزیرە بریتین لە :**

### ١- هەولێر - ئەدیاب:

زۆربەی شوێنەوارناسەکان دەڵێن: شاری هەولێر، کۆنترین شاری سەر زەوییە. فوئاد قزانجی (٢٠١٠) لە (ل٢٢-٢٦)ی کتێبی (مدن عراقیة عبر التأریخ) دەنووسێت: (لە کۆتایی سەدەی یەکەمی پێش میلاد لە باکووری ڕۆژهەڵاتی عیراق، لە ناوچەی حەدیاب، کە یۆنانی و ڕۆمانیەکان پێیان دەگوت: (ئەدیابین)، مەملەکەتێکی ئارامی، کە پێکهاتبوون: لە ئارامی و گەلانێکی میسۆپوتامیا و

فارس، پێکهات ."

لە ماوەی دامەزراندنی دەسەڵاتی ئەشکانی، شارەکە لە بندەستی (سلوکیە) یۆنانیەکان دەرهێنرا. ئەو شارە لە ماوە بۆ ماوەیەکی تر، ببووە گۆڕەپانی ئەشکانی و بێزەنتی. جەمال بابان لە (ل١٧-١٨) ی (اصول اسماء المدن...) (کاراکالای) ئەمپراتۆری ڕۆمانی، پاش گەڕاندنەوەی لە (تەیسەفۆن) شاری هەولێری داگیرکرد.

میانڕەوی مەملەکەتەکە وەیکردووە، هەم خۆی لە زەردەشتی بپارێزێ، هەم وەسەنیەتی ڕۆمەکان. هەر لە بەرایی سەدەی یەکەمی میلادی، شای مەملەکەتەکە بۆتە یەهودی.

هەر لە سەردەمی دامەزراندنی ساسانی، ئەردەشێر دەستی بەسەر ئەو مەملەکەتە داگرتووە. لە حەفتاکانی ساڵی (٢٠٠) هەتا بەرایی سەدەی (چوارەم) مەسیحیە نوێیەکانی (ئەدیاب) تووشی هیچ چەوسانەوەیەکی دینی نەبوون .

کەلسومە لە (لا ٨٥) دەڵێت: مەسیحیەکان لە لایەن دەسەڵاتی ڕۆمی وەسەنی دەچەوسانەوە، بەڵام هەرکە لە ساڵی (٣١٣) (قوستەنتین) بووە مەسیحی، کە تەواوی مەسیحیەتی گۆڕی، (کریستنسین) لە (ل٢٥٤) ئێران لە سەردەمی... ساسانیەکان تەواو بەرانبەر مەسیحیەکانی ناو ئیمپراتۆریەتی ساسانی (٣٤١-٣٧٩) بە سەرکردایەتی (شاپووری دووەم)، کەوتنە چەوسانەوەی مەسیحیەکان .

ساسانیەکان کە دوا دەسەڵاتی زەردەشتی بوون، هەتا ساڵی (٦٣٠)ی میلادی، ماوە بە ماوە خەریکی کوشتنی مەسیحیەکانی هەولێر بوون .

(لستنرانگ) لە (ل١٥٠)ی (بلدان ...) دەنووسێت: ((هەولێر بووە شارێك لە شارەکانی هەرێمی جەزیرە .

لە پرسی شاری هەولێردا، گرینگە تەقسیماتی کارگێڕی و شوێنی جیوگرافی لەیەك جیابکەینەوە . موحسین مامل (٢٠١٤) لە (ل١٢٩) ماستەرنامەکەیدا لە (ئەبوفیدا) دەگێڕێتەوە، کە شاری هەولێر کەوتۆتە ڕۆژئاوای هەرێمی چیا - ئەقلیم - جیبال و لە سەردەمێکدا بنکەی دەڤەری شارەزوور ."

شاری هەولێر لە ڕووی جیوگرافیاوە، کەوتۆتە ئەقلیمی جیبال، بەڵام لە ڕووی

تەقسیماتی کارگێڕییەوە (لسترنگ) و دکتۆر جەمال رەشید و زۆرانی تر، بەشێك بووە لە ئەقلیمی جزیرە.

بە ڕای شوێنەوارناسەکان، کە ناوی شاری (ئەربل) لە (ئەربائیلۆ) هاتووە، وشەی (ئەربیل) چەند گۆڕانکاری فۆنەتیکی تێدا ڕوویداوە، لە (ئەربائیلۆ) وە بۆتە (ئەربیل) ... هەولێر.

ئەبو فیدا لە (تقویم البلدان) ئاماژە بەوە دەکات، کە ناوی (ئەربل-هەولێر) لە سەردەمی (فتوحات) نەهاتووە، لەو ڕوانگەوە دوور و نزیك، (ئەربل) هیچ پەیوەندی بە تەعریب و عەرەبکردنەوە نییە.

## ٢- موصــڵ

(موصڵ) پێش فتوحاتی ئیسلامی بە ناوی تر ناسراو بووە : (زەینەفۆن) لە کتێبەکەیدا بەناوی: - مسبلا - ناوی بردووە، هەرچی ئاشوریەکانن بە ناوی: (مشبالو) ناویان بردووە _ (بابان ١٩٨٩،ل٢٨٧) .
ئیبن ئەسیر باس لەوە دەکات کە (موصڵ) دوو بەش بووە: نەینەوا و موصڵ.
کتێبەکانی سەردەمی ئاشووری و (میدی) نەینەوایان بە پایتەختی ئاشووری دەزانی. بەلازری لە (ل١٩٩) ی (فتوح البلدان) ناوی موصڵ دەهێنێت و دەڵێت: لە موصڵ چەند دیارێك (وارنشین) هەبوو بە صوڵح موسڵمان بوون، هەروەها لە پاش موصڵ، گوند و قەڵاکانی کورد وەك: (باهەزرێ، باعەزرێ و داسیر - داسنیا و حەزە -) نزیك هەولێر بەدانی (جزیە) تەسلیم بوون و وازیان لە بەرەنگاری هێنا .
ڕۆژبەیانی لە (ل٢٣)ی (ولاتگیری)، هۆکاری ئەو خۆبەدەستدانە و صوڵحکارییەی کوردەکانی: "هەولێر و موصڵ و هەکاری ...لە بەر ستەم و بەدکرداریی دەسەڵاتی ساسانی، نەك هەر بە ئاشتی خۆیان داوەتە دەست،بەڵکو بوونەتە پشتیوانی سوپای ئیسلامی."
(کریستینسن) لە ئێران لە سەردەمی ساسانیەکاندا دەڵێت : شاری موصڵ بە

(نو-ئەردەشێر) یا (بواردشێر) بەناوبانگ بوو ." بابانیش (١٩٨٩)، (ل ٢٨٨) دەڵێت : موصڵ لای نەصارا کۆنەکانی موصڵ، بە قەڵای (عبرایا) بەناوبانگ بوو .

لە رووی زمانەوە، رەنگە ناوی موصڵ لە ناوی پادشایەك، یا پردی گەیاندنی: جەزیرە و عیراق، دجلە و فرات، سنجار و حەدیسە هاتبێ، هیچ پەیوەندی بە عەرەبکردنەوە ونییە، چونکە یاقوت حەمەوی دەڵێت : ئەوەی ناوی موصڵی داهێنا:(راوەند بیوراسف ئزدهاق) بوو .

بەلازری لە (ل١٩٩) دەڵێت : "لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامی، موصڵ بریتی بوو لە: قەڵایەك و کەنیسەیەکی نەصارا و گەرەکێکی جوو، خانووی تێدا زۆر کەم بوو، (هەرسەمەی عەرفەجەی بارقی) گەرەکێك و مزگەوتێکی بۆ عەرەبە موسڵمانەکان دروستکرد، چونکە ئەو سەحابیە، پاش لادانی (عوتبە)، بە فرمانی عومەری کوری خەتاب بووە والی موصڵ ."

خەسرەو گۆران (٢٠٠٢) لە (ل٦)ی کتێبی (کورد لە پارێزگای مووسڵ دا) هەبوونی کورد لە مووسڵ، بە دەوروبەری موسڵ دەبەستێتەوە ." کەچی (بەلازری) لە (ل١٩٩) دەڵێت : لە موسڵ چەند وارنشینێك هەبوون ...لە پاشان یەکسەر باسی مێرگ و گوند و زەویەکانی: (باعەزرێ و داسیر - داسنیا و قەڵاکانی کورد.....)دەکات .

هەر خەسرەو گۆران لە (ل٦) لە کتێبی ئەبی زەکریا ئەزدی (تأریخ الموصل) دەگوازێتەوە، کە سنووری دەوڵەتی مەروانی (٩٩٠-١٠٩٦) کوردی لە باکور و باشور، کوردستان، تا موسڵ بووە. بەشی رۆژهەڵاتی موسڵ، بەشێکی جیانەکراوەی باشووری کوردستانە.

ژەنیرال (ساندرس) لە ئاهەنگی کردنەوەی پردی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوای موسڵ( کە لە سەردەمی فتوحات بەنەینەوا و موسڵ ناویان هاتبوو لای ئیبن ئەسیر )ووتی: پردی جیاکەرەوەی کوردستان لە عیراقە-(د.بۆتانی ل١٤-١٦ی مدرسه ١١ ازار -)

کەواتە بەشێك لە موسڵی ئێستا، باشووری کوردستانە، ناوەکەی وەك

سەردەمی ئاشووری وەك خۆی ماوەتەوە.

### ٣- هەکارک :

(هەکاری) ناوێکە، (واقدی) و (طبری) و (بلارزی) قسەیان لە سەر نەکردووە . لە سەدەی سێزدەی میلادیەوە بۆتە بابەتی بولدانی و مێژوونووسەکان .یاقوت حەمەوی لە (ل٤٠٨)ی بەرگی پێنجەم دەربارەی شاری (هەکاری) دەنووسێت: "شارۆچکە و دێگەورەیەکە، دەکەوێتە سەروو موصڵ لە هەرێمی جەزیرەیە، کوردی لێنیشتەجێن."

ئیبن ئەسیر لە (ل٣٩٠،ب.٢) ئاوا باسی (هەکاری) دەکات، وەك بڵێی هەرێمێکە نەك شارۆچکەیەك : "ویلایەتێکە چەند قەڵا و گوندێك لە خۆ دەگرێت و سەر بە موصڵە." دکتۆر دەروێش لە (ل١٧-١٨) لە ئیبن خەلەکان دەگوازێتەوە، کە (هەکاری) : قەڵا و گوندانێکن لە ڕووی ڕۆژهەڵاتی موصڵەوە."

**سەبارەت بەناونانی (هەکاری) ڕای جیاواز هەیە، لەوانە:**

١- ناوی عەشیرەتێکی شوانکارەیی کوردە لە نزیك وان.
٢- لە ڕووی ئیتیمۆلۆژی ناوەکەوە، لە ئاکاری - یەوە بە واتای: شوێنی چاندن هاتووە(دەروێش،ل١٩-٢٠).

### ٤- سنجار، شەنگال، شەنگاڵ، شەنکار، ژەنکار:

فوئاد قزانجی لە (ل٧٨-٨٢) ی (مدن عراقیة) دەنووسێت: (سنغارا) یا (سنکارا) شارێکی میسۆپوتامیای کۆنە، دەگەڕێتەوە بۆ گوندی کشتوکاڵی سەردەمی بەندایەتی."

د.نائل حنون لە (ل٩٢-٩٣) ی (مدن قدیمة...)دەڵێت: لە دەقەکانی ئاشووری ناوەند، ناوێکی جیوگرافی بۆ چیای (سنجار) هەبوو، کە بە خەتی کینوفۆرم - مسماری: کور ~+ خار +کی هەبوو، لە سەردەمی بابلی کۆنیش، بە ناوی: (ماری) هەبوو" هەر دکتۆر نائل دەڵێت: لەفزی (سەجار) لە سەردەمی بابلی تاخیر هاتووە."

لە پاش کەوتنی دەسەڵاتی ئاشووری لە (٦١٢)ی پێش میلاد، جارێکی تر ناوی (سنکارا) گەڕایەوە - فوئاد،ل٧٨. لە نێوان سەدەی (٥ و ٧) مەسیحیەت لە (سنجار) پەیدا بوو . جەمال بابان لە (ل١٦٣) ی (اصول اسماء المدن..) دەڵێت: "سنجار بەوە ناسراوە، کە لە مێژووی کۆندا شوێنی کاروانسەرایی بووە."

موسڵمانەکان لە ساڵی (١٨)ی کۆچی، وەك شارێکی هەرێمی جەزیرە فەتحیان کرد، ئامادەنەبوون ببنە موسڵمان بۆیە جزیەیان بە دەوڵەتی ئیسلامی دا، لە سەدەی (٣ و ٤)ی میلادی سۆفیگەریەکی (نەستوری) سەریهەڵدا و کێشە کەوتە نێوان (نەستوری) و (یەعقوبیەکان) - فوئاد،(ل ٣٥) لە سەدەی دوازدەی میلادیەوە، لە دوای ململانێی ئەمەوی و عەباسی، ئێزیدیەت لە ناوچەکە دروست بوو.

بەلازری لە (ل٢٤٣) باس لەوە دەکات لە زەمەنی (پەرویز)دا، (سنجار) بەدەست ڕۆمەکان بووە ...".

کەواتە ناوی: (سنجار) هیچ پەیوەندی بە فەتحی ئیسلامیەوە نییە، ناوی (سنجار) لە ناوی (سجار و) (سنکارا) هاتووە، کوردی ناوچەکە و توێژەری کورد بە چەند شێوەیەك وشەی: (شەنگاڵ - شەنگار) شرۆڤە دەکەن لەوانە :

١- ڕێکانی لە (ل٩)ی ماستەرنامەکەی لە (هەسنیانی) دەگوازێتەوە، کە وشەکە لە بنەڕەتدا: (شەنگاڵ)ە شەنگ و ئاڵ هاتووە بە واتای: لای جوان ."، بەڵام شەنگ+ ئاڵ بە واتای: سووری جوان دێت، ئەوە شەنگ+ئال، بە واتای لای جوان دێت، وەك بەهدینی و کرمانجی ڕۆژئاوا، لامی قەڵەو \ڵ\ بەکارناهێنن، بەڵکو \ل\ بەکاردەهێنن، هەروەها وشەی ( ئال ) بە واتای (لا = تەرەف )دەڵێن: ل بەینی دوو ئالا ئەز بێ ئالم .

٢- بە تەفسیری زمانەوانی (ئاڤێستا)، وشەی ( ئاگر ) ( ئار )-ە، کەواتە: وشەی (شەنگار) لە دوای ئێزدیەکانەوە دروستبووە و وشەیەکی لێکدراوە، بە واتای: (ئاگری جوان) دێت، پێدەچێ ناوی وشەکە، گوزارشت لە ئاتەشگای زەردەشتیەکان بکات .

٣- ڕێکانی شرۆڤەیەك دەکات و باوەڕی وایە: لە ڕووی زمانەوانی و کۆمەڵایەتییەوە، وشەکە ( ژەنگار )-ە، نەك ( شەنگاڵ ) و ( شەنگار )." خۆم باوەڕم وایە: ئەو ناوە لە دوای پەیدابوونی ئێزدیاتی لە دەڤەرەکە، کوردی موسڵمان بە ئێزدیەکانی وتبێ: (ژەنگار)، نەك وشەکە بە عەرەبی کرابێت و کرابیتە: ( سنجار )، چونکە پێش هاتنی ئیسلام ناوی( سجار) و( سنکارا ) هەبووە!! ئێزدیناسەکان دەزانن، ئێزدی دەنگی \ ش \ بەکارناهێنن، چۆن دەڤەرەکەیان بە ( ش ) دەسپێدەکات؟؟! سروشتی ئایینی ئێزیدی، لە سەر خۆنەشۆشتن دامەزراوە، بە جۆرێك چەند سەدەیەك بەر لە ئێستا، ئاودەستخانەیان نەبوو، بۆیە کوردی موسڵمان پێیان گوتوون : ژەنگگرتوو، ژەنگدار، ژەنگاوی، چۆن ئەوان بە کوردە موسڵمانەکانیان دەوت : موسلمانی پیس!

کەواتە فتوحاتی ئیسلامی ناوی شەنگاری ( ئاگری قەشەنگ )ی زەردەشتی نەکردۆتە (سنجار)، چونکە چەندان سەدە پێش ئیسلام (سجار و سنکارا و سنغار) هەبوون، ئەوە عەرەبە بەعسیەکان بوون ئەو شارە کوردییەیان لە ڕێژەی (٧٨٪) کورد لە سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) کردە (١٠٪) لە سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧)(خەسرەو گۆران،ل٥).

**٥- تەلکێف:**

پێکهاتەی ناوەکە وا نیشان دەدات، کە لە زمانی عەرەبی سەرچاوەی گرتبێت، دەبێ ئەمە وابێ؟؟

جەمال بابان لە (ل٨٦) دەنووسێت: قەزای (تلکێف) لە پارێزگای نەینەوایە، دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شارەکە، تەنها (١٩کم) لە موصل دوورە."

فوئاد قزانجی لە (ل٩٦) دەڵێت: تلکێف لە تلا-کیفا" گردی بەرد " بە زمانی ئارامی و سریانی هاتووە، لەبەرئەوەی بەردی کلسی لە سەر زەویەکەی هەیە، سەر بە قەزای حەمدانیەیە، کە تلا-کیفا و بەغدیدا - قەرقوش - لە خۆ دەگرێت ."

ئەم شارۆچکەیە زۆر کۆنە، بابان، (ل٨٦) باوەڕی وایە: ئێستاش پاشماوەی سەردەمی (وەرکا-٣٥٠٠پ.م) و چاخی بەندایەتی (٤٠٠٠ پ.م) لێ ماوە." ئەم

شارۆچکە مەسیحیە، لە سەردەمی فتوحات ناوی نەهاتووە، پێدەچێ دانیشتوانی (تلکێف) پێش هاتنی ئیسلام لە سەر دینی مەسیحی بووبن، وەك زۆربەی شارەکانی هەرێمی جەزیرە، وەك: جەزیرەی بۆتان و ئەربل و موصڵ، بە دانی (جزیە) لە سەر دینی خۆیان مابوونەوە.

کەواتە: فەتحکردنی لە ماوەی (١٦-٢٠) کۆچی بووە، بەڵام ئەو شارۆچکەیە، هەتا (دەی) میلادی ناوی نەهاتووە، هەتا قازی زەکریا ئیزدی لە (تأریخ الموصل) لە ڕووداوەکانی ساڵی (١٣٢)ی کۆچی ناوی دەهێنێت.

پاش ئەوەی مەغۆل لە سەدەی ١٦ی میلادی دەستبەسەر عیراق دادەگرێت، وەك کتێبی بەناوبانگی (ئاشور مەسیح) باس لەوە دەکات، کە لە ساڵی (١٥٠٨) مەغۆلەکان (تلکیف)یان تالانکرد. فتح الله قادری باس لەوە دەکا، کە فارسەکان لە ساڵی (١٧٤٣) نەیانتوانی موصل داگیر بکەن، بۆیە کەوتنە تالآنکردنی دەوروبەری، یەکێك لەوانەش (تلکێف)ە . فوئاد قزلچی لە (ل٩٧) لە یوسف ئادۆی بتریرك دەگێڕێتەوە، کە لە ساڵی (١٨٢٧) برسیەتی بووە هۆی مردنی (٣٠٠٠) کەس لە (ئەلقوش)، هەروەها هەمان ژمارە لە تلکێف ."

### ٦- ئەلقــوش:

شارۆچکەی (ئەلقوش) دەکەوێتە ناو جەرگەی بەهدینان.مامۆستا بابان لە (ل٢٩) ی (اصول أسماء المدن ...) دەنووسێت: (ئەلقوش) گوندێکی گەورەیە و ناوەندی ناحیەیە، سەر بە قەزای (تلکێف)ە (٣١) میل دوورە لە شاری موصل...
چەند ڕایەك دەربارەی ڕەسەنی ناوی شارەکە هەیە:

#### ١- لێکدانەوەی مۆرفۆلۆژی ئاشووری:

مامۆستا بابان لە (ل٢٩) دەربارەی شرۆڤەی وشەی (ئەلقوش) لە تەها باقر و ئەوانی دی دەگوازێتەوە: ناوەکە، ناوێکی لێکدراوە لە هەردوو وشەی: (ایل - قشتی) بە واتای: (خوداوەندی قوسی - الالە قوسی) هاتووە، هەروەها دەگوترێت: بە گوێرەی تەورات و عیبری، هەمان واتای هەیە.

سەرچاوە مەسیحییەکان لەوانە: (مدن عراقیە...لە (ل١١٥-١١٩) جەخت لە سەر رەسەنی مەسیحی ئەم شارە دەکەن .

**٢- ئەلقوش ناوێکی ئارامیە:**

ئەلقوش لە (ایل قشتی) هاتووە .

**٣- ئەلقوش وشەیەکی عوسمانیە:**

لێکدانەوەی وشەکە بە پێوەری زمانی عوسمانی بریتیە لەوەی : (ئال - سۆر، قوش-باڵندە) : باڵندەی سۆر زۆر نزیکە لە واقیع . لە دەڤەری پارێزگای هەولێر هەردوو وشەکە بەکاردێن وەك:

لێو ئاڵ : لێو سۆر.

قوشقاقەز : باڵندەی کاغەز - کۆلارە.

گەر ناوەکە بە دیدی کتێبە مەسیحییەکان: ئاشووری، ئارامی و مەزارگای ناحوم القوشی بێت، بیرۆکەی توندوتیژی و تاکرەوی (فتوحات) تەواو هەڵدەوەشێنێتەوە، چونکە، تاکو ئێستا پاش زیاتر لە (١٤٠٠)ساڵ ناوی (ئەلقوش) وەك خۆی ماوەتەوە.

گەر ناوی شارۆچکەکە لە تورکی عوسمانی هاتبێت، دووبارە (فتوحات) لە بەعەرەبکردنی ناوی شارۆچکەکە دوورە، چونکە عوسمانییەکان (حەفت - هەشت) سەدە دوای (فتوحات) لە باشووری کوردستان دەرکەوتن .

# لە شارە باس نەکراوەکانی هەرێمی کارگێڕی جزیرە

## دەڤەری بەهدینان:

ئاخاوتنی (بەهدینی)، هێندەی نزیکە لە ئاخاوتنی شارەکانی دی: جەزیرە و زۆزان، ئەوەندەش دوورە لە ئاخاوتنی کوردی ئەقلیمی جیبال . لە سەر ناوی بادینی، بەهدینی ... زۆر قسەی مێژوویی و مۆرفۆلۆژی کراوە، لەوانە:

١- صدیق الدملوجی (١٩٩٩)، (ل٥) باس لەوە دەکات، کە ناوەکە لە ناوی میرە بەهائەدینیەکان هاتووە، وەك ناوی: ئامێدی لە ناوی (عمادالدین زنکی ) هاتووە.

٢- دکتۆر عبدالفتاح بۆتانی، لە پێشەکی نامیلکەی (بادینان فی سالنامات...) تەواو ئەو بۆچوونەی (دەمەلوجی ) ڕەتدەکاتەوە، کە هەریەك لە وشەی (بادینان) لە ناوی (بهاءالدین) و وشەی (شەمدینان) لە ناوی (میر شمس الدین) هاتبێت.

ئەو لێکدانەوەیە، نە مێژووییە، نە زمانەوانی، ئەو دوو ناوە پێش دەرکەوتنی ئیسلام لە ناوچەکە هەبوونە، هەروەها (بۆتانی ) بە قسەکەی (عەباس عەزاوی ) پشت ئەستوورە، کە کورد ناوی گوند و شارەکەی نابەستێتەوە بە ناوی میرەکەیەوە."

لە ناوی میرنشینەکانی کوردیش دەردەکەوێ، کە کورد بە زۆریی ناوی (میر) ناکاتە ناوی میرنشینەکە، بەڵکو ئەدگاری جیوگرافی شوێنەکە هەڵدەبژێرێت :

- میرنشینی ئەردەلان، بابان، سۆران، بادینان، بۆتان...

ئەمەی سەرەوە فاکتەری مێژوو و کەلتوور بوو لە ناونانی شوێنێك، میرنشینێك. ئەمە دەکرێ ڕاست بێ، یا هەڵە!!

**هەرچی خوێندنەوەی مۆرفۆلۆژییە لە سەر دوو ستوون دامەزراوە :**

١- ستوونی واتای لێکسیمی.

٢- ستوونی واتای پراگماتیکی ( دەوروبەر ).

لە ڕوانگەی ئەو دوو ستوونەوە لە پێکهێنەرەکانی وشەی: ( بادینی ) و (شەمدیتانی ) ورد دەبینەوە .

هەژار موکریانی لە (ل٣٩)ی (هەنبانە بۆرینە) دەربارەی وشەی بادینی دەڵێت : بادینان مەڵبەندێکە لە کوردستانا، واتا: (دین باشان) دەگەڵ وشەی - بهدینان-ی فارسی یەك دەگرێتەوە، کە بە لایەگرانی زەردەشتیان دەگوت. بۆ پاڵپشتی ئەو ڕایەی موکریانی لە (ل٢١٥)ی (فرهنگ فارسی - کردی)، ماجیدی مەردۆخی دەنووسێت : (بەهدین) یا (بادین)، ناوێ بوو زەردەشتیەکان لە خۆیان نابوو.

موکریانی و مەردۆخی، باوەڕیان وایە: کورد لە بریتی وشەی ئایین، زیاتر (دین) بە واتای باوەڕ دێت . د.جەمال نەبەز لە (ل٣٠٥) (وشەنامەکی...) شەم واتە: مۆم، وشەی :(شەمع و شمس) لەو وشەیە هاتوون.هەروەها لە (ل١١٩) دەڵێت : دین بە مانای شێت لە کوردیی باکوور بەکاردێ." هەردوو واتای دین : باوەڕ، شێت بە تایبەتی واتای یەکەم دەگەڵ واتای (شەم ) و زەردەشتیاتی یەکدەگرنەوە : مۆمی دین : توانەوە بۆ دین!

کەواتە: هەردوو وشەی: (بەهدینی و شەمدینی)، وشەی زەردەشتین، چونکە تەواو گوزارشت لە پرانسیپەکانی (مۆغ)ی زەردەشتی دەکەن، ئەوەی ئەو بۆچوونە زمانەوانییە پشت ڕاستدەکاتەوە، ڕایە مێژوویەکەی (د.بۆتانی)یە، کە هەردوو وشە بەر لە دەرکەوتنی ئیسلام لە دەڤەرەکە هەبوونە - ل٥.

**٧- دهۆك:**

دهۆك وەك شار، کۆن نییە، بەڵکو لە ساڵی (١٩٧٠) کرایە پارێزگا . جەمال بابان لە (ل١٢٦-١٢٧) کۆمەڵە ڕایەك لە سەر ئەصڵی ناوی (دهۆك) دەهێنێ، لەوانە:

**١- ئاشووریبوونی دهۆك:**

تەها باقر و ئەوانی دی دەڵێن: لەوانەیە (دهۆك) لە ماوەی ئاشووریدا، نیشتنگەیەك بێ، شوێنی دهۆك شاری- ئەدیان- بێ، کە پایتەختی (ڕمیوس) بوو، هەروەها (هارتمان) دەڵێت: ناوی دهۆك لە: (جاهوك) هاتووە .

٢- دیانەکانی (دهۆك) بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە ناوی (دهۆك) لە (نوهەدرا - شوێنی جوان) هاتبێت، ئێستاش فەلەکانی (دهۆك) ئەو ناوە، نەك هەر بەکاردەهێنن، بەڵکو بۆتە ناوی گۆڤارێکی فەلەکان .

بێگومان دیانێکی زۆر لە (دهۆك) هەنە، حیزبی ئاشووری دەڤەرەکە لە نێو حکومەتی کوردی لە (١٩٩٢-٢٠٠٢) لە سەر ڕێی سەرەکی: (دهۆك - زاخۆ)، لە نزیك (مالتا) بە گەورەیی نووسیبویان : " الاول من نیسان رمز وجود اشوری فی الارض الاجداد - یەکی نیسان هێمای بوونی تاکی ئاشووریە لە زەوی باپیران !

( ڕاگری کۆلیژەکەمان لە (٢٠٠٢) دەیوت تۆ ناوی کوڕت (محمد) و ناوی کچت (سارا) یە، هەردوو ناو، ئیسلامیین، تا نەیانگۆڕی، (عدم ممانعەت) بۆ دکتۆرا پێ نادەم، منیش وتم: بڕۆن ناوی ئەو (قطعە)ی نزیك کولیە بگۆڕن، نەك داوا لە من بکەی، ناوی کچ و کوڕم بگۆڕم !!)

ئەو ناوانە گەر ئاشووری بن، چ پەیوەندی بە کوردەوەیە؟ بەعەرەبکردن واتای چ دەگەیەنێت؟

**لەم کتێبەدا لە ڕوانگەی خوێندنەوەی ئیتیمۆلۆژی و مۆرفۆلۆژی کوردیدا، لە واتای وشەکە نزیك دەبینەوە :**

بابان کە لە (ل١٢٧) دا دەڵێت : وشەی - دێ - لە بەهدینی نییە! سەیرم پێدێ، چونکە تەنیا لە سێ فەرهەنگی بەهدینی: (صەلاحەدین و قازی و سپیرێزم) ڕوانی، لە دوویان وشەی: (دێ) و (دێهات )و (لادێ) بەکارهاتووە، بۆ نموونە: لە (ل١٣٨٧) ی فەرهەنگی (صەلاحەدین)، وشەی: (گوند، دێ، دێهات) بەکارهاتووە. سپیرێز لە (ل٥٢٢) وشەی - دێ - بەکارناهێنێت، قازی لە (ل٩٣ ول٣٨٧) وشەی (دێهات) و (لادێیی) بەکاردەهێنێت .

**لە ڕووی مۆرفۆلۆژی کوردیەوە، چەند ڕایەك لە سەر پێکهاتەی وشەی دهۆك هەیە:**

١- دێهیەك - دێهەك : دێ هەك : گوندەك.

٢- دوو - هێك : دوو هێلکە.

٣- دە - ۆك : دێیەکی بچووك .

٤- دوە : دەوەن : بەڕوو، عەلەف.

٥- باج.

گەر هەریەك لەو ناوانەی سەرەوە ڕاست بن، چ وشەی: (بەهدینان)، چ وشەی: (دهۆك)، بەتایبەت ئەوی یەکەم، زەردەشتی بووە، تەعریب نەکراون!

## ٨- زاخۆ:

شارۆچکەی (زاخۆ) دەکەوێتە سەر زێی خابوور . هێڵی (بروکسل) هێڵی جیاکەرەوەی ( سلوپی ) و ( زاخۆ )یە . چەند ڕایەکی مێژوویی دەربارەی زاخۆ هەیە:

١- ڕای ئارامی : زاخۆ لە (زاخۆتا) وەرگیراوە، کە واتای - زۆربە دەدات،

٢- ڕای یۆنانی: زاخۆ : (سکودیوس)، ئێستا ئەو شوێنە بۆتە: کیستە، بابان، ل١٣٨.

٣- زاخۆ لە ناوی (زاخاریۆس)یەکێ لە فەرماندەکانی (زەینەفۆن) بووە، وەرگیراوە.

٤- لە وشەی عەرەبی - زکامی - لە یۆنانیدا - (زاکخوا) وەرگیراوە.
وشەی زکامی : سارد، لە خۆش خۆ چوو، وشکاتی دەگەیەنێت !

وشەی (زاخۆ) لە هەریەك لەو وشانە هاتبێت و بەهۆی گۆڕانی زمان بوویێتە زاخۆ لە کوردی، دوور و نزیك پەیوەندی بە بەعەرەبکردنەوە نییە.

هەژار موکریانی لە (ل٣٧١-٣٧٢) چەند وشەیەك نزیك لە ڕێنووسی - زاخۆ - دەهێنێتەوە وەك زاخوڕ : ڕەهۆڵ، زاخۆر : بەردەڵانی ڕژد وبڵند ، زاخۆن : ئاخەڵەمڕی لە کێو دابڕاو ."

ئەو لە (ل٣٧١) هیچ شرۆڤەیەك بۆ ناوی زاخۆ ناکات، تەنیا دەنووسێت : زاخۆ ناوی مەڵبەند و شارێکە لە کوردستان . ڕایەکی تر هەیە، کە جەمال بابان لە (ل١٣٩) زۆر پشتگیری دەکات ئەویش ئەوەیە، کە " -زاخۆ - وشەیەکی عیبریە -لە زاخوتا وەرگیراوە و واتای (الغلبة) و سەرکەوتن دەدات." گیو موکریانی لە (ل٥١٦)ی فەرهەنگی (کوردستان) دەنووسێت : "جۆرە پاڵتۆ و عابایەك دەکا، کە دەستکاری زاخۆییەکان بوو .

لێرەدا وشەی ( زاخۆ ) ئارامی، یۆنانی، عیبری بێت، چ پەیوەندی بە وشەی کوردیەوە هەیە ؟ ئێستاش ناوچەکە، شارۆچکەکە، هەر ( زاخۆ ) بێت، جا (زاخکوا)ی عەرەبی، یا (زاخ)ی کوردی بێت، چ پەیوەندی بە تەعریب و بەعەرەبکردنەوە یە؟

خوێندنەوەی مۆرفۆلۆژی جەخت لە سەر لێکسیمی پێکهێنەری ناوەکە دەکات، بۆ نموونە: لەو شەش واتایەی هەژار موکریانی بۆ وشەی - زاخ - دەنووسێ: هیچیان واتای - زاخ -ی بەهدینان و هەولێر نییە.

مەردۆخیش لە (ل٧١٦) ئاماژە بە هەبوونی وشەی - زاغ - لە فارسی دەکات، کە تەواو جودایە لە وشەی - زاخ . لە کوردی هەولێر و بەهدینان - زاخ - واتای غیرەت، موود، هێز - شیان دەدات، وەك:- کوڕەکەت زاخ-ی نیە. کوڕەکەت بێ زاخە . چوومە زاخۆ زاخ مەداخۆ.

# شارەکانی
# کوردستانی ڕۆمیی

لە دیارکردنی شارەکانی کوردستانی ڕۆمیدا، دووبارە تووشی تەنگژەی تەقسیماتی ئیداری و شوێنگە و هەڵکەوتەی جیوگرافی دەبین. لە پاڵ ئەو دووەش، ڕەوشی سەربازی شارەکە، کە ماوەیەك بەشێك بووە لە قەڵەمڕەوی ساسانی، ماوەیەکی تر بەشێك بووە لە قەڵەمڕەوی ڕۆمیی،کە کێشە و ئارێشەیەکی ترە.



لەم توێژینەوەیە، کوردستانی ڕۆمیش دەکەینە سێ ئەقلیم :

١ - ئەقلیمی شام.

٢ - ئەقلیمی جزیرە.

٣ - ئەقلیمی زۆزان.

## یەکەم: جیۆگرافیای بەشی کوردی شام - کارگێڕی ڕۆم:

پێش هاتنی سوپای ئیسلام بۆ دەڤەرەکە، دوای شەڕی یەرموك، دەڤەرەکە چەند ناوێك بۆ دەڤەرەکە بەکارهاتووە : (ئامورۆ) لای خەڵکانی میسۆپۆتامیا، (سریۆن) لای عیبریەکان، سو-ری-سر-ی لای بابلیەکان ساڵێك بەدەست یۆنانیەکان (٣٣١پ.م -٢٤٨پ.م) (ئەسکەندەر مەکدۆنی و خەلیفەکانی) وەبووە، هەر ئەوانیش وشەی :(سریا یا سوریە )یان بۆ سوریا و لوبنان و ئوردن و فەڵەستین بەکارهێناوە ( ئەحمەد ئەمین٢٠٠٨،ل١١٧ ی دراسات فی تاریخ الشرق الادنی القدیم). موسڵمانەکان ناوی سوریایان گۆڕی بۆ وڵاتی شام (چەپە) - سەرچاوەی پێشوو.

شام لەم توێژینەوەیەدا مەبەست لێی، تەنیا سوریای ئێستایە. صەلاح بەدرەدین (١٩٩٩)لە (ل١٢)ی چاپی ئینگلیزی کتێبی (ڕۆژئاوای کوردستان..) دەڵێت: "بەشی ڕۆژئاوای کوردستان دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی سوریا ....دەوڵەتی (دۆستکی) دەکەوێتە جەرگەی ئەم بەشەی کوردستانەوە).

شوناسی کوردیبوونی ڕۆژئاوای کوردستان، پرسێکە لە نێوان ڕەسەنێتی و مهاجریبووندا . عەلی موسلم لە کتێبی (الكرد في منطقة الباب و اطرافها) ئاوا باسی شوێنی نیشتەجێبوونی کورد دەکات :" کورد لە بەشی باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی شام، دەژین بە درێژایی سنووری تورکیا، کە زیاتر (٨٠٠کم) ی نەبڕاوە، هەروەها لە ڕۆژئاواوە، هەتا نزیك کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست درێژ دەبێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتیش، هەتا فیشخابوور ."

بە پێی ئەو نەخشەیەی ( یاسا ) بۆ ڕۆژئاوای کوردستان بڵاویکردۆتەوە، گوندی ( عین دیوار ) خاڵی جیابوونەوەی ڕۆژئاوای کوردستانە لە سوریا .

شار و شارۆچکە کوردییەکان بەم شێوەی خوارەوەن : (عین دیوار، دێرك، ڕمێلان، تربەسپی (دەرباسی )، قامیشلۆ، عامودە، حەسەکە، سەرێ کانی، کۆبانی، عەفرین) ." لە شار و شارۆچکەکان کورد و عەرەب و مەسیحی پێکەوە دەژین، بەڵام لە گوندەکان بە جیا ."

دوای ڕزگارکردنی: دیمەشق و ئەجنادین و حەمص و حەلەب ، عەفرین کورد ناشنابوو بە ئیسلام. لەم دەڤەرە کوردیەی وڵاتی شام، چەند شارێکی کوردی هەن :

## شارەکانی ئەقلیمی شامی کوردی:

لە شارەکانی ڕۆژئاوا، ژمارەیەکی گەورەی کورد و عەرەبی مەسیحی هەن، لەوانە دیاردەی هەبوونی ئەو (کریسچیانە) بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ عەرەبی غەسانە، بەشەکەی تر دەگەڕێتەوە بۆ لێبوردەیی ئیسلام بەرانبەر دینەکان، هەر ئەوەش وایکردووە ژمارەیەکی زۆری مەسیحی لە ڕۆژئاوا هەبن، ئیبن حەوقەل لە (ل١٥٣-١٧٣) قسە لە سەر شارەکانی شام و ماوەی نێوانیان دەکات .

**بەپێی نەخشەی (یاسا ) گەورەدێی (عەین دیوار ) بەرایی کوردستانی ڕۆژئاوا یە :**

### ١- گەورە دێی عەین دیوار :

گەورە دێی (عەین دیوار) دەکەوێتە سنووری دێرك سەر بە پارێزگای حەسەکەن. ئەم شارۆچکەیە دوا شارۆچکەی باکوری ڕۆژهەڵاتی سوریایە، تەنیا (٥ کم) لە جەزیرەی بۆتان دوورە.

### ٢- دێرك:

لە باکوری (دێرك) زێی دجلە هەیە، لە باشور چیای (ژەنگار) لە ڕۆژهەڵاتیش چیای (جودی)، لە ڕۆژئاواش (تورعابدین)، تەنیا (٢٠کم) لە جەزیرەی بۆتان دوورە."

(دێرك) شارێکی ڕۆژئاوای کوردستانە، ئازاد دێرکی لە (ل٥١)ی (المدن الكردية)دا دەڵێت : "دێرك دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی سوریا، ئەو شارە تەنیا (١٧ کم) دوورە لە جەزیرەی بۆتان.

ناوی شارەکە لە دێرێکی کۆنی تاقانە پێکدێت . ئەو (دێرە) تاکو ئێستاش بوونی هەیە . لە کوردیش بە واتای: (یەك) دێت . ئەو شارە بە ناوێکی دی ناسراوە، ئەویش دێرکا حەمکۆ میری عەشیرەتی هەسنیان ."

لە ڕووی ئیتۆمۆلۆژی، ناوەکە دەردەکەوێت، کە ناوەکە لە ناوی ( دێرێکی مەسیحی ) هاتووە بەناوی دیرۆنی لە زمانی سریانی، کوردیش چونکە دێرەکە لە پەرگەی شار بووە، ناوی ناوە دێرك، واتا یەك دێر .

لای عەرەبە شۆڤینیستەکانی شەستەکانی سەدەی بیست، چەقی شارەکە بۆتە ( مالکیە )، کە (١٩٠کم) لە حەسەکە دوورە، (٩٠کم) لە قامشلۆ، بەڵام (٩٠٠کم) دوورە لە دیمەشق . "لە پاش سەدەی پازدەوە، هەتا بیستەکانی سەدەی بیستەم، بەشێك بووە لە کوردستانی عوسمانی بە جۆرێك بەشێك بووە لە میرنشینی جەزیرەی بۆتان . ئەو شارە هەتا دیارکردنی سنوور لە نێوان تورکیا و سوریا و عیراق، هەر ناوی (دێرك) بوو.

**شارۆچکەکە بەچەند قۆناغێك لە سەدەی بیست تێپەڕیوە، لەوانە :**

١- لە ساڵی (١٩٢٨) بووە بەشێك لە سوریا سەر بە (عین دیوار).

٢- بەپێی مەرسومی (١٤١٤)ی (١٩٣٣) بووە شارۆچکە و شارەوانی تێدا کرایەوە.

٣- لە ساڵی (١٩٣٦) بووە قەزا، ناویشی گۆڕا بۆ ( دجلە ).

٤- لە سەردەمی فەرەنسیەکان (١٩١٨-١٩٤٦) دا بووە ناوەندی دەڤەر.

٥- بەپێی مەرسومی (٣٤٦)ی (٢٤)ی ئازاری (١٩٥٧) ناوی شارەکە گۆڕدرا بۆ (مالکیە) لەقەبی (عەقید عەدنان مالکی) ."

هەر ئازاد دێرکی لە (ل٥٣) دەربارەی ڕەوشی کۆنی شارەکە دەنووسێت : لە سەردەمی شەڕی (گریك) و ڕۆمانییەکان گۆڕەپانی هەردوولا بووە بەرەو: نصێبین و ماردین و ئامەد و ڕەها، بە پێچەوانەش بەرەو موصڵ و بەغدا و هەولێر .
ئەو شارە لە زەمەنی خەلیفە (عومەر) ڕزگار کرا.

ناوەکە چ کەنیسەیی بێ، یا کوردی، یا عەرەبی شۆڤینی بێ، ناو و کەنیسەکەی وەك خۆیان ماونەتەوە، کەواتە بەئیسلامکردن و بەعەرەبکردن، واتای چ دەگەیەنن؟

## ٣- رمـێلان :

ڕمێلان شارۆچکەیەکی نەفتیە . لە ناوچەی (دێرك) دایە لە پارێزگای حەسەکە.

## ٤- ترپەسپی - دەرباسی:

وەك گوتمان درباسی لە ڕۆژئاوای عامودایە . سەرچاوە سریانیەکان دەڵێن: ناوی (دەرباسی) لە ناوی ( قەدیس مار ئاسیا ) هاتووە.

## ٥- شاری قامیشلۆ:

لای کوردە ناسیونالیستەکانی ڕۆژئاوای کوردستان، قامیشلۆ پایتەختی ڕۆژئاوایە . قامیشلۆ، یا قامیشلی، شارێکی دێرینی ڕۆژئاوای کوردستانە، ئازاد دێرکی لە (ل ١٨٧)ی کتێبی (المدن الكردية) دەڵێت : ئەم شارە لە سەردەمی ئەکەدی و ئاشووریەکان هەبووە، هەروەها موسڵمانەکان لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب فەتحیان کردووە ." هەژار موکریانی لە (ل٥٤٧)ی (هەنبانە بۆرینە) دەربارەی (قامیش) و (قامیشلی) دەنووسێت: " قامیش : چیتك، قامیشەڵان شوێنێ، کە زۆری قامیش لێ رواوە، قامیشلی ناوچە و شارێکە لە کوردستان." هیچ لە سەرچاوەکان ناوی شارەکە لە سەردەمی فتوحات ناهێنن، تەنها سەردەمی عوسمانی نەبێت.

قامیشلۆ وشەیەکی تورکیە، واتای: قامیشی کەنار روبار دەگەیەنێت. لای عەرەبەکانیش لە (گامێش دەو روبار ) هاتووە .لەم شارەدا، جگە لە کوردی موسڵمان و کوردی ئێزیدی و عەرەبی غەساسنە و کلدانی و ئاشوری لێیە. دێرکی لە (ل١٩١) دەڵێت : لە ڕووی کارگێڕیەوە سێ شارۆچکە هەن : عامودە،ترپەسپی، تل حمیس .

## ٦- عــامـودە:

بە پێی سەرژمێری (٢٠٠٤)ی سوریا، (عامودا) ئێستا ناحیەیەکە لە پارێزگای حەسەکە، ناوچەی قامیشلو، تەنیا نزیکەی (٢٧) هەزار کەسی لێدەژیت .ڕووبارێکی بە نێودا ڕەت دەبێ بە ناوی ( ڕووباری خنزیر ).دەوترێت دەسەڵاتی فەرەنسا لە شام، ئەو شارۆچکەیەی لە سییەکانی سەدەی پێشوو بۆ سریانە موهاجیرەکانی تورکیا دروستکرد .

لە ڕاستیدا ئەوەی بۆ سریانەکان دروستکرا، کۆمەڵگا - موجەمەع بوو، ئەگەرنا ئەو دەڤەرە زۆر پێش هاتنی سریانەکانی تورکیا، کورد ئاوەدانی کردبۆوە. مەحموود ئالووسی لە کتێبی: ( نشوه المدام في العودة الى دار السلام ) لە باسی گەشتێکی (١٢٦٧) بۆ دەڤەرەکە باسی (عامودا ) دەکات، کە بریتی بووە لە ( ٧٠ )ماڵ و مزگەوتێك. "دەڤەرەکە چەندەها گردی لێیە کە تەمەنیان بۆ (٣٠٠٠) ساڵ دەگەڕێتەوە .

جگە لە کورد هەر لە پێش هاتنی ئیسلامەوە، عەرەبی ڕەوەند و خاوەن مەڕ و ماڵاتی لێبووە خودی عامودەش، چۆن ئامەد بە ناوی هەوارگەی قەبیلەی عەرەبی کۆچەری ناودار بوو، بە ناوی دیار مچر ناسراو بوو . شارۆچکەکە هەتا پەیمانی سایکس - بیکۆ، لۆزان، هێڵی بروکسل هەر بەشێك بووە لە کوردستانی ڕۆمی ( لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی بووە کوردستانی عوسمانلی .

ناوی شارۆچکەکە لە ئەفسانەیەکەوە هاتووە گوایە "کچی مەلیکی ماردین خوێن ڕێژێکی دەبێ، بڕیاریدا کوڕەکەی دوور بخاتەوە و لە نزیکی گردی عامودا لە ( عامودێك ) هەڵیواسن ." ناوی ئەو شارۆچکەیە لە سەر ناوی

ئەو عامودەی منداڵە کەی پێ بەستراوە، دروستبووە.

کۆنتێکستی جیوگرافیای شوناسی قەوم-ی شار دەخاتەڕوو، بۆ نموونە: شارۆچکەیەکی وەك (عامودە) دەورە دراوە بە شاری کوردی لە ڕۆژهەڵاتی شارەکە قامیشلو هەیە، کە تەنیا (٣٠کم) لێی دوورە، لە ڕۆژئاواش (دەرباسی) هەیە، کە تەنیا (٢٦کم) لێی دوورە لە باشووریش حەسەکە هەیە.

## ٧- حەسەکە:

حەسەکە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی سوریای ئێستا، شاری حەسەکە وەك زۆربەی شارەکانی ڕۆژئاوا، پڕیەتی لە مەسیحی کورد و غەیرە کورد، هەروەها عەرەبی موسڵمان و مەسیحی، شارەکە زۆر کۆنە .

حەسەکە پاوانی مەڕ و ماڵداری عوسمانی و عەرەبی بووە، بۆیە لە کۆتایی حوکمڕانی عوسمانی و بەرایی سەدەی بیستەم، بۆتە مۆڵگەی زۆر عەشیرەتی تورکی و عەرەبی، لەوانە :

١- عەشیرەتی (هارونا) لە نزیك گوندەکانی دێرك نیشتەجێ بوون.

٢- عەشیرەتی (ئۆمرکا) لە چواردەورەی شارۆچکەی (رمێلان) جێگیر بوون.

٣- عەشیرەتی (بێداری)، کۆمەڵە گوندێکیان لە باشووری (چیای قەرە چۆك).

٤- عەشیرەتێ لە (نەجد) هاتبوون، پاش هاتنە سەر کاری (ال سعود) لە حیجاز.

٥- عەشیرەتی ( تەی ).

٦- عەشیرەتی ( زوبەع ) ی عەرەبی عیراقی، ئەوانە کۆمەڵە گوندێکیان لە ڕۆژئاوای تەل-کۆچەر دروست کردووە .

بەڵام، ئەو سەرچاوانەی بەردەستن باس لە سەردەمی فتوحاتی ئەم شارە ناکەن.

## ٨- سەرێ کانی یان سی کانی:

سەری کانی شارۆچکەیەکی سەر بە پارێزگای حەسەکەیە .دێرکی لە (ل١٧٦) کۆمەڵە ناوێکی کۆنی شارۆچکەکە باس دەکات : "میتانییەکان بە ناوی (واشۆکانی) ناویان دەبرد، هەروەها ئەم شارە بە (سی کانی) ناوی دەبردرا، تەورات بە ناوی (گۆزانا) ناوی بردووە، ئاشووریەکان بە (جۆزانا) ناویان دەبرد... ئەوە عەرەبەکان بوون بە ناوی (رأس العین)، خەڵکی ناوچەش بەناوی (سەری کانی) ناوی دەبەن ." سریانیەکانی سوریا بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە ناوی شارەکە (ریش عینا ) بووە، کوردەکان کردویانەتە ( سەری کانی ).

شاری (سەری کانی) سنووری سێ بەشی کوردستان داگیر دەکات : خودی شارۆچکەکە لە ڕۆژئاوایە، نزیك سنووری باکووری کوردستانە، هەروەها شوێنە دەشتیەکەی درێژکردنەوەی دەشتی ژەنگارە، لەولاوەش درێژەپێدەری دەشتی جەزیرەی سەرووە . شارەکە گۆڕەپانی ململانێی فارس و ڕۆمەکان بووە، فارسەکان لە ساڵی (٦٠٢) دەستیان بەسەر داگرت..

یاقوت حەمەوی لە (معجم البلدان) ناوی ئەوها دەبات: "شارێکی بەناوبانگی گەورەی جەزیرەیە دەکەوێتە نێوان (حران و نەسیبین)، کانی زۆری لێیە، هەموو پێکەوە روباری خابور پێکدەهێنن." بەلازری لە (ل ٢٥٢) ناوی (سەری کانی) بە "رأس العین" دێنێت .

ئازاد دێرکی لە (ل١٧٩) بە پێچەوانەی سەرچاوە مێژوویەکان دەڵێت : شارەکە بە ئاسانی فەتح نەکراوە، بەڵکو ئازایانە بەرگریان لە شارەکە کردووە "بەلازری لە (ل٢٤٦) باس لەوە دەکات، کە (عومەیری کوڕی سەعد) (سەری کانی) بە صوڵح فەتح کرد، لە ڕێگاوەش (خابور) هەتا (قیرقیسیا) ی فەتحکرد، بەبێ هەبوونی شەڕێك، پاش قلقیسیا، قەڵاکانی ناوچەکانی یەك لە دوا یەك فەتح کرد، خەڵکی (سەری کانی) صوڵحەکەیان شکاند، بەڵام (عومەیر) هەروەك جاری یەکەم صوڵحی لەگەڵ کردنەوە".

## ٩- کۆبـــانی:

شارێکی کوردیە زیاتر لە تخوبی عەرەبی نزیکە لە تخوبی عەرەبی، (٥٠٠کم) لە دیمەشق دوورە، بەڵکو تەنیا (١٥٨کم) لە حەلەب دوورە، بەڵام (٤٠کم) لە (ئۆرفە - ڕەها) دوورە، چونکە خۆی بەشێك بووە لە (ئۆرفە).

پێش هاتنی ئیسلام، شارستانی تری وەك: (میتانیە ئاشوریەحیپیە و کردو کسیە و حوریە و ڕۆمانی - بێزەنتی) لێبوو.

هەریەك لە ناوی کانی عەرەب و کۆبانی، هیچیان کوردی نیین. بە ساڵاچوان دەڵێن: دوو کانی لە دەڤەرەکە هەبوو، یەکیان کانیا مورشیدی، ئەویدیش کانی ئەو عەرەبانە بووە، کە خەریکی مەڕ و ماڵات بە خێوکردن بوونە، بۆیە خۆی کوردەکانی ناوچەکە ناوی کانیەکەیان ناوناوە (کانیا عەرەبا). ساڵی (١٩١٢) کۆمپانیایەك لە دەڤەرەکە کاریدەکرد، بۆیە خەڵك ناوینا (کۆبانی) لە جیاتی کۆمپانی.

من دڵنیام پێش ئەو دوو ناوە، ناوێکی سریانی، یا کوردی هەبووە، چونکە شاری (ڕەها)، کە کۆبانی بەشێك بووە لێی لە تەوڕات هاتووە .

## ١٠- عــەفرین :

لە شارۆچکەی (عەفرین)ەوە کورد لە تخوبی عەرەبستانی سوریا، یا شامی عەرەبی نزیك دەبێتەوە . شاری عەفرین یەکێ لە شارەکانی حەلەبە . ڕاستە لە حەلەب و ئەدلب و دیمەشق کورد هەن، بەڵام ئەو کوردانە، یا سیاسی، بازرگان، یا هزرڤانن .ئەم شارە دوورترین شاری کوردیە، لە هەردوو کوردستانی باکور و ڕۆژئاوا و، نزیکترین شارە لە تخوبی سوری .

شاری عەفرین وەك زۆری شاری کورد، شارێکی شاخاویە، بەرزترین لوتکەی بریتیە لە گرێی مەزن، کە بەشێکە لە چیای تورو.

# ئەقلیمی جەزیرەی ڕۆمی

### ١- ئۆرفا یا شانتی ئۆرفا:

ئەم شارە لە سەردەمی ڕۆمەکاندا شارێکی کریستیانی بووە، زۆربەی بولدانیەکان لەوانە: (ئیبن فەقیە) و (ئەبو فیدا) دەڵێن: "زیاتر لە (٣٠٠) دێری کریستیانەکانی لێبووە" - (مامل، ل١٤١). (ئۆرفە) لە ئارامی بە ناوی ( ئۆرهای )، لە سەردەمی لاتینی ( رۆمی ) - ئەدیسا بووە، عەرەبە کریستیانەکانیش ناویان ناوە (ڕوها )."

لە سەردەمی ئەشکانیەکانەوە، ڕۆمەکان هەر لە (٢١٢) دەستیان بە سەر داگرتووە . پێش ئەوەی (عەیازی کوڕی غەنەم) لە ساڵی (٦٣٨) بە صوڵح لە (١٨ك) بیگرێت، ( ئەحمەد خەلیل، ل١٥٨) ڕۆم و ساسانی هەر شەڕیان لە سەر کردووە - صولحی (روها ) لای زۆر مێژوونووسان هاتووە، لەوانە بەلازری (ل١٨٠).

کەواتە موسڵمانەکان ناوی ( روها ) یان لە (ئۆرهای ئارامی ) داتاشیوە، ناوی کوردی لەم هاوکێشەیە لە کوێیە؟؟

### ٢- نەصێبین:

نەصێبین، نەك نوسەیبین شارێکی کۆنی کوردییە، ناسراوە بەوەی دووپشکی بکوژی تێدایە - (قەرەداغی ٦٦،٢٠٠٦.) (لسترنگ ) لە (١٢٤)ی (بلدان الخلافة الشرقية) دەڵێت: نەصێبین لای ڕۆمەکان (نسبیس) بوو، لای جیوگرافیناسانی گریك ساکۆراس یا مەگدۆنیس بوو. "بەپێی ڕێککەوتنی (٣٦٣) نێوان (شاپوور)

و (جوفیان)، رۆمەکان ناچاربوون دەستبەرداری هەندێ شوێنی وەك: نەصێبین و ژەنگار و بەشێکی ئەرمێنیا و هەرێمی ئیبریا - جۆرجیا - بۆ فارسەکان ( تەها باقر،ل١٣١).

کەواتە: چۆن (نەصێبین) و (ژەنگار) بەر لەو مێژووە، دوو شاری کریستیانی خاوەن کەنیسە بوون، ئەوهاش بوونە شوێنی ئاتەشگا و زەردەشتیەت، بە جۆرێك ناوێك لە ناوەکانی ژەنگار ( شەنگ + ئار = ئاگری قەشەنگ ) دەلالەت لە هەبوونی زەردەشتیەت لە ژەنگار دەکات .

ئیبن حەوقەل لە (ل١٨٧) باس لەوە دەکات، کە (نەصێبین) شارێك بووە لە شارەکانی هەرێمی جزیرە .

(نەصێبین) وەك خۆی نەماوەتەوە

## ٣- مـــاردیـن:

لە ماردینیش رێژەیەکی زۆری کریستیان هەبووە. ئەم شارە سریانیە بە سریانی پێیدەڵێن: (محاا.م) بە واتای قەڵا. مامل لە (ل٢٧٩) (تقویم البلدان) دەگوازێتەوە کە ئەبو فیدا وتویەتی: "ماردین شارێکی سەخت و قایمە لە سەر چیایەکی بەرز بنیاتنراوە، کە بەرزیەکەی دوو فەرسەخ / ١٢کم -ە .

ماردین، کوردیەکەی لە کوێیە، تا ئیسلام بە عەرەبی بکات ؟؟؟

## ٤- ئـامـەد - دیاربەکر:

بە پێی جیوگرافیناسەکانەوە شاری (ئامەد) دەکەوێتە بلادی جەزیرەوە، باشووری رۆژئاوای روباری (وان)ەوە. (ئامەد) وشەیەکی کوردی نییە، بەڵکو لە دۆکیۆمێنتەکانی ئاشووری و رۆمیەکان بە ناوی: (ئاماد) و (ئامەد) هاتووە. لیسترانگ باوەڕی وابووە: " کە ئامەد ناوەندی وڵاتی (کوردۆئین) بووە. ماوەیەك فارسەکان دەستیان بە سەر ئامەد داگرت (تەها باقر،ل١٣٠).

ئازاد دێرکی لە (ل٦٧) مۆرکەکی کوردی بە ناوی شارەکە دەدات و دەڵێت: ناوی شارەکە لە - ئامادە - هاتووە، کە هەموو کاتێك بەرگریان لە سوری مەزنی شارەکە کردووە ." بەڵام هەر خۆی لە هەمان لاپەڕەدا لە (سپایزەر) دەگوازێتەوە، کە بە میدیەکانیان دەوت : (مید، ئامادا، مادا) .

پێش ئیسلام ماڵتدارەکانی عەرەب بۆ پووش و پاوان و تێرکردنی مەڕ و ماڵاتیان وەك عەرەبی کۆچەریی لە ئاقاری (ئامەد) گیرسابوونەوە، بۆیە ئیبن حەوقەل لە (ل١٨٩) ناوی ئەو قەبیلە عەرەبانە دەهێنێ وەك قەبیلەی (ڕەبیعە) و (موزر) کە لە نێوان دجلە و فرات نیشتەجێبوون ."

هەرچی یاقوت حەمەویە لە (ل٥٦)ی بەرگی یەکەمی (معجم البلدان) دەنووسێت: "ئامەد لە هەموو شارەکانی دیار بەکر مەزنتر و بەربڵاوترە و لە ساڵی (٢٠ك) فەتح کراوە.." هەروەها لە (ل٢٣٦)ی بەرگی دووەم دەڵێت: دیاربەکر سنوورێکی فراوانی هەبووە، سنوورەکەی ڕۆژئاوای دیجلە و ناوچە چیاییەکانی، کە بە سەر (نەسیبین) دەڕوانی ." ئاقاری ئامەد بە واری - دیار - بەکر و (موزر) دەهێنێت . ئازاد دێرکی هەر لە (ل٦٧) نادادوەرانە دەنووسێت: من باوەڕم وایە: کاتی عەرەبەکان گەیشتنە ناوچەکە، ناویانا: دیاربەکر "

لە ڕاستیدا (بەکری کوڕی وائل) لە ئەنجامی شەڕی لەگەڵ قەبیلەی (ڕەبیعە) لە سەردەمی جاهیلی سەری خۆی هەڵگرتووە، لە ئاقاری ئامەد گیرساوەتەوە، هەروەها قەبیلەکەی (بکر) تەرەفێك بووە لە شەڕی (بەسوس)، موحەممەد مەولی لە (ل١٤٢ )ی کتێبی (أيام العرب في الجاهلية)، دەڵێت: شەڕی (بەسوس) لە ساڵی (٤٩٤) قەوماوە !!.

کەواتە چۆن ناوی (ئامەد) کوردی نییە، ئەوهاش ناوی (دیاربەکر ) بەرهەمی ئیسلامی نییە.

## ٥- حەڕڕان:

حەڕڕان شارێکی زۆر کۆنە دەکەوێتە باکوری جەزیرە، دەکەوێتە ڕۆژئاوای (سەرێ کانی) تەنیا (٤٥ کم) دوورە لە شاری ڕەها ( ئۆرهی بە ئارامی، ئەدیمتا بە یۆنانی) شاری (ڕەها) و دەوروبەری، هەروەها حەڕڕان ولایەتێکیان پێکدەهێنا بە ناوی: (الان ( اران، شانلی ئۆرفە) حرڕان لای هەر نەتەوەیەك ناوێکی هەبووە لای ئاشوریەکان (شاریا)، لای یۆنانیەکان (خاران)، لای ڕۆمانیەکانی رۆژئاوا (کاریا )،لای ڕۆمە بیزەنتیەکان (هلینوپۆلیس )،(حرڕان) لای موسڵمانەکان.( ئیبن حەوقەل، ل١٨٧)،( یاقوت حەمەوی،ل١٣٠ب.٢).

شوان عوسمان لە (ل٢٤)ی ماستەرنامەکەی باس لەوە دەکات، کە حەرڕان (بەهاران ) بووە و بە عەرەبی کراوە." فازل قەرەداغی لە (ل٦٧) وەڵامی شوان دەداتەوە و دەنووسێت : " حەرڕان ناوێکی زۆر کۆنە و کاك شوان لە گیرفانی خۆی ناوی - بەهارانی - دەرهێناوە.ناوەکە چوار هەزارە کۆنە و لە سەرچاوە مێخییەکاندا بە شێوەی - خەررانوم -، دواتر - خەررانو - ڕەنگە هەر حەررانو بێت ) هاتووە و، چەند واتایەکی بە ئەکەدی هەیە، کە یەکێکیان - ڕێگە- یە ."

یاقوت حەمەوی لە (ل١٣٠-١٣١) بە پێچەوانەی دکتۆر شوانەوە دەڵێت: یەکێ لە واتاکانی حەرڕان بریتیە لە: تینوێتی لە گەرما، هەروەها گەرمایەکی زۆر ." ئەم واتایەش پێچەوانەی ( بەهاران)ی شوانە!

یاقوت حەمەوی لە (ل١٣١) دەڵێت : شاری (حەرڕان) لە سەردەمی خیلافەتی عومەر، پێش شاری (ڕوها) ئازادکرا، هەروەها سەرچاوەی تر بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە ڕۆمەکان لە (٢٩٦)ی میلادی هەتا (٦٢٠)ی میلادی دەستیان بە سەر داگرت، موسڵمانەکانیش لە (٦٤٠) فەتحیان کرد ( تەمارا م. گرین، مدینة اله القمر).

## ٦-غازی عنتاب:

عنتاب، یا عینتاب، شارێکی تەواو کوردی نییە، هەرچەندە زۆربەی کوردە، چونکە مەسیحییەکانیش بەشێکی دانیشتوانەکە پێکدێنن. ئەو شارە، چ لە سەردەمی عەرەبە موسڵمانەکان، چ لە سەردەمی سلجوقی و عوسمانییەکان، هەر ناوی (عنتاب)ە. هەژار موکریانی لە (ل٥٠٨) باسی وشەیەك دەکات بە ناوی: (عەنناب) دەڵێ :بەرێکی سوورە لە (سنجوو) دەکا.

## ٧- شەرناخ یان شاری نوح:

شەرناخ، شارێکی مەسیحییە کوردەکان بوو . عەرەب ناوی شارەکە دەکەنە ( شەرناق )، نزیکی بە شام و دەوڵەتی ساسانیە. چیای (جودی) نێو قورئان دەکەوێتە شار، هەروەها گۆڕی (نوح)، کوردەکانی دەڤەرەکەش دەڵێن: گۆڕی (مەم و زین)یش لەوێیە .

هەندێ لە کوردەکان باوەڕیان وایە، کە ناوی شارەکە لە ( شاری + نوح = شرناخ) بەوەش پشت ئەستورن، کە لە هەندێ زمانی کۆندا /ح/ دەبێتە /خ/.

## ٨- میافارقین:

**کێشە لە سەر ئیتیمۆلۆژی ناوی میافارقین هەیە، هەندێ لەوانە بریتین :**

١- ناوەکە وشەیەکی لێکدراوە لە ناوی کەسی و ناوی شار :

ئیبن ئەسیر لە (ل٤٠٥) و فارقی لە مێژووی (میافارقین) ناوی کەسەکە (میا کچی ئەدهی یە ) ناوی شارەکەش (فارقین)ە . (ئیبن ئەزرەقی فارقی) یەکێ لە ناودارەکانی شارەکەیە، لێرەدا (فارقین) بە واتای (خەندەق) دێت .

٢- (لسترانگ) لە (١٤٣)ی (بلدان) دەڵێت : شارەکە لە ئارامی( میرفەرکەت) و لە ئەرمەنی (موفرگن )، لە یۆنانیش( مریتروپۆلس ) دێت .

٣- عبدالرقیب یوسف لە (ل٣١)ی (الدولة الدوستكية..)دا وشەکە چەندەها

فۆرمی هەیە، وەك: (ما فارقین،مها فارقین، مفارقین).

ئەولیا چەلەبی گەڕیدە لە تەرجەمەی سەعید ناکام و ڕەشید فندی دەردەکەوێت، کە ناوی شارەکە، هەتا سەدەی پازدەش هەر مابوو، وەك دەنووسێت: " کورد هەر لە سەردەمانی کۆنەوە لەو شارەدا نیشتەجێ بوونە."

فازل قەرەداغی لە (ل٦٧) لە (ل ١٩) ی (قره عين) دەگوازێتەوە، کە خەڵکی (میا فارقین) لە تورکی موسڵمان وئەرمەنی (نەصرانین)." پێکهاتوون .ئیبن حەوقەل لە (ل٢٠٢) وا باسی شاری (میا فارقین) دەکات کە شارێکی سوورداره.." هەروەها (ئیبنو ئەزرەقی فارقی) لە (ل١٣) دا دەنووسێت : (میا فارقین) بەناوبانگترین بنەگەیە لە دیاربەکر، کە چۆن فارس و ڕۆمەکان دەستیان بە سەردا گرتووە.." (مامل) لە ئەبو فیدا دەگوازێتەوە کە شارەکە کەوتۆتە نێوان هەرێمی جزیرە و ئەرمینیا." (مامل ٢٠١٤،ل ١٤٣).
(میا فارقین) شارێکی کوردی بووە، چونکە فارقی لە (ل١٣) باسی سەرەتای فەرمانڕەوایی کوردانی لە (میا فارقین) کردووە ."

گەر بنەچەی ناوەکە عەجەمی، ئارامی، سریانی، یا یۆنانی بێت، چ لە پرسی کوردی بوونی دەگۆڕێت؟

بە کورتی، دکتۆر ئەحمەد خەلیل (٢٠٠٧) لە (ل١٥٩)ی کتێبی (تأريخ الكرد) ئازادکردنی شارەکانی هەرێمی جزیرە لە پەرەگرافێك کورت دەکاتەوە و دەنووسێت : لە ساڵی (١٩ك) و سەرەتای (٢٠ك) (عیاز) نامەدی بەبێ شەڕ وەك صوڵحی (ڕوها) فەتح کرد، دوایی ڕوویکردە (میا فارقین)، قەڵای (كفر توتى)، (نەصێبین) بەبێ شەڕ وەك صوڵحی (ڕوها) فەتحی کردن، هەروەها تورعابدین (شارۆچکەیەك لە شرناخ) و قەڵای ماردین و دارا و قەردی و بازەبدی بە هەمان شێوە فەتح کردن."

دکتۆر ئەحمەد، فەتحکردن بە داگیرکردن دەزانێت، بەڵام لە دەرخستنی ڕاستی مێژوویی دەستەوەستانە، جا کە ناوی شارەکان نەگۆڕدرابێ، شارەکانیش بەبێ شەڕ ڕزگار کرابن، بەعەرەبکردن و داگیرکردن لە کوێیە؟؟؟؟

## شاری (دارا) لە نێوان ساسانی و ڕۆمی:

هەرچەندە کێشە هەیە لە سەر بونیتنانی ئەو شەڕە لە نێوان ساسانی و ڕۆمیەکاندا .طبری لە (ل٤٠٥) باوەڕی وایە: (دارای کوڕی دارا) بنیاتی ناوە، بەڵام حەمیری لە (ل٢٣٠)ی (الروض المعطار) ڕۆمەکان بینایانکردووە. ئەو شارە لە هەرێمی جەزیرە بوو، بە دروستی دەکەوێتە نێوان (نصێبین و ماردین) - کەلسومە، ل٣٢ ) ئەو جیاوازیە لە نێونانی شارەکە بریتیە لەوەی، کە ئەو شارە کوردیەی جەزیرە، تاوێك بە دەستی ساسانی بووە، تاوێك بە دەستی ڕۆمی.

(کریستنسین) لە (ل٥٥٥) ی چاپی کوردی، پرسەکە یەکلادەکاتەوە و دەنووسێت: "قەیسەر (مەوریکیۆس) بە قۆشەنێك یاریدەی (خوسرەوی) دا بەو مەرجەی، کە شارەکانی: (دارا و مایفرێقت (میافارقین ) کە ڕۆمییەکان لە شەڕدا گرتبوویانن، بیاندا بە ڕۆم." لە گۆڤاری میسۆپۆتۆمیای ئازاری (٢٠١٢) هاتووە، کە شاری (دارا) پاشماوەی ئاساری کۆنی تێداماوە .

جەمال ڕەشید لە (ل٣٥) ی (دراسات کردیة ...) دەنووسێت: ناوی (دارا) ناوێکە لە ناوی کەسایەتی کوردی ."

ناوی (دارا) بۆ شوێنێکی نزیك (ماردین) هەروەك خۆی ماوەتەوە، بە واتای دوور بووە لە بەعەرەبیبوون .

## ٣- ئەقلیمی زۆزان - کوردستنانی ناوەڕاست:

ئەو ناونانە، لەوانەیە ناونانێکی کەلتووری بێ، خەڵکی ئەو ناوچانە دەرکیان بەوە کردبێ، کە ناوچەکەیان ساردە، بۆیە ئەو ناوەیان لێناوە . دکتۆر جەمال ڕەشید لە (ل٢٩)ی کتێبی (دراسات کردیة..) شرۆڤەیەکی سەقایی و جیوگرافی بۆ ئەو ناولێنانە دەکات : "لەوانەیە چۆن لەفزی گەرمەسێر - گەرمیان لە جوگرافیا و سەقای ناوچەکە هاتبێت، کە گەرمە ، کۆهستان - کێوەلان - چیاوی لە شاخ و داخی ناوچەکە هاتبێ، ناوی زۆزانیش لە ناوچەی سارد و کوێستان هاتبێ ."

ئەم پۆلێنە جیوگرافی و ئیدارییە، لە پێش هاتنی لەشکری ئیسلام بووە، ئەگەرنا لە سەردەمی ئیسلامی، ناوچەی (زۆزان) بەشێك بووە لە ئەقلیمی جەزیرە، بۆ پاڵپشتی ئەم ڕایە، یاقوت حەمەوی لە کاتی باسکردنی مەملەکەتی (پاکتیاس) و قەبیلەی بەختی باسی (قەڵای ئاتیل) لە ناحیەی (زۆزان) دەکات .

## ٤- کوردستانی ئەرمینی - ئەوپەڕی باکووری وڵات:

(ئەرمینیا) لە سەردەمی بەهرامی چوارەم (٣٨٨-٣٩٩) ڕەوشێکی نا ئاسایی بەخۆوە بینی، باری ناوخۆی ماڵباتی سیاسی بە جۆرێك تێکچوو، (شاپوری سێیەم) و (بەهرامی چوارەم) تیرۆرکران، بۆیە دەوڵەتی ساسانی ناچاربوو دەست لە هەندێ بەشی (ئەرمینیا) بۆ ڕۆمەکان هەڵگرێت، بۆیە هەردوو دەوڵەت بوونە خاوەنی ئەرمینیا ( تەها باقر، تأريخ ايران القديم، ل١٣٢).

لێرەدا باوەڕێك دروست دەبێت، کە بەشێك لە سوپای ئیسلام لە ڕێگای (نەهاوەندە) بەرەو (ئەرمینیا)ی ژێر دەسەڵاتی ساسانی چوو بێت، بەشەکەی دی سوپای ئیسلام بە سەرۆکایەتی (حەبیب کوڕی مەسلەمەی فەهری) بەرەو ئەرمینیای ژێر دەسەڵاتی ڕۆم چوو بێت .

(ئەرمینیا)ی هاوتخوویی باکووری کوردستان، لە دەسەڵاتی ساسانی و دەسەڵاتی ڕۆمی باشتر نەبووە، ئەویش وەك ڕای دکتۆر فرسەت مەرعی، کە دەرفەتی بۆ دروست ببا، ناوچەکانی باکووری کوردستانی داگیردەکرد." پاش ئەوەی ئەرمینیا هاتە سەر دینی (ڕۆمەکان - مەسیحیەت) لە جاران زیاتر سەبارەت بە کورد داگیرکەر دەبوو، ئەحمەد خەلیل لە (تأريخ الكرد ...)باس لەوە دەکات ئەرمینیا و ڕۆم هەردەم لە هاوپەیمانی دابوون دژ بە دەسەڵاتی فارسی، لە لایەکی دیش، باکووری کوردستانیان لە نێوخۆ دابەشکردبوو، بەجۆرێك ناوچەکە ببووە زۆربە، ببووە ڕۆمی و ئەرمەنی " (١).

## کوردیبوونی زۆربەی هەردوو بەشی ئەرمینیا :

د.علی حسون لە (ل٩)ی کتێبی (قفقاسیا بین العثمانیین و الروس) دا دەڵێت: عەرەبەکان بە ناوچەی نێوان دەریای ڕەش و دەریای (ئازوف) و دەریا قەزوێن دەڵێن: - القبج، القبجاج، یا القفجاق ." ئەو ناوچەیەش لە باشوورەوە تخومی لەگەڵ سنووری باکووری - دەوڵەتی ساسانی - ئێران، هەروەها تخومی هەیە لەگەڵ سنووری ڕۆژهەلاتی دەوڵەتی ڕۆم - هەمان سەرچاوە.

زێی (کور) یا (کورا ) لەگەڵ زێی (ئاراس)، لە زێ گرنگەکانی قەفقاسی باشوورن - هەمان سەرچاوە (٣).

دکتۆر ئەحمەد خەلیل لە (ل١٥٩)ی (تاریخ الکرد) دەنووسێت : کورد لە هەردوو دەڤەری: (ئەرمینیا و ئازەربایجان) دەژین . سنووری جیوگرافی هەردوو بەشی ئەرمینیا لای ئیبن حەوقەل،(ل٢٨٥) بەمشێوەیە بوو : " لە ڕۆژهەلاتەوە ئەقلیم جیبال و دیلم، لە ڕۆژئاواشەوە دەریای (خەزەر) لایەنی ڕۆژئاوای ئەرمەنستان و (لان) و بەشێك لە سنوری جەزیرە دەورەی داوە،لە باکورەوە (لان) و چیای (قەبەق- قەوقاس) دەورەی داوە، لە باشورەوەش سنوری عیراق و هەندێك لە سنووری جەزیرە دەورەی داوە." ئەبوفیداش لە (ل٣٨٦)ی (تقویم البلدان) ئاوا سنووری جیۆگرافی ئازەربایجان لە بەشی ڕۆژهەلاتی وڵاتی (جیل) و تەواوی وڵاتی (دێلم)ە،لە ڕۆژئاواشی ئەرمینیایە، لە باشورەوەش عیراق و پشتەوەی حلوان و بەشێك لە سنووری جەزیرەیە ."
لای دکتۆر ئەحمەد خەلیل،(ل١٦٠) ڕوباری ئاراس - ئاراکس - خەتی جیاکەرەوەی (لان) وڵاتی کوردان و ئازەربایجانە.

مامل لە (ل١٥٣)لە ئەبوفیدا دەگوازێتەوە ئەوا ئەرمینیا سێ بەشە: بەشی قالیقلا-خەلات - شیمشات،بەشی خزران - ئەقلیس-لان، بەشی بەرزەعە - بەیلەقان - باب الابواب (دەربەند)."

دکتۆر ئەحمەد لە (ل١٦٠) دا دەنووسێت :بەڵگە لە سەر هەبوونی کوردبە ژمارەیەکی زۆر، لە سەر تخومی (قەوقاز)، هەبوونی ڕوبارێکە بە ناوی

ڕوباری کورد و کەناری ڕۆژئاوای ڕوباری ئاراس .

کورد لەمێژە لە دەڤەری (قەوقاز) و باشووری (ئاراس) نیشتەجێن، هەندێك هەبوونە،کە بۆ زەمەنی میدیەکان (٧٠٠-٥٤٩پ.م و ئەخمینی ٥٥٠-٣٣١پ.م) دەگێڕنەوە .

بەگوێرەی خوێندنەوەی توێژەری ئەم توێژینەوەیە بۆ ڕوداو و، قەڵەمڕەوی شارەکان، سێ دەڤەر لە کوردستانی ئەرمینی: (ئەقلیمی کارگێڕی ئەرمینیا - ئازەربایجان، نەك ئەتنیکی) هەبوو، بۆیە دەڤەرە کوردییەکانی ئەم ئەقلیمە دەڤەری جیوگرافین:

## أ- شارەکانی ئەرمەنیا - ئەوپەڕی باکووری کوردستان (ڕۆمی ):

### ١- شاری خەلات، یا ئەخلات:

لە بەر گرینگی و گەورەیی شارەکە لە (٢٠٠٣) شارەکە بووە ماستەرنامەیەکی بەشی مێژووی ئادابی دهۆك .شاری (خەلات)یش شارێکە لە شارەکانی هەرێمی ئەرمینیا .هەر ئەبوفیدا دەڵێت: شارەکە دەکەوێتە دەشتایی، کە شورەیەکی وێرانی هەبووە .

دکتۆر حکیم بابیری لە (ل٤٧)ی ماستەرنامەکەیدا دەڵێت: (عیاز بن غنم) بە فەتحی (خەلات) کۆتایی بە فەتحی هەرێمی جەزیرە هێنا، هەروەها لە (بلازری) و (واقدی) و (قدامە) دەگێڕێتەوە، کە ئاماژەیان بەوە داوە فەتحی دەڤەری (خەلات) لە هەرێمی ئەرمینیا لە زەمەنی فەتحەکانی جەزیرە دابووە ."

**ئەو شارۆچکانەی خوارەوە لە قەڵەمڕەوی خەلات دابوون ( حەکیم ل٤٠-٤١):**

**ا- ملازکرد، ملازگرد:**

(لسترنگ)، ناوی شارەکە بە شێوەی جیا هاتووە،بەڵام ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی زمانەکان،شارۆچکەکە تەنیا (٤٢کم) لە (خەلات) دوورە.

**ب- ئەرجیش - ئەرتەشیر :**

حەکیم لە (مارکۆ پۆلۆ) دەگوازێتەوە کە ئەم شارۆچکەیە لە ژێدەرە ڕۆمانی و یۆنانی کۆنەوە بەناوی جیا هاتووە لەوانە: (ئارزیو، ئەرتەشیر،ئەرزیری، ئەرسسا بالوس) .

ئەو شارۆچکەیە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی کەناری دەریاچەی (وان) .

**ت- مــوش :**

شەرەفنامە،(٥٩٣) باوەڕی وایە: کە ناوی شارۆچکەکە لە لە (مژ) تەم دێت، چونکە ناوچەکە تەمومژاوییە . یاقوت حەمەویش لە (ل٢٢٣)ی بەشی (٥) دەڵێت: ناوی (موش) هیچ ڕەگ و ئەصڵێکی عەرەبی نییە .

**پ- بــەرگری :**

شارۆچکەی (بەرگری) وەك شارۆچکەکانی تر، وەك: ئارجیش و موش...، بەشێکن لە قەڵەمڕەوی شاری (خەلات)، هەروەها ئەو شارەش وەك ئیبن حەوقل باسی دەکات، پێش هاتنی ئیسلام هەبووە.

**ناوی شارۆچکەکە دوو خوێندنەوەی مۆرفۆلۆژی هەڵدەگرێت :**

١- بەر +گر (پێش گرد)حەکیم، (ل٤٤).
٢- بەرگری یەك وشەیە، بە واتای: (بەرەڤانی) دێت .

**٢- وان :**

شاری (وان)، یا (ڤان) شارێکی کوردیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوچەی (زۆزان) و نزیك هەرێمی جیبال بووە . ئازاد دێرکی لە (قاموس ئەعلام)، (ل٩٥-٩٦) دەگوازێتەوە، کە شارەکە لە (١٩٠٠) بەر لە میلاد لە لای میرێکی کوردی بەناوی: (شاهمر یکرد) دروستکراوە، هەتا (٣٣١)ی بەر لە میلاد، هەر لە سەر ناوە کوردیەکە ماوەتەوە، بەڵام ئەسکەندەر مەکدۆنی ناوی لێناوە: (وان) .

ناوەکە لەو دەریاچەیە وەرگیراوە، کە قەڵایەکی ناسراوی لە ڕۆژهەڵاتەوە

بە سەر دەڕوانی، حەکیم بابیری لە (ل٤٥) ماستەرنامەکەی دەڵێت : (وان) زیاتر بەو قەڵایە ناسراو بووە، نەك وەك شار .

وشەی (شاە میری کورد) بە واتای: (میری میرانی کورد) دێت. فەرهاد پیربالٚ لە (زێڕی ناو زبڵ) لە تۆماری ئەرمەنەکان دەگوازێتەوە، کە هیچ شارێك بە قەد (وان) ئەرمەنی نییە .

**٣- ئـەرزەڕۆم :**

شاری (ئەرزەڕۆم) هەر لە کۆنەوە بەناوی (کارین ) هەبووە، پاش ئەوەی لە ساڵی (٣٨٧)میلادی ئەو شارە کەوتە دەست (ڕۆم) و ناویان گۆڕی بە: (تیۆدۆسیۆ پۆلس).
شاری (ئەرزەڕۆم) لای تورك بە: (ئەرزن ڕۆم) ناسراوە، یەکێ لە شارەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتە، نیوەی زیاتر کوردە، ئەوانی تر: (ئەرمەن و چەرکەس و تورك)ن. (٤)

**٤- بەدلیس یا بەتلیس :**

مامل (٢٠١٤،ل١٥٩) لە پێناسەی شاری (بەدلیس) لە ئەبوفیدا دەگوازێتەوە، کە شاری (بدلیس) یەکێکە لە شارەکانی هەرێمی (ئەرمینیا) و دەکەوێتە نێوان: (میافارقین و خەڵات) و بە چیا دەورە دراوە، هەربۆیە زۆر ساردە و لە زستاندا بەفری زۆرە ." زۆربەی دانیشتوانی کوردن.

**٥- سـیـواس :**

فۆرمی هاوشێوەی (سیواس) لە زمانی کوردی زۆرە لەوانە (سێو)، (سێبەر)، (سێوی)، (ڕێواس )...هەیە، لە تورکیش (سیواس ) بۆتە (سیڤاس)، لە یۆنانیش بە شارەکە دەوترێ: (سیباستیا ).
بەڵگەی جیوگرافی و سەقایی لەوەی (سیواس) شارێکە لە دەڤەری (زۆزان) ئەوەیە، کە (سیواس) بە شێوەیەك ساردە لە زستاندا لە ژێر پلەی سفری، هەروەها شارەکە (٤-٥)مانگ لە ژێر بەفر دەبێ .

## ب- کوردستانی ئەرمینیای ساسانی :

سوپای ئیسلام لە ڕێگای نەهاوەندەوە، لە کوردستانی (ئەرمینیا)ی ژێر دەسەڵاتی نزیك بۆوە، کورد لە (ئەترۆپاتین) و (ئەرمینیا) هەیە، بە واتای ئەم کوردستانە دابەشبۆتە دوو دەڤەر:

### ١- ئـەترۆپاتین:

ئەترۆپاتین لای ئەرمەنەکان پێیدەوترێ: (ئەترۆپاتکان)، لای عەرەبەکانیش (ئازەربایجان). دکتۆر حکیم خۆشناو لە (ل١١٠)دکتۆراکەی دەنووسێت : (ئازەربایجان - ئەترۆپاتین) لە مینۆرسکی و دائرەی مەعاریفی ئیسلامی دەگوازێتەوە: زۆر لە کۆنەوە زێدی کورد بووە .هەروەها لە (مەسعودی) دەگوازێتەوە، کە (ئەترۆپاتین) نیشتیمانی: (هەزبانی و جەلالی و زرازی) بووە.

**لەناو هەرێمی ئەترۆپاتین چەند شارێك هەن، لەوانە :**

**أ- شــاری ورمێ :**

(ورمێ) کۆتایی سنووری (ئەترۆپاتینە) ، (سەلماس)یش، کە (٩٦کم) لە (ورمێ) دوورە، دواین سنووری (ئەترۆپاتین)ە .

شاری (ورمێ) هەندە کۆنە، لە کتێبی پیرۆز ناوی هاتووە. دکتۆر حەکیم خۆشناو لە (ل١١١) لە (ئیبن خەردابە) دەگوازێتەوە، کە شارەکە شاری زەردەشت بووە"

ژێدەرە زەردەشتیەکان باس لەوە دەکەن، کە ڕاستە زەردەشت لەم شارە لەدایك بووە، بەڵام خەڵکەکەی لە سەرەتا قەبووڵی بانگەوازەکەیان نەکردووە و شاربەدەریان کردووە. لە (ورمێ) تەنیا کورد نین، بەڵکو قەومی تریش لێ هەن .

**ب- ئەردەبیل -دوین:**

یاقوت حەمەوی لە (ل١٢١-١٢٢)ی بەشی یەکەمی (معجم البلدان)

دەربارەی شاری (دوین - ئەردەبیل) دەنووسێت: یەکێ لە شارە ناودارەکانی (ئازەربایجان - ئەترۆپاتین) بوو، پێش هاتنی ئیسلام، تەنیا شارەدێیەك بوو .

دکتۆر حسام الدین نەقشەبەندی لە ماستەرنامەکەی باسی هەبوونی کورد لە (دوین) دەکات .

لە کوردستان دا دوو ( دوین ) هەیە .( دوین)ەك لە (ئەترۆپاتین) هەیە، (دوین)ەکی تر لە ناوچەی زرارەتی، نزیك پیرمام لە باشووری کوردستان .وەك سەرچاوە مێژوویەکان دەڵێن: لە هەردوو (دوین)، عەشیرەتی (زراری) هەیە : یەکێ لەوانە (مەسعودی) لە (ل ٧٨)ی (التنبیه والاشراف)، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆش (زراری) لە دەڤەری (زرارەتی) باشووری کوردستان دەبینین .

دووری (دوین)ی ئازەربایجان لە تکریت، نزیکی (دوین)ی باشووری کوردستان مرۆ ناچار دەکات باوەڕ بە (عەبدولخالق سەرسام) بکات، نەك زۆربەی مامۆستایانی مێژوو!

**ت- شـــنۆ:**

ئیبن حەوقەل لە (ل٢٨٩) لە ناو باسی هەردوو شاری: (مەراغە) و (ورمێ)، ئاماژە بە شاری (شنۆ) دەکات و دەڵێت :مدینة کثیره الشجر و الخضر و الخیرات و الفواکه و الخصب و الاعناب.." دکتۆر حەکیم خۆشناولە (ل١١٢-١١٣)ی دکتۆرانامەکەی ئاماژە بەوە دەکات، کە ناوی شارەکە بە چەند فۆرمێك هاتووە، لەوانە: (اشنە،الاشنانی،الاشنائی،اشنویە، شنتۆ)."
هەژار موکریانی لە (ل٤٧٥)ی (هەنبانە بۆرینە) دەربارەی لێکسیۆنی (شنۆ) دەنووسێت: " ١- سروە،کزەبا ٢- هاتنی کزەبا ،٣- لەرین بە با ٤- شارێکە لە کوردستان ٥- وەرزشێکە."

**پ- مـــەراغە:**

ئیبن حەوقەل لە (ل٢٨٩)لە باسی (مەراغە)دا لەگەڵ شارۆچکەی تر ناوی دەهێنێت.ئەبوفیدا لە (ل٣٩٩)ی (تقویم البلدان) دەڵێت :(مراغە) شارێکی پاك

و بێگەرد و بەخێر و بێر بووە."

ت- خـــوی:

لەبەرایی پێش هاتنی ئیسلام، بە قسەی ئیبن حەوقەل ( خوی )شارۆچکەیەك بووە .ئەبوفیداش باس لەوە دەکات، کە (خوی ) (١٢)فەرسەخ لە (مەرند) دوورە.
هەژار موکریانی لە (ل٢٥٩)باس لە چەندان واتای (خوی ) دەکات لەوانە:

١- تایبەتی ئەو، ٢- ئارەقەی لەش ، ٣- شەونم ... لە فۆرمی (خوی ) بەواتای: خوو،ئاکار، ڕەوشت ..دێت .
" بەڵام ماجد مەردۆخی لە (ل٥٦٢)ی فەرهەنگەکەی، جگە لەو واتایانەی (موکریانی )، واتایەکی تر دەنووسێت :قووڵ :ئاوێ، کە لە ژێر زەوی هەڵدەقوڵێ."

گیوموکریانیش لە (ل٣٧٨)ی فەرهەنگی (کوردستان) دەڵێت : خۆی شارێکە لە کوردستانێ دا کەوتۆتە بەشی کوێستانێ."

ت- سـەلمـاس:

ئیبن حەوقەل لە (ل٢٨٩)باسی (سەلماس) لەگەڵ چەند شوێنێك لەوانە: (تەبریز)، خوی .. دەکات و دەڵێت :(سەلماس) وەك (تەبریز)...شارۆچکەی بچووکن لە قەبارە و ئیقتصاد." مامل لە (ل١٥٥)ی ماستەرنامەکەی لە ئەبوفیدا دەگوازێتەوە، کە شارۆچکەی (سەلماس) دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای دەریاچەی ورمێ، ئەوەش دواین سنوری ئازەربایجانە."

گیوموکریانی لە (ل٥٨٢)ی فەرهەنگی (کوردستان) دەربارەی (سەلماس) دەنووسێت: شارێکی کوردانە لە کوردستاندا ."

سەیرەکە ئەوەیە: ئێستاش (سەلماس) لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ئاوەدانە، کەچی هەژار موکریانی (١٩٨٩)لە (ل٤٤٩)ی (هەنبانەبۆرینە)دا باس لەو شارۆچکەیە ناکات، بەڵکە لە بەرانبەر وشەی (سەلماس) " وشەی سەلماس دەنووسێ و دەڵێت: بەناوی (سلماس) دێت، هەروەها گوندێکی کوردستانە،

بەعس وێرانی کرد"

**٢- ئەرمینیا :**

بەهۆی هاوسێی باکووری کوردستان لە (ئەرمینیا)، هەروەها بە هۆی هاودینی (ڕۆم) و (ئەرمەن)، جۆرە هاوپەیمانیەك لە نێوانیان دروستبووبوو. هەردوو هێزی (ڕۆمی) و (ئەرمەنی) بەشداریان کرد لە داگیرکردنی باکووری کوردستان. عبداالحمیدی دووەم لە یاداشتەکانیدا دەنووسێت: "لە نێو ڕۆم و ئەرمەن، خزمایەتی دروستبوو، بۆیە تێکەڵکردنی ڕەگەزی ڕۆمی لەگەڵ ڕەگەزی ئەرمەنی ئاسان بوو ."

أ- قەرەباغ لە نێوان هەرێم و شارۆچکەدا.
ب- ئاران لە نێوان هەرێم و شارۆچکەدا.

یاقوت حەمەوی لە (ل١١٤-١١٥)ی بەرگی یەکەمی (معجم البلدان) دەربارەی (ئاران) دەڵێت : ناوێکی ئەعجەمیە بۆ ویلایەتێکی فراوان و وڵاتی زۆر لەوانە - جنزە - ئەوەی ڕەشۆك پێیدەڵێن: (کەنجە، بەرزەعە، شەمکور، بیلقان)، هەروەها لە نێوان (ئازەربایجان و ئاران) ڕوبارێك هەیە بە ناوی: رس (ئاراس )." مامل ٢٠١٤ لە (ل١٥٨) لە (قەزوینی) دەگوازێتەوە، کە ئەو هەرێمە لە سەردەمی حوکمڕانی: (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) لە (٣٩ك) فەتحکراوە .

گیوموکریانی لە (ل٤)دا باس لەوە دەکات: (ئاران) وشەیەکی بادینیە، بە واتای: خرۆشان، کولانەوەی برینان .... ورووژاندنی سێکسی دێت .هەژار موکریانیش لە (ل٣)دا دوو واتای (ئاران) دەخاتەڕوو:

١- بنکەی ژیانی زستانەی کۆچەران، گەرمەسێر هەموو چوونە هەواران، ئێمە ماوین لە ئاران .

٢- عەزیەت و ئێش .

مامل لە (١٥٧) لە هەندێ ژێدەرەوە دەگوازێتەوە، کە ناوی (ئاران) لە

وشەی یۆنانی: (البانیا، ئاریانا) هاتووە، عەرەبە موسڵمانەکانیش کردوویانە بە (الران)، یاخود (ئاران) ."

بە دیدی ئێمە، لەوانەیە وشەی - ئاران - وشەیەکی (ئاڤێستایی) بێت، چونکە قەزوێنی لە (ل٥٢٢)ی (اثار البلاد) دەنووسێت: ئەو شارە پێش ئیسلامبوون هەبووە و گەورەترین ئاگردانی زەردەشتی لێبووە ." (ئار) لە زەردەشتیەت بە واتای ئاگر دێت، (-ان)یش لە کوردی بۆ کۆ بەکاردێت وەك کوڕان، کچان .

**ب- کەرەباغ - قەرەباغ :**

(قەرەباغ) هەم شارۆچکە و هەم هەرێم بووە . وەك شارۆچکەیەکی ناودار بووە.

وەصفی حەسەن (٢٠١٥ لە ل١٨)ی ڕۆژنامەی (باس)، (ژ.٢٦٦)دا لە پێناسەی (قەرەباغ) وەك شارۆچکەیەك دەڵێت: قەرەباغ شارۆچکەیەکی کەوناری کوردە ... میر شەمسەدین بابی شەرەفخان بدلیسی حاکمی قەرەباغ بووە.

وەك هەرێمیش ئەم شار و شارۆچکانە دەگرێتەوە: (لاچین، شووشە، گوڵباچین، کوباتلیسك، جوبرایل )(٥).

جگە لەم شارانە:(نەخچەوان و دەربەند، شێروان، باکۆ،ئار روباد) و بە دەیان شارۆچکەی تر لە (ئەرمینیا - ئەترۆپاتین - ئاران) هەبوون.

**بــــە کورتـــی:**

باوەڕم وایە لە فەتحکردنی ناوچە کوردییەکان دا، لە شکری ئیسلام بەرانبەر (ئیمپراتۆریەتی ساسانی و ئیمپراتۆریەتی ڕۆم و دەوڵەتی ئەرمەنی)، لە چوار هێڵەوە لە ماوەی (١٦-٤٠ ك) زۆربەی وڵاتی کوردانی لە بن دەستی ئەو سێ هێزە دەرهێنا:

**هێڵی یەکەم، یا قۆڵی یەکەم :**

جەلەولا - خانەقین - قەصری شیرین - حلوان - قرمسین - نەهاوەند -

دینەوەر - هەمەدان - لورستان .

**هێڵی دووەم، یا قۆڵی دووەم :**

جەلەولا - تکریت موصڵ سنجار - ماردین - نەصێبین - ئامەد .

**هێڵی سێیەم، یا قۆڵی سێیەم :**

شـــام

**هێڵی چوارەم، یا قۆڵی چوارەم .**

أ- قەزوێن - ئازەربایجان - قەبج - ئەرمینیا .
ب- ڕەقە - عین الورد - ئەرمینیا .

کەواتە لەشکری ئیسلام لە دوو قۆڵەوە بەرەو (ئەرمینیا — ئازەربایجان) کشا: قۆڵی ئەقلیم جیبال و قۆڵی زۆزان .

دەکرێت ئەو پێنج ئەقلیمە کوردییە لە دوو بەش کورت بکەینەوە، ئەویش:کوردستانی بندەستی ساسانی و کوردستانی بندەستی ڕۆمییە .

زۆر جیوگرافیناس و مێژوونووسی وەك: (ئەبوالفیدا و یاقوت حەمەوی و... عەبدلرەقیب یوسف) هەردوو ناوی: (عیراقی عەجەمی و ئەقلیم جیبال) تێکەڵ یەك دەکەن، لە ڕاستیدا ئەو دوو هەرێمە، تەنیا لەوەدا یەکن، هەردووك لە ژێر دەسەڵاتی ساسانی بوون،ئەگەرنا لە ڕووی سەقاوەش لەیەك جودابوون . پێش ساسانییەکان، ئەو دوو ناوچەیە لە ژێر دەسەڵاتی ئەشکانی دابوون پێیدەگوترا: (وڵاتی پەهلەوی) .

سێ هەرێمەکەی تر بە حوکمی ئەوەی لە ژێر دەسەڵاتی ڕۆمی دابوون، دەکرێ بڵێین: کوردستانی بندەستی ڕۆمی.هەرچی کوردستانی ئەرمەنییە، ئەویش سێ دەفەری جودا بوو .

# پەراوێزەکانی
# بەشی پێنجەم

١- ئەو هاتنەی ئەرمەن بۆ باکووری کوردستان هەتا سەدەی (١٩ و ٢٠ و ٢١) درێژەی هەیە، بۆ نموونە:

١- ئەو چەوساندنەوەی ئەرمەنی بۆ کورد، زۆربەی کۆتایی سەدەی نۆزدەی گرتبۆوە، ئەوجارە بە زەبری ڕووسیای قەیسەری دەیویست باکووری کوردستان بەو ڕێژە کەمەی لە باکوور، کە لە (١٨٪) کەمتر بوو .دکتۆر بێشکچی لە (ل٨٠-٨٥)ی کتێبی: (سیستەم لە ئەنادۆلی ڕۆژهەڵاتی...)قسەیەکی: (ئەرۆل ئۆلو) دەهێنێتەوە : " کوردبە هیچ جۆرێك ئەرمەنیەکانیان نەچەوساندۆتەوە، بەڵکو ئەوە ناسیۆنالیستی ئەرمەنی بووە بە پاڵپشتی ڕووسیای قەیسەری، کوردی لە سەر خاکی کوردی کوشتووە،بۆ زیاتر سەیری: کوشتاری یا کوشتاری کورد بکە."

٢- گەر کورد لە پەیمانی (سیڤەر) سێ بەندی بۆ دانرا بوو، ئەرمەن شەش!

بەشێکی دی کورد لە ڕووسیای قەیسەرییەوە هەیە، ئەوەی موسڵمان بوو لەساڵی (١٩٢٩) هوە (جۆزیف ستالین)ی هاوڕێی حیزبی و ڕۆشنبیری چەپی کوردی بە سەر کۆمارەکانی سۆڤیەتی پەرت کرد، هەرچی کوردە ئێزدینیەکانی (ئەرمێنیا) لەبەر دوو هۆکار هێشتەوە :

١- دین جیاواز لە زۆربەی کوردە موسڵمانەکانی کوردستانی گەورە.

٢- شیوعیبوونیان..

ئەو کوردە زۆربە ئێزیدیانە( ١,٥٪) دانیشتوانی (ئەرمینیا)ی سۆڤیەتی

پێکدەهێنا و زۆر مافی ڕۆشنبیریان لە زەمانی حوکمڕانی شیوعیەت هەبوو، هەتا ڕادیۆی (یریڤان) و گۆڤاری (ڕێیا تازە)یان هەبوو ...

وێڕای ئەوەی ئەرمەن لە سەردەمی پێش هاتنی ئیسلامیەوە، بە زەبری ڕۆمەکان باکووری کوردستانیان داگیر کردبوو، شوێنەواری قەومیان دابووە دەڤەرەکە، ئەوەش وەك د.فەرهاد پیریال لە وتارێك بە ناوی: (کورد لە تۆماری ئەرمەنەکاندا) نووسیویەتی: ((کە شتێك نییە بە ناوی کوردستانەوە، بەڵکو ئەوەی هەیە بەئیسلام و کورد کراوە)) !!

ئەفسووس دکتۆر کەمال مەزهەر بە حوکمی شیوعیبوونی لە حەفتاکان و بەپێی سەرچاوە ئەرمەنییەکان، قسەی لە ڕەوشی کورد و ئەرمەن کردووە، زۆربەی کوشتاری ئەرمەنی بە ملی کوردەوە نایە، لەوەش زیاتر لە سالی (٢٠٠١) لە (ل٤٢٦) ی بەرگی دووەمی (چەند لاپەڕەیەك...)دەنووسێت: "خوا هەڵناگرێ کاتی خۆی کەمان پێ نەکردن، بە درێژایی مێژوو، کورد برا بچووکی هەموان بووە، تەنها ئەرمەن نەبێ."

٢- هەر لە ئەوساوە (ئەرمەن) بوو نیشتەجێی باکووری کوردستان، بە جۆرێك جیوگرافیناس و مێژووناسی عەرەبی دەرەوەی کوردستان،ناچار بوون ئەو هەرێمە کوردییە، بە کوردەکانی (ئەرمینیا) ببەن، چۆن بە کوردەکانی ساسانی دەڵێن: کوردەکانی ئەقلیمی جیبالی ساسانی....

حاجی قادری کۆیی لە دیوانەکەیدا، لە بارەی ئەو داگیرکارییە ڕەگەزییە، دەڵێت:

خاکی جزیرە و بۆتان یانی وڵاتی کوردان
سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بە ئەرمەنستان
هیچ غیرەت نەماوە، سەد جار قەسەم بە قورئان
پەیدابێ ئەرمەنستان نامێنێ یەك لە کوردان

٣- ڕوباری (ئاراس) ئەو ڕوبارەیە مستەفا بارزانی و هاوڕێیەکانی لە (١٩٤٧\٦\١٨) لێی پەڕینەوە بەرەو (شورەوی) .

٤-ڕێژەی (ئەرمەن) لەو شارە کوردیانە بە قەوڵی عەبدولعەزیز یامولکی (١٨٩٠-١٩٨١) لە (١٦،٥٪ و بۆ ١٨،٥٪) دەبوو، کەچی ڕێژەی کورد لە (٧٣،٥٪ تا ٧٩٪) دەبوو ! ئەو ڕێژە کەمینەیە بە زەبری ڕووسیا و ئینگلیز، دەیویست حوکمی باکووری کوردستان بکات.

٥- کۆماری کوردستانی سووری (١٩٢٣-١٩٢٩)بە ئازەری پێیدەوترا: (قیزیل کوردستان) بە ڕووسیش پێیدەوترێت: (کراسنایا کردستان).ئەو ناوچە ئۆتۆنۆمیدارەی ژێر حوکمڕانی کۆمۆنیستی، تەمەنی زۆر درێژ نەبوو. ئەو ناوچە ئۆتۆنۆمیدارە لە سەردەمی فلادمیر لینین لە (١٩٢٣/٧/٧) دامەزرا، جۆزیف ستالین لە (١٩٢٩/٤/٨) هەڵیوەشاندەوە، چونکە (ستالین) پەیوەندییەکی زۆری لەگەڵ کەمالییەکان هەبوو . پایتەختی ناوچەکە، سەرەتا شاری (شووشە) بوو، دوایێ گۆڕدرا بە (لاچین) شاری تریشی دەگرتەوە وەك: (کلباجار، قوبادلی).

کورد لەو کۆمارە کۆمۆنیستیەدا (٧٢٪) پێکدەهێنا، کوردەکانی ئەوێ زیاتر موسڵمانبوون، بۆیە بەسەر کۆمارەکانی سۆڤیەت دابەشکران،بەڵام کوردی (ئەرمینیا)، چونکە زۆربە شیوعی و ئێزیدی بوون، لە زێدی خۆیان مانەوە !

لەم بەشەدا قسە لە سەر پێنج تەوەرە دەکەین . چوار لە پێنجی تەوەرەکان لە یەك خاڵ یەکدەگرنەوە، ئەویش پرسی فتوحاتە، بە تایبەتی فتوحاتی ناوچە کوردییەکان . یەکەم تەوەرە بریتیە لە ئامانجی فتوحات یا گواستنەوەی ئیسلام لە جەزیرەی عەرەبی بۆ نەتەوەی تر . دووەم تەوەرە، کتێبە مێژووییەکانی بوارەکە. سێیەم، ئەو ماستەرە کوردیانە قسە لەسەر ناساندنی ئیسلام بە کورد دەکەن. چوارەم تەوەرە ئەو ماستەر و کتێبە کوردیانەی ڕەخنە لە فتوحات دەگرن. پێنجەم، ڕەخنەی ڕەخنەی فتوحاتی ناوچە کوردییەکان هەروەها ئەو وتار و کتێبانەی لە بواری ڕەخنەی ڕەخنەی فتوحاتی ناوچە کوردییەکان نووسراون .

# تەوەری یەکەم
# چەمك و ئامانجی فتوحات

گەر مێژوونێك بۆ دەرچوونی لە شکری موسڵمانەکان لە نیمچە دورگەی عەرەبی دابنێین، ئەوا پاش سوپا ڕێکخستنی پێغەمبەر - سەلامی خودای لە سەر - بۆ دەرەوەی جەزیرە، ساڵی (١٣)ی کۆچی دوای تەمبێکردن، یا دەمکوتکردنی هەڵگەڕاوەکانی جەزیرەی عەرەبی، دەسپێکی پرۆسەی پیادەکردنی گوتاری دەقەکانی قورئان بوو، کە بریتی بوون لە :

١- گەیاندنی ئیسلام بە نەتەوەی تر.

٢- پیادەکردنی عالەمیبوونی ناوی خودا.

دکتۆر زگرید هونکی (٢٠٠٩لە ل٤٧-٤٨) ی کتێبی (الله لیس کما تروجون)

دا دەنووسێت :(( ئامانج لە ئایەتی: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴾، ئامانجی فتوحاتی ئیسلامی بڵاوکردنەوەی چەمکی (الله) یە، نەك عەقیدەی ئیسلامی. هەریەك لە مەسیحی و یەهودی دەتوانن لە سەر دینی خۆیان بمێننەوە بەبێ هیچ لەمپەر و ئاستەنگێك، هەروەها بەبێ ئەوەی کەسێ ڕێگریان لێبکا خەریکی پەرستش بن لە کەنیسە و پەرستگای خۆیان ."

لە نەزەر موسڵمانەکان: جوو و مەسیحی و زەردەشتی دینی بێ خودایان هەیە، بۆیە هەموو میکانیزمێك پەیڕەو دەکرێ بۆ ئەوەی خودا بەوانە بناسرێت .

# تەوەرەی دووەم
# کتێبە مێژووییەکانی بواری
# فتوحاتی عیراق و شام و ناوچە کوردییەکان

لە دوای (١٣)ی کۆچییەوە هەتا (٣٦ کۆچی)، واتە: پاش (٢٣) ساڵە پرسی فتوحات هەر لە سەر زاری خەڵك بووە، هەروەها هەتا (ساڵی حەفتاکانی سەدەی بیستەم) پرسی فتوحات هەر پرسی دیوەخان و مزگەوت و نوخبەی نەتەوەکان بووە، هەروەها لە کۆتایی نۆوەدەکانەوە بووە پرسی توێژەری کورد و ڕەخنەگری کورد .

**کۆمەڵە کتێبێك لە بارەی فتوحاتەوە هەن، لەوانە:**

١- ابو عبدالله محمد بن عمر الواقدی لە (٢٠٧ك) مردووە، کتێبەکەی ناوی: (فتوح سواد العراق) (وڵاتگیری ڕەشەخاکی عیراق و کوردستان و ئیسلام... ئەم کتێبە لای مەلا عەبدالعەزیزی واعزی لە عەرەبیەوە کردۆتە فارسی و مەلا ڕەئووف سەلمیش بەناوی خۆی بڵاویکردۆتەوە) .

ئەم کتێبە دەدرێتە پاڵ (واقدی)، بەڵام کەس دڵنیا نییە، کە (واقدی) نووسیەتی،بەڵام جەمیل ڕۆژبەیانی لە (ل١٤)ی پێشەکی وڵاتگیری... دەربارەی ئەم کتێبە دەڵێت :

أ- لە ڕێگای چەمکی - سەید-ەوە کورد دەباتەوە سەر ڕەگەزی عەرەب.

ب- مەلایەکی کورد نووسیویەتی.

ج- شارەزای مێژووی ئیسلام نەبووە، ناوی زۆر سەحابەی لە فتوحاتی کوردستان هێناوە، کەچی هیچیان کوردستانیان نەبینیوە .

٢- ئەبو حەسەن علی بن محمد المدائنی لە (٢٢٥ك) مردوو، کتێبە ونبووەکەی (القلاع و الاکراد)ە، بەلازری زۆر سودی لەم کتێبە بینیوە . دکتۆر زرار صدیق لە (ل٩-١٠)دەربارەی ئەم کتێبە ی (المدائنی) تایبەتی کردووە بە قەڵاکانی کوردان و چۆنیەتی فەتحکردنیان ـئەم کتێبە، گەر هەبووبێ ونە. لە ڕێگای (بەلازری)ەوە بەم کتێبە ئاشنا دەبین.

٣- ابی جعفر محمد بن جریر الطبری (٢٢٤- ٣١٠).

کتێبەکەی ناسراوە بە ( تأریخ الطبری - تأریخ الامم و الملوك).

(طبری) لە (٣٠٣) کۆچی لەو کتێبە بۆتەوە . (طبری) لە نووسینی ئەم کتێبەدا، میتۆدێکی تایبەتی پەیڕەو کردووە. زۆر جەختی لە سەر سەنەد کردووە. ئەم میتۆدە، پشتبەستن بە سەنەد - شوناسی گێڕەوەکان، پێش ئەو هەندێ مێژوونووسی موسڵمان وەك: (هەیسەم بن عودەی) لە (٢٠٧) مردوو، (جعفەر ئەزمرت) لە (٢٧٦) مردوو، (واقدی) لە (٢٠٧) مردوو .-( پێشەکی کتابەکەی طبری ل١٤) پەیڕەویان کردووە.

ئەو میتۆدەی (طبری)، لایەنگر و پێچەوانەی هەبووە لای مێژوونووسە موسڵمانەکان .ئەوانەی لاساییان کردەوە بریتیبوون لە: "(ئیبن مەسکوییە، ئیبن ئەسیری جەزیری، ئیبن کەسیر، ئەبو الفدا) ئەوانەی پێچەوانەشی بوون: (یەعقووبی و مەسعودی شیعە، دینەوەری و ئیبن خەلدون.." ئەوانەی کۆتایی ڕوداوەکانیان وەك یەکەیەکی کامیل دەنووسی، با چەند ساڵێکیان بخایندبا."

(طبری) چەند خاڵی پۆزەتیڤی هەیە، بە هەمان شێوە خاڵی نێگەتیڤیشی هەیە، چونکە هەرچی گوێبیستبووە تۆماری کردووە، تەنها سەنەدەکەی لا گرینگ بووە، نەك مەتنی ڕوداوەکە . بەرگی سێیەمی کتێبەکەی، تایبەتە بە ماوەی توێژینەوەکەی ئێمە.

٤- ابی الحسن بن یحی بن جابر البلاذري، کتێبەکەی بەناوی: ( فتوح البلدان)ە. (بەلازری) لە ساڵی (٢٧٩)کۆچی مردووە . میتۆدەکەی ئەویش لەم کتێبەدا، زیاتر وەك میتۆدەکەی (طبری) بووە .

**شێوەی گەورە و بچووکی کتێبی (فتوح البلدان) تاوتوێکراوە :**

١- قەبارە گەورە، (٧٦٨) لاپەڕەیە لە پێنج بەشدا، هەردوو برایان: (دکتۆر عبدالله انیس و دکتۆر عمر انیس) تەحقیقی زمانەوانی و مێژوویان کردووە . ئەم چاپە لە ساڵی (١٩٨٧) لە بەیروت چاپکراوە .

٢- قەبارە بچووك، بەشێوەی بەش بڵاونەکراوەتەوە، بەڵکو لە دوتوێی (٢٨٦) لاپەڕە لە (٢٠٠٠)لە بەیروت چاپخانەی (دار الکتب العلمیة) بە پەراوێزی عبدالقادر محمد علی چاپکراوە.

هەردوو شێوە لەم نووسینەدا سودی لێبینراوە .

٥- ابی قاسم بن حەوقەل ئەلنصیبینی ناسراو بە (ئیبن حەوقەل)، (کتاب صورة الارض). ئەم چاپە ساڵی (١٩٧٩) لە (دار مکتبة الحیاة) لە بەیروت چاپکراوە. ئیبن حەوقەل یەکێ لەو بازرگانە گەڕیدە ڕوناکبیرانەیە، کە ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە شارناسی و وڵاتناسی ئیسلامی. ئیبن حەوقەل وەك ئەوانی دی، هەر نووسەر نەبووە، بەڵکو گەڕیدەش بووە، بە جۆرێك (٣٠)ساڵی کۆتایی ژیانی بە گەڕیدەیی بردۆتە سەر.

لە (نصێبین) لە دایك بووە و لە ساڵی (٣٦٧ك) کۆچی دوایی کردووە. کتێبەکەی پێداچوونە و تەتویرکردنی کتێبی ئەستەخری: (مسالك الممالك) ئەویش پێداچوونەوەی بەلخی (صور الاقالیم )ە، کەواتە کتێبەکەی (ئیبن حەوقل) سێ کتێبە لە کتێبێکدا. زانیارییە شارناسیەکانی ناو ئەم کتێبەی ئێمە، زۆربەی پشت ئەستوورن بە پێناسەکانی ئیبن حەوقەل. کتێبەکەی ئیبن حەوقەل(٤٣٢) لاپەڕەیە.

٦- شێخ شەهابەدین یاقوت حەمەوی رۆمی لە (٦٢٦)مردوو، ناسراو بە نووسەری کتێبی (معجم البلدان) .ئەم کتێبە ئینسیکلۆپیدیایەکە لە ناساندنی زۆر شار و شارۆچکەی کوردی، لە بەشی پێنجەمی ئەم کتێبە زۆر بە سوود بووە.

٧- عومدەی مێژوونووسان: (محمد بن محمد الشیبانی) ناسراو بە(ئیبن ئەسیری جەزیری) لە (٦٣٠) مردوو، کتێبەکەی (الکامل فی التاریخ)، بەرگی (٣،٢) کاریان لە سەر کراوە. ڕوداوەکانی هەردوو کتێبەکەی: (طبری

و بەلازری)، بەشێکی گرینگی کتێبەکەی (ئیبن ئەسیر) پێکدەهێنێت .
(ابی الفیداء عبدالله) تەحقیقی کردووە و لە ساڵی (٢٠٠٢) لە بەیروت، (دار کتب العلمیة) چاپکراوە. جیاوازی کتێبەکەی (ئیبن ئەسیر) لەگەڵ کتێبەکەی (طبری) و (بەلازری) ئەوەیە: ئەو، زۆر ڕووداوی زیاترە، هەروەها وەك (طبری) و (بەلازری)،تەواو جەخت لە سەر سەنەد نەکراوە .

٨- عمادەدین ئەبو فیدا ئیسماعیل ناسراو بە (ئیبن کەسیر) لە (٧٠٧) مردوو - (البدایة و النهایة). چاپی (١٩٩٧)لە بەیروت چاپکراوە .محەممەد عبدالرحمان پێشەکی بۆ نووسیوە و مکتب التحقیق هەم دەقەکانی تەحقیق کردووە، هەم لێدوانی لە سەر داوە . بەرگی (٧-٨) تایبەتە بە ڕووداوەکانی ئەم کتێبە.

٩- (عبدالرحمن خلدون) لە (٨٠٨) مردوو \ (تأریخ ابن خلدون).ئەم چاپە لە (٢٠٠١) لە (دار الفکر - بەیروت) چاپکراوە .(خەلیل شەحادە) زەبتی مەتن و پەراوێز و فەهرەستی بۆ کردووە، هەروەها (دکتۆر سهێل زەکار) پێیداچۆتەوە .

مێژووەکەی ئیبن خەلدون بە (المقدمة) ناسراوە . (ئیبن خەلدون) وەك مێژووناس و کۆمەڵناسێك دەردەکەوێت .هێندە لە دامودەزگا مەعریفییەکانی ڕۆژهەڵات بەناوبانگە، هێندەش لە دامودەزگا مەعرفییەکانی ڕۆژئاوا بەناوبانگە .

مێژووەکەی (ئیبن خەلدون) دەرگاکردنەوەیە لە مێژووی شرۆڤەکاریی، کە پێیدەوترێت: (فەلسەفەی مێژوو) نەك گێڕانەوەی ڕووداو وەك: (تەبەری و بەلازری. بەرگی یەکەم کە زیاتر لە (٨٤٠)لاپەڕەیە، بە تایبەتی ئەو لاپەڕانەی قسە لە سەر کۆچەری و عیبرانیەت دەکەن.

١٠- بەرگی (٣ و ٤)ی (التأریخ الاسلامی) (مەحمود شاکر) چاپی (٢٠٠٠)بە تایبەتی (١٧٣-٢٧٦)

لایەنە نێگەتیڤەکەی کتێبەکەی (مەحمود شاکر)، بەکارنەهێنانی سەرچاوەیە، بۆیە کەم بەکارهاتووە .

# تەوەرەی سێیەم
# ئەو ماستەرانەی قسە لەسەر فتوحاتی ناوچە کوردییەکان دەکەن

حکومەتی عیراقی (١٩٢١-١٩٩١) حکومەتێکی عەرەبی سوننە مەزهەب بوو، بۆیە بواری نەدەدا رەخنە لە پرۆسەی (فتوحات) بگیرێت، چونکە لای ئەو حکومەتانەی سەردەمی مەلەکی و کۆماری، بە دیدێکی کەلتووری تەماشای مێژووی ئیسلامیان دەکرد، دامودەزگای چاودێری ئەو کەلتوورە عەرەبییە، بواری نەدەدا قسەی لە سەر ئەو باسە بکرێت .

لەو ماوەیەدا لەدوو ماوەی جیاواز ساڵی (١٩٧٥ و ١٩٨٤)، کوردێکی وەك (حسام الدين النقشبندی) ماستەر و دکتۆرای لە سەر وەسف و پرسی شارستانیەتی ئیسلامی لە:

١- (الكرد فی الدينور و شهرزور) - ماستەر (١٩٧٥) .
٢- (اذربايجان دراسة سياسية حضارية) - دکتۆرا - (١٩٨٤).

نوسی ئەوەندەی من بزانم ئەو دوو تێزە لە دیدی شرۆڤەیەکی کوردی نووسراون، میتۆدەکانیان دوور بوون لە میتۆدی (طبری)، هەروەها نزیك بوو لە میتۆدی: (یەعقوبی و مەسعودی و دینەوەری) .

**لە نۆوەدەکانی سەدەی بیستەم لە ژێر سێبەری حکومەتی کوردیدا، چەند ماستەرنامەیەك لە سەر ناساندنی ئەقلیم جیبال و جەزیرە نووسران، لەوانە :**

- فائزە موحەممەد عزەت: (الكرد في اقليم الجزيرة و شهرزور في صدر الاسلام).
- ماستەرنامە (١٩٩١).
- مهدی قادر: (الحياة الفكرية و العلمية في غربى اقليم الجبال، (١٩٩٤).
- نیشتیمان بشیر: (الاحوال السياسية و الاجتماعية و الاقتصادية لغربي اقليم الجبال) - ماستەرنامە (١٩٩٤).
- احمد میرزا میرزا: (غربي اقليم الجبال في صدر الاسلام) - ماستەرنامە (١٩٩٤).
- زرار صديق: (الكورد في العصر العباسي -(١٩٩٤)).

ئەو ماستەرنامانە تایبەت نەبوون بە ڕەخنەگرتن لە پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامی...

**لە سەرەوەی دوو هەزارەکانیش، چەند ماستەرێکی دی لە بارەی ناساندنی شاری کوردی و مێژوونووسی کورد چاپکران، لەوانە :**

١- حلوان لە سەردەمی خەلافەتی عەبباسی، هەمزە کاکە یاسین لە ماوەی ساڵی (٢٠١٣) لە کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەدین نووسی .

٢- کوردستان لە کتێبی تەقویم ئەلبولدانی ئەبولفیدای ئەیوبی، موحسین مامل لە هەمان کۆلیج، ماستەری پێوەرگرت .

# تەوەرەی چوارەم
# ئەو ماستەر و کتێبانەی
# ڕەخنە لە فتوحاتی ئیسلامی دەگرن

ڕەخنەگرتن لە پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامی لە ناوچە کوردییەکان لە دوای ساڵی (٢٠٠٠)ەوە لە زانکۆی سلێمانی و کۆیە دروستبوو . لە ماوەی (٢٠٠٠-٢٠١٠) چەندان کتێب دژ بە خودی ئیسلام و پرسی فتوحاتی ئیسلامی چاپکران، لەوانە:

١- کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلامکردنی کورد، لە نووسینی: شوان عوسمان.

٢- بەعەرەبکردن لە هەرێمە کوردنشینەکاندا (٦٣٧-٨٤٧ز).

ڕەخنە لە پرۆسەی فتوحات دەگرن !

**هەروەها کۆمەڵە کتێبێك بە ناوی خواستراو و ناوی تەواو لە سلێمانی بڵاوبوونەوە، لەوانە:**

- خوێنامە، (٢٣)ساڵ پێغەمبەرایەتی، قورئان ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی، ئیسلامناسیی، کچانی خوا، سێکس و شەرع و ژن لە مێژووی ئیسلامدا ....
ئەو هەموو کتێبە ڕەخنە لە خودی قورئان دەگرن، هەروەها کەم یان زۆر، ئاماژە بە فتوحاتی ناوچە کوردییەکان دەکەن.

**هەروەها کتێبەکەی (د.زرار) درێژە بە دیدە ڕەخنەییەکە دەربارەی فتوحات دەدات:**

- زرار صدیق: کورد و کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا - (٢٠١٠).

# تەوەرەی پێنجەم
# ( ڕەخنەی فتوحاتی ناوچە کوردییەکان)

لە حەفتاکان و هەشتاکان، دوو کتێب هەبوون لە مەجلیس و مزگەوتەکان دەخوێنرانەوە، ئەویش: کوردستان و ئایینی ئیسلام ( مەلا ڕەئووف حەوێزی ) و - وڵاتگیری ڕەشەخاکی عیراق بوون-تەرجومەی مەلا عەبدالعەزیزی واعزی.

ئەو دوو کتێبە، هەردووك یەکن، ڕەئوف حەوێزی کتێبەکەی( واقدی!) بەناوی خۆی کردووە. هەردووك بەشێوازی جودان، کتێبەکەی مەلا سلیم بە هەڵبەست داڕێژراوە، ئەویتر هەموو بە پەخشان . لە ڕواڵەتدا ستایشی سەحابە لە کوردستان دەکەن، لە ناوەڕۆکدا پڕ هەڵەی مێژووین و ئیسلام زۆر ناشیرین دەکەن .

لە پێش ڕاپەڕینی (١٩٩١) هیچ ماستەرنامە و کتێبێکی دیار لە بارەی فەتحکردنی ناوچە کوردییەکان نەبوو، هەشبا، نوسەری دیندار جورئەتی نەدەکرد لە ماوەی (١٩٨٠-١٩٨٨) هیچ باسێکی دینی بورووژێنێت، چونکە عیراق لە شەڕ بوو لەگەڵ ئێران، ئەمیش بەناوی دین شەڕی دەکرد . بۆیە پاش ئەوەی لە ماوەی حوکمڕانی کوردی (١٩٩٢-٢٠١٦) بە دەرکەوتنی کتێب و ماستەرنامە بە دیدێکی ڕەخنەیی، وایکرد ڕەخنەی ( ڕەخنەی فتوحات ) دروست ببێت.

## تەوەرەی پێنجەم: ئەو وتار و کتێبانەی لە بواری ڕەخنەی (ڕەخنەی فتوحاتی ناوچە کوردییەکان) :

ئەوەندەی من ئاگادار بم، تەنیا کتێبەکەی (مەلا سەلیم حەوێزی ) لە حەفتاکان چاپکرا، کە زیاتر کتێبێکی پەند ئامێزیی بوو، نەك ئەکادیمی، بۆیە لە نێوان هەردوو بەرە دەمێنێتەوە .

وەك وتار: سەلام ناوخۆش لە ژمارە (دوو)ی ئاڵای ئیسلام ( چاپی کوردی )، (١٩٩٣) بە وتارێکی سادە دەرگای لە سەر پرسی (فتوحات) کردەوە. وتارەکە بە ناونیشانی "ئایا ڕاستە ئیسلام کوردستانی داگیرکردووە؟"بوو.

مامۆستا حەسەن پێش چاپکردنی کتێبی (کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا)، چەند نامیلکەیەکی لە بارەی پەیوەستی دەقی ئاسمانی بە کورد و کوردستانەوە بڵاوکردۆتەوە، مامۆستا حەسەن، خۆی لە (ل٧٣)ی (فەتحی ناوچە کوردییەکان) ئاماژە بەو هەوڵەی خۆی دەکات : خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ مێژووی کورد"

پاش ئەوەی ماستەرنامەکەی (شوان عوسمان) وەك کتێبێك بڵاوبۆوە، بەندە لە (٢٠٠٣) کتێبێکی ڕەخنەئامێزم دژ بە ماستەرنامەکە نووسی بە ناوی: (کورد لە نێوان بە ئیسلام کردن و ئیسلام بووندا). فازیل قەرەداغی، ماوەیەك پاش بەندە کتێبێکی بە ناوی (بە ئیسلامکردنی کورد : ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟) دەرهەق بە ماستەرنامەکەی (شوان) نووسی .

پاش ئەوەی (پڕۆژەی تیشك) نۆبەرەی کاری خۆی بە دووبارە چاپکردنەوەی کتێبە ڕەخنەی ڕەخنەی ماستەرنامەکەی شوان بۆ بەڕێز قەرەداغی لە (٢٠٠٦) چاپکردەوە، هەروەها (پڕۆژەی تیشك) بە کتێب وەڵامی کتێبی: (خوێنامە و ئیسلامناسی و شەرع و ژن و کۆمەڵگای فوئاد مەجید میسری) دایەوە .

دیاردەی ڕەخنەی ( ڕەخنەی فتوحاتی ناوچە کوردییەکان ) لە دکتۆرانامەکەی د.فوئاد ڕەشید خواستووە . پێشتر لە ئاستی وتار، ئاماژە بە ڕەخنەی ڕەخنەکراوە، بەڵام کتێبەکەی دکتۆر فوئاد ڕەشید دەربارەی ڕەخنەی ( ڕەخنەی ڕۆمانی کوردی ١٩٧٣-١٩٩٩) یەکەم کتێبە بە درێژی لەم پرسە دوابێت، باوەڕم وایە: لە ئایندەدا ڕەخنەی ( ڕەخنەی شیعری کوردی )، ڕەخنەی (ڕەخنەی چیرۆکی کوردی )سەرهەڵبدەن .

# شرۆڤەکردنی فتوحات
# لە چەند کتێب و ماستەرنامەیەك

**ئەو کتێبانە دوو جۆرن، جۆری یەکەم، هەندێ ڕۆژهەڵتناسەکان نووسیویانە، بەشی دووەمیش ڕۆناکبیری کورد نووسیویانە .**

## جۆری یەکەم: ڕۆژهەلاتناسەکان:

بزاڤی ڕۆژهەلاتناسی لە ناوەڕاستی سەدەی (دوازدە)دا بەدەرکەوت. ڕێبوار عبدالرحمن (١٩٩٨) لە (ل٤٦)ی (ئالای ئیسلام) دەڵێت : کلێسا (١٣١١-١٣١٢) لە کۆنفرانسی (ریمۆندل) بڕیاری لە سەردا، دوای ئەوەی ئیسلام هەردوو ئیمپڕاتۆری ساسانی و ڕۆمی ڕوخاند، هەروەها لە ناوەڕاستی سەدەی (پازدە) بە دروستی لە ساڵی (١٤٥٣) قوستەنتین-یان گرت، کەوتنە ڕەخنەگرتن و شێواندنی دەقی ئیسلام و بزاڤی ئیسلامی."

هەموو هەوڵێك درا، زۆربەی تاکی کورد لە ڕێی ڕۆناکبیری کوردەوە بە ئیسلام و مێژووی نامۆ بکرێت، هەروەهائیسلام وەك ئایینێکی داگیرکەر بە کورد ئاشنابکرێت.

ڕۆژهەلاتناس و ڕۆناکبیری ناو فەزای ڕۆژهەلاتناسی، هێندە بەگومانەوە مێژووی کورد و سەرەتای فتوحاتی ئیسلامیان تاوتوێکردووە، وەك بڵێ: کورد لە چەرخی زێڕینی دەوڵەتداری ژیاوە، لەشکری ئیسلام هاتووە ئەو دەوڵەت و کەلتوورە زەردەشتیەی لە نێوبردووە .

**لێرەدا تەنیا ئاماژە بە دوو کتێبی ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسانی ئەرمەنی دەکەین، کە هەردوو تەرجەمەی کوردی کراون :**

**یەکەم:** کتێبی کورد لە سەدەی حەوتەمەوە، تا سەدەی دەیەم - ئارشاك پۆڵادیان.

ئەم کتێبە لەلای سێ کەسەوە تەرجەمەی کوردی کراوە، لەو سێ وەرگێڕانە دا، وەرگێڕانی (جەلیل کاکەوەیس)مان وەرگرتووە، کە لە هەولێر ساڵی (٢٠٠٥) لە لای دەزگای (وەرگێڕان) بڵاوکرایەوە .

بەر لەوەی لەم کتێبەی (ئارشاك پۆڵادیان) بدوێین، دەمەوێ بڵێم: (پولادیان) کتێبی تری لەبارەی کوردەوە هەیە، بە تایبەتی کتێبی (الاکراد فی حقبة الخلافة العباسیة)، بە گرینگی دەزانین سەرەتا قسە لە سەر خودی (ئارشاك) بکەین .

## ئارشاك پۆڵادیان کێیە؟

(ئارشاك) ئەرمەنیەکی (ئەرمینیا)ی سۆڤیەتی پێشووە . (ئارشاك) لە ساڵی (١٩٨٤ -١٩٩٦) دوو دکتۆرای وەرگرتووە . دکتۆرای یەکەمی: (لە ژێر حوکمڕانیەتی شیوعیەت)، کە لە بارەی مێژووە، لە ئەکادیمیەتی زانست لە ئەرمینیا وەرگرتووە، لە ساڵی (١٩٩٦) دا دکتۆرایەکی دەوڵەتی لە بارەی (زانستەکانی مێژوو) وەرگرت. (ئارشاك) لە دوو بواردا توێژەر بووە :

١- توێژەری ڕۆژهەڵاتناسی لە (لینیگراد).
٢- توێژەر لە بارەی ڕۆژهەڵاتناسی لە (ئەرمینیا).

(ئارشاك) لە دوای وەرگرتنی دکتۆرای یەکەم، بە دروستی لە ساڵی (١٩٨٧) توێژینەوەیەکی بە ڕووسی لە (یەریڤان) چاپکرد بە ناوی: " کورد لە سەرچاوە عەرەبیەکان "دا هەروەها لە ساڵی (١٩٩١) کتێبێکی لە بارەی کوردان لە ئەنقەرە بڵاو بۆوە هەروەها لە (٢٠٠٣) کتێبێکی تری بەناوی: (ئیسلام دین و دەوڵەت) بڵاوکردەوە .

(ئارشاك) لە ساڵی (٢٠٠٠)ەوە سەفیر و هەڵساو بە كارەكانی (ئەرمینیا) و ڕاوێژكار بووە لە :(ئیمارات و كوێت و بەحرێن) .

(پۆلادیان) بە باكگراوندێكی مێژوویی، كە لەسەر ماتریالیزم دامەزرا بوو و، ستراتیژیتێكی چەپیەوە لە كورد و ئیسلام نزیك بۆتەوە !

كتێبەكەی (ئارشاك پۆلادیان)، كە بە عەرەبی ناوی: ( حول مسألة أصل الكرد )، لە لای سێ وەرگێڕی كورد بە تایتلی جیاواز وەرگێڕدراون، دەزانی بۆ؟ چونكە تابلێی دژە - ئیسلامە!

وەك گوتمان، ئەو وەرگێڕانەی ئێمە قسەی لە سەر دەكەین، وەرگێڕانەكەی (جەلیل كاكەوەیس)ە، كە بەناوی: (كورد لە سەدەی حەوتەمەوە تا سەدەی دەیەم)ە.

ئەم كتێبە لە ساڵی (٢٠٠٥) لە قەبارەی ناوەند لە توێی (١٦٨)لاپەڕە، دەزگای (وەرگێڕان) - هەولێر بڵاویكردۆتەوە . .

ئەوەی ئێمە لەم بەشەدا خوێندنەوەی بۆ دەكەین، لە (ل٥ تا ٥٠)یە .

هەر لە ڕستەی یەكەمی (ل٥)، نووسەر شوناس و ستراتیژیەتی خۆی ئاشكرا دەكات، كە فتوحاتی ئیسلامی بە" شاڵاوە عارەبییەكان " ناودەبات . هەژار موكریانی لە (ل٤٦٥)ی (هەنبانەبۆرینە)دا دەربارەی (شاڵاو ) دەنووسێت : پەلامار هەروەها لە (ل١٢٢)ی هەمان فەرهەنگ دەربارەی پەلامار، دەنووسێت : (( هێرش، هەڵمەت، گەمارۆ" لە خوێندنەوەی پراگماتیكی هەرسێ وشە، پێشبینی پێشوەختەبۆ پرۆسەی فتوحات دەكەن، كە هەموو شەڕ و شۆڕ و سوتاندنی تەڕ و وشك بووە .

سەیرم بەوە دێت، (ئارشاك) چۆن توێژەرێكی زانستی بووە!

هەر لە دێری (٣)ی هەمان لاپەڕە دەیەوێ شوناسی كورد بە خوێنەری خۆی بناسێنی، كە "كورد لە بزوتنەوەی خەواریج بەشداربوون"ە .

ئەو ڕستە موتڵەقانە، تەواو لە دەرەوەی توێژینەوەی زانستین، چونکە نە هەموو کورد، نە زۆربەی کورد بەشداریان لە بزوتنەوەی (خەواریج) نەکردووە، بەڵکو تەنیا کوردەکانی هەندێ شوێن بەشداری ئەو بزوتنەوەیان کردووە .

د. ئەحمەد میرزا لە (ل١١٣-١١٤) دەنووسێت: "پاش ئەوەی ئەوەی گروپێك لە خەلیفە عەلی جیابوونەوە و سەرۆکەکەیان، کە ناوی: (عبدالله ی الراسبی) بوو بەرەو (ئەقلیمی جیبال) و (مەدائین) کۆچیان کرد. لە سەردەمی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی تالێب دوو بزووتنەوەی (خەواریج) سەریان هەڵدا :

١- بزاڤی (هلال الخارجی) (٣٨)ی کۆچی هەر لە دەرەوەی کوردستان لە نێوبردرا، لە دوای ئەو، لە شەهرەزوور، بزاڤێکی کورد و فارسەکان بە سەرۆکایەتی: ( ئەبو مریم السعدی ) عەرەبی دروستبوو .

٢- بزاڤی (فروە بن نوفل) (٣٨-٤١) ی کۆچی لە (مەندەلی) و (حەلوان) و (کوفە).

لەو دوو بزاڤەدا، کورد سەرکردایەتی هیچیان نەبوو. ئەوەی یەکەم، لە سەردەمی خەلیفە عەلی کوژرا ، ئەویتریش لە سەردەمی معاویە. ( طبری، ل٨٦، ئیبن ئەسیر، ل ١٨٧ ).

پێم سەیرە، کە هاتنی موسڵمانی عەرەب بۆ کوردستان، (پۆلادیان) بە تەعریب تێدەگات، کەچی کۆچکردنی کورد پەیوەست دەکات بە بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری سەرۆك خێڵە کوردەکانەوە ، لە (ل٥) وەك ڕۆژهەڵاتناسێك تەماشای پرۆسەی (فتوحات) دەکات، بۆیە بانگەشەی ئەوە دەکات: پرۆسەکە " شالاوی عەرەبی" بووە .

کەسێك نەزانێ، وادەزانێ کورد خاوەن دین و دەوڵەتی خۆی بووە، ئیسلام هاتووە هەردووکی لە پێناو فاکتەری ئابووری کاولکردووە !!

ئەوەی شارەزای مێژوو بێت، دەزانێ کورد (١٣٠٠)ساڵ داگیرکراوی: (فارس و یۆنانی و ئەشکانی) بووە.

لە (ل٥-٦) هۆکاری نووسینی ئەم کتێبەی دەگێڕێتەوە ... لە چەرخەکانی ناوەڕاست ،مافی تەواوی خۆیان لە زانستی کوردۆلۆژیدا وەرنەگرتووە، هۆیەکەشی ناسەقامگیری و کۆنترۆڵ نەکردنی زانستیانەی سەرچاوەکانی مێژووی گشتی کوردە."

دەربارەی وەڵامدانەوەی بەشی یەکەمی بانگەشەکەی (پۆلادیان)، قسەیەکی هەمزە شوکر هەورامی (٢٠١٣) لە ل (٢٥)ی گۆڤاری (کوردناسی) دەهێنمەوە: "لە ڕۆژئاوادا لە پشت زانستی کوردناسیەوە (کوردۆلۆژی) هەمیشە ڕێگەگەلێك و ئامانج گەلێکی دیکە ئامادەییان هەبووە. زانستی کوردناسی لە ئەوروپای ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا، ڕێك وەك ئەو کوردناسییەی وڵاتانی هەرێمی وەك: ئێران و تورکیا و وڵاتانی عەرەب بە تایبەت عەرەبی ئێراق و سوریا دەستیان داوەتێ، زیاتر مەهامی ئایینی، کە لە مێژوودا نیازی تەبشیری یاخود سیاسی و ئابووری و کۆلیانیزم ئامادەیی هەبووە."

جگە لە مەهامی ئایینی، ئەوەی (ئارشاك) ئاماژەی پێدەکات، مەهامێکی چەپییە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا، سیکیولەری کوردیش، مردووی زانیاری چەواشەکاری کوردۆلۆژی و دژە - ئیسلامیە، هەر بۆیەش کتێبەکەی (ئارشاکی) بە سێ وەگێڕی جیا بڵاوکردەوە، هەروەها کتێبە پڕ هەڵەکەی (جەمال نەبەز)، دەربارەی ئیسلام بە دوو وەرگێڕی جیا بڵاوکردەوە.

بە ڕای (ئارشاك) چ بەربەست بووە، توێژینەوە لە مێژووی کورد بکرێت؟ با بۆ ئەمە هەر تەنیا ئەوەی بۆ بڵێم: کورد لە دوای کودەتای (کۆرش)، (١٣٠٠) ساڵ نەتەوەیەکی داگیرکراو بووە، نەك هەر خاکی، بەڵکو زمان و ئەلف بای دزراوە بەدەست فارسەکانەوە. (تەماشای دیاکانوف –میدیا ، بۆرەکەیی – مێژووی وێژەی کوردی (بەرگی یەکەم )بکە!

(ئارشاك) لە (ل٦) ئاپشارێتەوە، کە دەیەوێ ئەوەی لە سەرچاوە عەرەبییەکان دەربارەی کورد هاتووە، بە ڕەچاوکردنی سەرچاوە زانستییەکانی مێژووی نوێی یەکێتی شوورەوی بخوێنێتەوە" ئەو سەرچاوانەی شورەوی بە ئەقلێکی چەپی نووسراون، بۆیە (ئارشاك) و ئارشاکیەکان، (فتوحات) بە هۆکاری ئابووری

ناو دەبەن، کەواتە زانستیبوونی سەرچاوەکانی (شورەوی) لە چی دان ؟؟

لە (ل٧) دا (ئارشاك) درۆیەکی هەندە شاخدار دەکا، تەنیا کەسانی وەك خۆی باوەڕی پێدەکەن، لەو لاپەڕەیە دەنووسێت: "بە درێژایی خەلافەتی عارەبی، کوردستان لە ڕووی سیاسی و بەڕێوەبردنەوە یەکگرتوو و یەك پارچە نەبووە."

ڕاستە لە ماوەی (١٣٠٠)ساڵی بەر لە موسڵمانبوون، کوردستان لە ژێر دەستی: (ئەخمینی و سلوکی و ئەشکانی و ساسانی) بووە، بۆیە ئیبن ئەسیر بە کۆچەری فارس ناویان دەبات ( بڕوانە د.جەمال رەشید لە دراسات کردیة ..... )، نەك خیلافەی ئیسلامی، هەر بۆیە هەرپێنج بەشی کوردستان، تەنیا لە زەمەنی خیلافەی: (عومەر و عوسمان و عەلی) بوونەوە یەك پارچە، ئەگەرنا، هەر پارچەپارچە بوو. لەلایەکی دی، هیچ سەرچاوەیەکی متمانەپێکراو نییە، ئاماژە بە هیچ خیلافێکی سیاسی لە نێوان هەر چوار خەلیفەکە بکەن .

لە (ل٩) دا دەنووسێت: زانیاری دەربارەی کورد لە سەرەتای سەدەی (حەوتەم) دا بوونی نییە ." ئەو کتێبانەی دەربارەی ژیننامەی سەحابە نووسراون، زۆربە ئاماژە بە هەبوونی سەحابەیەك دەکەن بە ناوی:( کابان )، هەروەها ئاماژە بە موسڵمانبوونی کوڕەکەی دەکەن، وەك کتێبەکەی عەسقەلانی (ل٢١٠) (الاصابة في تمييز الصحابة).

لەوەش زیاتر د.عبدالله مصطفی لە (ل٣٧) و (ل٤٣-٤٤)ی (امجاد الاكراد) دەڵێت: کوردی (سۆر) سەرۆکێکیان هەبووە بەناوی: (دیلم)، هەروەها لە عەبدلحەمید حسێن دەگوازێتەوە، کە (٤-٥) هەزار شەڕکەری کورد پەیوەندیان بە سوپای ئیسلام کردووە، چونکە زۆر ڕقیان لە دەوڵەتی ساسانی دەبۆوە ."

لە کۆتایی (ل٩) (ئارشاك) ئەو دوو جۆرە کوردە لە یەك جیاناکاتەوە، کوردی شەڕکەری ناو سوپای ئیسلام، کە ئازادی وڵاتەکەی خۆی دەوێت، لەگەڵ ئەو کوردانەی ناو سوپای ساسانی .

لە (طبری) و (ئیبن ئەسیر) و (ئیبن کەسیر) و (ئیبن خەلدون)، کە فتوحاتی هەرێمە کوردییەکان بە دوو شێوە بووە : "یەکەمیان لە ڕێگای چەکەوە - زۆرداری، دووەم : لە ڕێگای پەیماننامەی ئاشتی - ڕێکەوتنەوە ."

وەك لە بەشی پێشەوە باسمانکرد، تەنیا لە بەشی عیراقی عەجەمی ( باشووری کوردستان ) بە تایبەتی لە (جەلەولا)، کوردی ناو دەسەڵاتی ساسانی، شەڕی دەوڵەتی ئیسلامی کردووە، ئەگەرنا کوردی موسڵمان شان بە شانی عەرەبە موسڵمانەکان، لە شەڕی قادسیە دژ بە فارسەکان شەڕیان کردووە، هەر بەپێی زانیارییەکانی: (بەلازری و ئەبولفیدا...)موسڵمانبوونی کورد بە هیچ نەتەوەیەك بەراورد ناکرێت .

لە (ل١٠) دەنووسێت، کە زانیاری: (دینەوەری و یەعقوبی و مەسعودی) هەندێ سیمای ئەو ماوەیە دەدەن، بەجۆرێك بە کەڵکی لێکۆڵینەوەکەی دێن ." جارێ زانیارەکانی: (یەعقوبی و مەسعودی) دەربارەی ئیسلام و کورد، جێگای گومانن، لە لایەك شیعەی توندڕەون، بۆیە دژی ئسلامی سوننەن، هەروەها زۆر دژە کوردن، دەزانی (مەسعودی) دەربارەی ڕەسەنی کورد چ دەڵێت؟ دەڵێت : " لە جنۆکەی بیژین!! ".

لە (ل١١) نزیکەی کتێبی (دە) کەسی وەك: (ئیبن خردازبە - یاقوت حەمەوی) دەهێنێتەوە، کە زانیاریەکانیان یارمەتی ئەم کتێبەی (ئارشاك) دەدەن، هەر ئەو سەرچاوانەش جیوگرافیای عێراقی عەجەم و جیبال و جەزیرە (هەموو بەشەکانی کوردستان ) دەخەنەڕوو، بەڵام ئەوانیش وەك (طبری) چیان بیستووە، یا دیتووە نووسیوە. بابزانین لە ڕوانگەی توێژینەوەی زانستی، ئەو زانیاریانە شەنوکەو کەین.

(طبری) دوای (٢٠٠) ساڵ، ئیبن ئەسیر، (٥٠٠)ساڵ، ئیبن کەسیر (٦٠٠) ساڵ، ئیبن خەلدون (٧٠٠) ساڵ، یاقوت حەمەوی (٥٠٠) ساڵ.... ئەو نووسینانە بەلای کەمەوە (٢٠٠-٧٠٠) ساڵ دوای (فتوحات) نووسراون، هەروەها زۆربەش ئاگاداری ناوچەی کوردی نەبوون، جا لەو هەموو گێڕانەوانەدا، جیاوازی هەر دروست دەبێت !

لە (ل١٢)دا سەرچاوەی ڕایەکانی ناشارێتەوە کە لە " کۆمەڵێ نووسینی ڕۆژهەڵاتناسە ڕوسەکان و بیانییەکان وەرگرتووە، ئەوانەی چەند لایەنی هەمەچەشنەی خەلافەت دەکەن ."

لە (د.ئارشاك) دەپرسم: ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە زانیاریان دەربارەی خیلافەت لە کویێ هێنا؟

لە سەرچاوە مەسیحی و سریانیەکان؟ یان لە سەرچاوە هزری و کۆلۆنیالەکانی ڕوسیا؟

ئەو سەرچاوە ڕۆژهەڵاتی و سریانیانە، سەرچاوەی گومان هەڵگرن، بۆیە ئەوە ناهێنێت زیاتر قسەی لە سەر بکەین.

لە کۆتایی (ل١٢) دا باس لەوە دەکات کە "زاراوەی: - کوردەکان- و - کورد - لە سەرچاوە مێژوویی و جوگرافیە عارەبییەکانی ناوەڕاست بە جۆرێ باسکراون، پتر سیمایەکی مێژوویی و ئەفسانەیی لە خۆگرتووە." هەتا کتێبەکەی ئەردەشێر بابەکان، زاراوەی کورد لە بڵاوکراوەکانی فارس باس نەکراون، ئەویش دوژمنی باوەکوشتەی کورد بووە.

وەك گوتمان: جەمال ڕەشید لە (ل٨٤) ی (دراسات کردیة) لە ئیبن ئەسیر دەگوازێتەوە، کە لە کۆندا دەگوترێت: کورد کۆچەری فارس بوونە.

ئەو مێژوو نووسانە، زاراوەی کوردیان لە کێ وەرگرتووە ؟؟ هەر لە ساسانییەکان! ئەو (مەسعودی)یەی تۆ پشتی پێدەبەستی، لە (مروج)..دەڵێت: کورد جنۆکەن!!

لە (ل١٣) دا ناوی کۆمەڵە ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسێکی وەك: (نۆلدکە، بارتۆلد، ساکۆبۆف ...) دەهێنێتەوە بۆ پاڵپشتی قسەکانی. فەرهاد پیرباڵ (٢٠١٥)، (ل١٨) ڕۆژنامەی (باس)، قسەی چەند مێژوونووس و گەڕیدەی وەك: (بلازری و طبری و ئیبن بەتووتە) لە سەر کوردیبوونی ( موصڵ ) و (کەرکوك ) دەهێنێتەوە، کە هیچ سەرکردەیەکی کورد جورئەتی (بلازری) نییە، کە دەڵێت: "لە سەدەی پازدەهەمدا، شارێکی سەرجەم کوردنشین بووە، تەنیا چەند هۆزێکی عەرەب لە دەوروبەرەکەی هەبوونە".

لە (ل١٤) گوایە: سەرچاوە عارەبییەکانی بەرایی بە واتای ئەو هۆزانە دێت، کە بە ئێرانی قسە دەکەن و لە ناوچەشاخاوییەکاندا دەژین و، ژیانێکی کۆچەرییانە بەسەر دەبەن، نموونەش بە قسەی (هەمزەی ئەسفەهانی ) دەهێنێتەوە،

کە عارەب کوردی (سورستانن)، ناوی کوردیش لای فارسەکان شوانەوێڵە و مەڕومالاّتدار."

لە نێو ئەو کوردناسانە، کەسێکی وەك: (مینۆرسکی) هەیە، کە دەڵێت:" میدیەکان باپیری کوردن." بە شاهێدی زۆربەی ئەوەی لە سەر (میدی) یەکانیان نووسیوە، (مید)یەکان خاوەن حوکمڕانێکی دیموکراتی بوونە ."

کورد هەتا حوکمڕانیان هەبوو، توانیان گەورەترین ئیمپراتۆری سەردەمی خۆیان، ئیمپراتۆری ئاشووری لە (٦١٢ پ.م.) لەنێوببەن، بەڵام هەرکە (کۆرش) کودەتای لەسەر ئەو دەسەلاّتە کوردیە کرد، (فارس)و (یۆنانی)و (ئەشکانی) و (ساسانی) زۆربەی کەلتووری کوردیان دزی، بۆیە بوونە کۆچەری فارس و دوور لە دەسەلاّتی شار.

مێژوونووسەعەرەبەکان ئەو ناساندنەی فارسەکانیان دەربارەی کورد گواستۆتەوە.

هەر (ئارشاك) لە (ل١٣) ڕاستی ئەو شرۆڤەی ئێمە دەگوازێتەوە: " لەو باوەڕەداین، کە ئەم زانیاریانە لە سەرچاوە عارەبییەکاندا لە نەریتە ئێرانییەکانەوە وەرگیراوە، بەتایبەتی لە کتێبی: (کارنامەی ئەردەشێری بابەك)." کەواتە ئەو ناساندنە، دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی ساسانی، نەك عەرەبە موسڵمانەکان!!

لە پەرەگرافی یەکەمی (ل١٣) هەمان شتی (ل١٢) دووبارە دەکاتەوە!

لە (ل١٥)لە: (بلازری و طبری و ئیبن ئەسیر ...)دەگوازێتەوە، کە کورد بەرەنگاری پرۆسەی (فتوحات) بۆتەوە،هەروەها دکتۆر (ئەحمەد خەلیل)یش لە (ل١٦١)دا شرۆڤەیەك بۆ قسەیەکی (بلازری) دەکات، کە شارەکان بە صوڵح ڕزگارکراون، کەچی دەشت و گوندەکان، بە شەڕ و توندوتیژی فەتحکراون، لەمەدا (ئەحمەد خەلیل) دەیەوێ بڵێ: ساسانی و دارودەستەکانیان لە شار ژیاون هەرچی کوردن لە دەشت و دەر بوونە."

سەیرم بەم شرۆڤەیە دێت، خاوەن دەوڵەت، شەڕ لە سەر دەوڵەتی خۆی نەکات، کوردی وڵات داگیرکراو لە جیاتی دەوڵەتی ستەمکاری ساسانی بکات. (ڕۆژبەیانی) لە سەر ئەو هەموو ڕقەیەوە لە پرۆسەی (فتوحات) دەڵێت: کورد

لە بەر ستەمی ساسانی موسڵمانبوونە، هەروەها ڕابەری پرۆسەی فتوحاتیان کردووە، دژی ساسانی. لەشکری ئیسلام، شەڕی سەربازی ساسانی کردووە، جا هیچ دوور نییە ستەمکاری کورد هەبوویێت لە بەرەی ساسانی بێت.

لە (ل١٦)دا، گومان لە قسەی (موحەممەد ئەمین زەکی) دەکات، کە کورد پێش (فتوحات)، پەیوەندی بە ئیسلام کردووە." لە بارەی هەبوونی کەسی کورد، کە پێغەمبەری بینی بێ، ئەو فەرموودەیە، کە (ئەلبانی) بە ڕاستی دادەنێت، دکتۆر فائیز بەکر لە (١٩٩٢) لە گۆڤاری: (دەنگی زانا) ئاماژەی پێیکردووە، هەروەها (کابان)ی کوردی لە: (کتێبی کورد لە فەرهەنگی شیعە) باسی لێوەکردووە، هەروەها (عەسقەلانی) ئاماژەی بە (کابان)ی سەحابە کردووە .

خوێنەری بە ئاگای کورد دەزانێ (ڕەشید یاسەمی) کێیە، بۆیە هیچی لە بارەی خیلافەتەوە لێوەرناگیرێت .

لە (ل١٧)دا، (پۆلادیان) چەند هەڵەیەکی مێژوویی دەکات، وەك دەڵێت: جبال واتا: چیاکان. لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا بە ناوی: عیراقی عەجەم هاتووە."

زۆر سەرچاوە، ئەقلیمی جیبال، بە عیراقی عەجەمی تێدەگەن، بەڵام ئەو دووە یەك نین، بەڵکو لە ئاو و هەواش لەیەك جیاوازن، هەروەها (طبری) و (ئیبن ئەسیر)، (بەلازری) و (ئیبن حەوقەل) ئاماژە بە وشەی (ئەقلیم جیبال) دەکەن، نەك عیراقی عەجەم .

لە (ل٤٨)دا، خوێنەر نازانێ نووسەر لە پیتی ب . باسی ئەبوبەکر صدیق، یا عومەری کوڕی خەتاب دەکات؟ سەیرکە: " لە دوای کۆچی دوایی محمد ( صلی الله علیه وسلم)، ئەبوبەکری صدیق دەسەڵاتی خیلافەتی وەرگرت و ماوەی (دە) ساڵی خایاند (١٣-٢٣) کۆچی، لە دوای لە دایکبوونی محمد(صلی الله علیه وسلم) بە (١٣) ساڵ لە دایك بووە، کاری بازرگانی دەکرد، دوای شەش ساڵ لە بانگەوازەکە موسڵمان بوو. لە سەردەمی عومەردا شاڵاوە گەورەکانی وەك: (قادسیە) و (نەهاوەندن) جێبەجێ کرا، ساڵی (٦٤٤ز) شەهید کرا."

هەر لە هەمان لاپەڕەدا لە پیتی (ت)دا. دەربارەی شەڕی (قادسیە)دا دەنووسێت: "ئەم شەڕە لە ساڵی (١٤)ی کۆچی بە سەرکردایەتی (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس) لە دەشتی (قادسیە) ڕوویدا..."

لە دوای پێغەمبەر (١١ك) هەتا (١٣ك) ئەبوبەکر بووە خەلیفە، لە (١٣ك) ش، هەتا (٢٤ك) عومەری کوڕی خەتاب بووە خەلیفە. ئەوە عومەر بوو، درەنگ موسڵمان بوو، بەڵام ئەبوبەکر هەرزوو موسڵمان بوو. زۆربەی هەرەزۆری ئەوانەی دەربارەی شەڕی قادسیەیان نووسیوە، دەڵێن: لە (١٦ك) بووە، نەك (١٤ك)!

لە (ل٢٣)دا، (پۆلادیان) ڕاستی دەبێژێت، کە لە (ل٢٣٢-٢٣٩) بابان (١٩٧٦) دەگوازێتەوە، کە ناوچەکانی: (میسۆپوتامیا و شارەزوور و سەرچاوەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی روباری دیجلە)، بوونە مەیدانی جەنگی نێوان دوو دەوڵەتی بەهێزی ئەو سەردەمە-ساسانی و ڕۆمی، بۆیە کوردی ئەو ناوچانە دووچاری زوڵم و زۆر و بەدبەختی بوون .(ڕۆژبەیانی ٢٠٠٥، ل١٣)".

لە (ل٢٧)دا، لە (بیلیان) و (یاکوفسکی) دەگوازێتەوە: هەریەك لە خودی ئیسلام و فتوحات، دەرەنجامی گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان بوون لە دوورگەی عارەبدا.."

دیتنی مێژوو بە دیدێکی مارکسیانە، هەر ئەو دەرئەنجامە جڤاکی و ئابووریەی لێدەکەوێتەوە. هەر لە هەمان لاپەڕەدا، بانگەشەی ئەوە دەکات، کە یەکخواپەرستی، دەوڵەتێکی عارەبی یەکگرتووی لێکەوتەوە، هەروەها دەڵێت: لە بانگەوازەکەیدا، موحەممەد پشتی بە هەندێ کەسی جولەکە و مەسیحی بەست."

لە بارەی دیتنی دیان - مەسیحی، پێغەمبەر لە تەمەنی (١٢) ساڵیدا، (بوحەیرە)ی ڕاهیبی بینیووە، ئەوکاتە هیچی دەربارەی دین نەدەزانی، عبداللە هەرتەلی (٢٠١٣)لە (ل٤٤-٤٥) دەنووسێت: بوحیرا، کە ناوی: (جەرجیس) بوو، قەشەیەکی خواپەرست بوو، بە دیتنی پێغەمبەر بە منداڵی، گوتی: "ئەمە گەورەی هەموو عالەمە، ئەمە پێغەمبەری خوایە..".

خوای گەورە لە ئایەتی (١٤٦)ی سوڕەتی (البقرة)، باسی قەشە و مالمەکانی جولەکە و دیانەکان دەکات، کە چۆن منداڵی خۆیان دەناسنەوە، ئەوهاش دەزانن موحەممەد پێغەمبەری خوایە، بەڵام گروپێك، لەگەڵ ئەوەی دەزانن، کە موحەممەد پێغەمبەرە، ڕاستیەکان دەشارنەوە !

لە (١٣)ساڵی بانگەوازی مەککەدا، تەنیا (وەرەقەی کوڕی نەوفەل) ئاواتی خواستووە لە کاتی بانگەواز و دوورخستنەوە لە وڵات، هاوەڵی پێغەمبەر بوایە. لە (٣) ساڵ بانگەوازی نهێنی مەککە و (١٠) ساڵی ئاشکرای، جگە لە (عەداسی) تائیفی، هیچ مرۆڤێکی ئەهلی کیتاب، پشتگیری پێغەمبەری نەکردووە، ئەویش کارەکەری ڕەز بوو. ( مبارکفوری ٢٠١٢، ل١٨٥-١٦٠).

(پۆلادیان) بە دیدێکی تەبشیرییەوە ئەو قسەیە دەکات، ئەگەرنا، جولەکەی مەدینە پاش زانینی پێغەمبەرێتی (موحەممەد)، لە موشریکەکان زیاتر شەڕی بانگەوازی پێغەمبەریان کردووە.
لە (ل٢٩)دا، لە پەرەگرافی بەراییدا دەڵێت: لە ساڵی (٦٣٩ز) بە فەرمانی عومەری کوڕی خەتاب .......لە پەرەگرافی دواتردا دەڵێت: هەر لە سەردەمی ئەبوبەکری سەدیقەوە .."
لێرەوە بۆم دەردەکەوێ، کە (پۆلادیان) (عومەر و ئەبوبەکر) تێکەڵ یەك دەکات، ئەگەرنا، هەرکەسێك شتێك دەربارەی ژیان و بەسەرهاتی ئەو دوو خەلیفەیە بزانێت، ناکەوێتە ئەو هەڵانەوە!
لای (پۆلادیان) (دینەوەر و کرماشان و هەمەدان ....) شاری کوردی نین، بۆیە لە (ل٣١)دەنووسێت : لە حەلوانەوە، شاڵاوە عەرەبییەکان بەرەو ئێران دەستی پێکرد ."

لە سەردەمی (فتوحات)دا، ئێران ناو نەبوو بۆ قەڵەمڕەوی فارسی، بەڵکو ساسانیەت هەبوو،کە بریتی بوو لە: (ڕەشەخاکی عیراق و عیراقی عەجەمی و ئەقلیمی جیبال و ئەقلیمی فارس...)کەواتە: ئێران واتای چ دەدات؟؟؟

هەر لە (ل٣١) دەنووسێت: سوپای عارەب لە ساڵی (٦٤٠ز) بە سەرکردەیی (عوتبەی خەتاب) بەرەو موسڵ - نەینەوا کشاوە."

لێرەدا عومەری کوڕی خەتاب و عوتبەی کوری فەرقەد ی تێکەڵاو کردووە، گەرنا سەحابەیەك نییە بە ناوی (عوتبەی کوڕی خەتاب).

لە (ل٤٨)لە پەراوێزی - چ -دا دەڵێت: (بەلازری) ئاماژەی بۆ ئەو ناوچە کوردنشینانەی دەوروبەری موسڵ نەکردووە."

لێرەدا دڵنیام (د. پۆڵادیان) (بەلازری) نەخوێندۆتەوە، ئەگەرنا لە (ل١٩٩) ئاماژە بە قەڵای کوردەکان لە دەوروبەری موسڵ و گوند و شارۆچکەکانی وەك مێرگ و باعەزرێ و داسنیان دەکات!!!!!!

هەروەها لە مەسەلەی موسڵ دا لە هەمان لاپەڕەدا دەڵێت: مێژووی گیرانی شارەکە و سەرکردەکە دیار نییە." ئەدی هەر لە ڕستەی پێشەوە بەهەڵە نالێیت: "عوتبەی خەتاب" بەرەو موسڵ کشا؟

ئاگات لە ڕستەی پێشەوە نییە، کە چیت وتووە؟!

دکتۆری ئەوها دەبێت!!

لەم کتێبەی ئێمە دا، ناوی ئەو سەحابە هاتووە، کە موسڵی گرتووە، هەروەها لە پاش ئەو، کێ بۆتە والی شارەکە.

لە (ل٣١-٣٢) دوو شتی سەیر دەڵێ، کە پێچەوانەی مێژوونووسە بەرایییەکانە، دەڵێ: سوپای عارەب تەنگیان بە ناوچە کورد نشینەکانی دەوروبەری موسڵ هەڵچنی".

دکتۆر زرار صدیق (٢٠١٠)، کە لە کتێبی (کورد و کوردستان...) فتوحات بە داگیرکردن تێدەگات، کەچی لە (ل١٩) لە: (بەلازری و ئیبن فەقیە و ئیبن ئەسیر دەگوازێتەوە)، کە "تەنیا ڕیوایەتێکی کورت لەبەردەستایە....وادیارە شەڕو پێکدادانی قورس ڕوونەداوە، (عوتبەی بن فرقد) گوندەکانی (مێرگ)، واتە: بەردە ڕەش و گۆرانەتی..... فەتح کرد".

وەك بینیمان، (بەلازری) و (ئیبن فەقیە) و (ئیبن ئەسیر)، ئاماژە بە فەتحکردنی ئەو ناوچە کوردییانەی دەوروبەری موسڵ دەکەن، کەچی (پۆڵادیان) لە (ل٣٢) دەبێژێت: ((بەڵام ژێدەرەکان چ ئاماژەیەك بە داگیرکردنی ئەم ناوچانە نادەن))!!!!!!

لە بەرایی (ل٣٢) دا، ئێستاش باشووری کوردستان (عیراقی عەجەمی) بە باکووری عیراق دەزانێ، بۆیە دەنووسێ: "واتا هەموو بەشی باکوور (کوردستانی عیراقی ئێستا)....".

دیسان لە هەمان لاپەڕەدا، ڕاستی دەدرکێنێت و دەنووسێت: "دەکرێ بوترێ: هێزە داگیرکەرەکان، هەردوو شێوازی ئاشتی ( ڕێککەوتن ) و سەربازی (بەزۆر)یان بەکارهێناوە." هەروەها هەر لە هەمان لاپەڕەدا، بێئاگا دەریدەخات، کە دوا ئومێدی ساسانیەکان جەنگ بووە لە پێناوماڵباتی فەرمانڕەوا، نەك دینی خەڵك: "دوا ئومێدی ساسانییەکان، تەنها جەنگ بوو، کە چارەنووسی بنەماڵەی دەسەڵاتداری لە سەر بەند بوو...".

هەر لەو لاپەڕەی سەرەوە دەبێژێت: "عارەبەکان لە پێشڕەویاندا بەرەو نەهاوەند، تووشی بەرهەڵستیەکی ئەوتۆ نەبوون ."

لە (ل٣٣) تەنیا بەشێکی ڕاستی تۆمار دەکات و دەنووسێت: "دوای داگیرکردنی نەهاوەند، عارەبەکان ڕوویان کردە (هەمەدان) و بەبێ بەرهەڵستیکردنی ( فارسەکان) داگیریان کرد."

لە وەڵامی ئەو قسەیەدا، دەڵێین: موسڵمانان دوای فەتحکردنی (نەهاوەند)، هەر تەنیا (هەمەدان)یان نەگرت، بەڵکو بەرەو قوڵایی ئەقلیم فارسیش پێشڕەویان کرد، ئەوەتە مەحمود شاکر لە (ل١٧٩-١٨٢)ی (التاریخ الاسلامی) ناوی دەیان جێگە تۆمار دەکات: (هەمەدان، دەربەند، تەبسین و شاهجان، مرو ڕۆز، بلخ،....).

هەر خۆی لەو دەقەی سەرەوە ڕاستی دەبێژێت: "کە فارسەکان، (نەك کوردەکان ) لە بەرانبەر موسڵمانەکان، هیچ بەرهەڵستیان پێنەکراوە!!

لە (ل٣٥) دا بە لێکدانەوە و گریمانی خۆی: "عارەبەکان تەنها بە شەڕ و زۆرداری شارەزووریان داگیرکردووە.."
جەمیل ڕۆژبەیانی لە (ل١٣)ی (وڵاتگیری ڕەشەخاکی...) پێچەوانەکەی (پۆڵادیان) دەنووسێت: "عارەبەکان، کە زانیویانە کوردەکان دوژمنی سەرسەختی

دەوڵەتی ساسانیین و، هەمیشە بە تاوانی ڕزگاربوون، جارێ ئاشتیان لەگەڵ سوپای عارەب دابوو، لە: (بەلازەرد و بەندەنیجین و خوزستان و حەلوان و شارەزوور)، جا بە پشتیوانی کورد هەڵگژان بە چیا سەختەکاندا بەرەو: (کرماژان - قرمیسین - و دینەوەر)، کە بە ئاشتی خۆیاندا بە دەستەوە و، ئینجا ڕوویان کردە نەهاوەند.."
هەروەها لە (ل٢٢)ڕۆژبەیانی باسی شارەزوور و زۆر شوێنی تر، وەك: (کرماشان و دێنەوەر و سیروان.....کە بە ئاشتی داگیرکراون."

ئەو دیتنەی (ڕۆژبەیانی) زۆربەی پێشبینیەکانی (پۆلادیان) لە (ل٣٤-٣٥) هەڵدەوەشێنێتەوە.

لە (ل٣٥) دەنووسێت: "ژێدەرە عەرەبیەکان ئەوە پیشان دەدەن: لە نێو ئەو گەلانەدا، تەنها کوردەکان بوون، کە لە (فارس) و (خۆزستان) و (ئازەربایجان) پتر بەرەنگاری عەرەبەکان دەبوونەوە."

ژێدەرە عەرەبیەکان لای (پۆلادیان) (ل١٧٨)ی طبری و (ل٣٩٦) بەلازریە گوایە:کورد شەڕی سوپای ئیسلامی کردووە لە کوردستان، بەڵام وەختێکی زۆرم چواند لە دۆزینەوەی ئەو دوو لاپەڕەیەی ئەو دوو کتێبە، بەڵام ڕەنج خەسار بووم، چونکە لەم دوو لاپەڕەیە، شتی ئەوها هەر باسنەکراوە! گریمان هەیە، بابزانین کوردەکان لە کوێ بەرەنگاری سوپای ئیسلامیان کردووە: ئەقلیمی فارس، خۆزستان - ئەهواز، ئازەربایجان؟ من تەنیا لە (پۆلادیان) دەپرسم ئەو کوردانە کێن،کە بەرگریان لە خاکی فارس و عەرەب و ئەرمەن کردووە، نەك کوردستان؟!

مەسعود عەبدالخالق لە (ل٣١)ی (...مەینەتی کورد) دەنووسێت: "ئیبن خەلدون و ئیبن کەسیر و چەند سەرچاوەیەکی تریش بە سەردێڕێك باسی شەڕێك لەگەڵ کورد دەکەن بە ناوی - غزوة الأكراد - وەك دەبینین ئەو شەڕەش لە دەوروبەر بووە،نەك لە کوردستان، واتە شەڕی خەڵکی تر بووە، هەندێ کورد کردوویانە."

لە (ل٣٦)دا بە ناڕاستەوخۆ دان بەوە دەنێت، کە (جزیە)ی ئیسلامی، لە پێناو مانەوە لە سەر مەسیحی و زەردەشتی نییە، بەڵکو بەرگرییە: "کەسیان نەگرێت، پەرستگایان نەڕوخێنێت، سروتی جەژنەکان بەڕێوە بچێت، ئازادی بڕوا.." (لێرە دەپرسم: ئەبو ئەژدادی پۆلادیان لە ئەندەلوس، کاتێ بەهێز و زاڵ بوون، چیان نەکرد؟؟ لە کوشتن و مزگەوت سوتاندن و دەمکوتکردنی مرۆڤی موسڵمان!!!).

لە (ل٣٧)دا دووبارە ناڕاستەوخۆ جوامێریەکی عومەری کوڕی خەتاب تۆمار دەکا: "خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب وای دادەنا،..... ئیدی بەردەوام بوون لە سەر شالاوەکان کارێکی هۆشمەندانە نییە." نەك ئەوە خەلیفە عومەر ڕازی نەبوو، موسڵمان دەریاش ببڕن - طبری و ئیبن ئەسیر.

لە (ل٣٧)دا لە (کولیسنیکۆف) دەگوازێتەوە، کە بە "فەرمانی سەرکردەکانی شالاوەکە، دانیشتوانیان تەفر و تونا دەکران، یان دیل دەکران.." لە سەرچاوە مێژووییەکانی وەك: (واقدی و طبری و ئیبن ئەسیر و بەلازری) باسی شەڕ لەگەڵ جەنگاوەرانی: (ساسانی و ڕۆمی و ئەرمەنی) کراوە، لێرەدا ئاماژەی بە هیچیان نەکردووە، لە پرسی شەڕ لەگەڵ "دانیشتوان" ئاماژە بە قسەی ڕۆژهەڵاتناسێکی دژە ئیسلام دەکات، چونکە لە ژێدەرەکانی بەرایی، شتی ئەوها چنگ ناکەوێت !

لە (ل٤٢-٤٣) باسی هەبوونی (خەواریج) لە نێو کوردان دەکات، بە جۆرێك لە (٥٠٠) خەواریجی عەرەب، لە شارەزوور بوونەتە (١٥٠٠).

لە دکتۆر (پۆلادیان) دەپرسم: بەم قسەیەی کۆتایی، زۆربەی قسەکانی (٥-٤١ - ت) هەڵدەوەشێنیەوە، چونکە (خەوارجبوون) واتای: تێگەیشتنی قووڵ لە ئیسلام دەگەیەنێت، نەك تەنیا ڕواڵەتی، بە تایبەتی لە ماوەیەکی کورت لە نێوان (٢١ك-٣٨ك )دا!

## دووەم: ئارشاك سافراستیان - کورد و کوردستان:

(ئارشاك سافراستیان) وەك: (ئارشاك پۆلادیان) ئەرمەنێکی کوردناسە . کەمال مەزهەر لە پێشەکی کتێبەکە دەنووسێت: "(ئارشاك سافراستیان) لە ساڵی (١٩٤٨) کتێبێکی (١٠٦) لاپەڕەی بە ناوی: (کورد و کوردستان) لە لەندەن بە ئینگلیزی بڵاوکردەوە، هەر زوو لە ساڵی (١٩٦٠)دا (شاڵی) بەشێکی کەمی ئەو کتێبەی (سافراستیانی) کردە کوردی —کەمال مەزهەر، (ل٥)، بەڵام باوەڕ وایە ئەو کتێبە (١٧٨) لاپەڕەی قەبارە ناوەند بێت .

دکتۆر ئەحمەد خلیل، ئەو کتێبەی (سافراستیانی) تەرجەمەی سەر زمانی

عەرەبی کرد . ئەمین شوان لە ساڵی (٢٠٠٥) هەمان کتێبی لە (١٦٤) لاپەڕەی ناوەندی بڵاوکردەوە ..لە تەرجەمەی عەرەبی و کوردیەکەدا (١٧٨-١٦٤) دەردەکەوێت، کە لەوانەیە قسەی دکتۆر کەمال مەزهەر هەڵە بێت، کە دەربارەی کتێبەکەی (سافراستیان) دەڵێت : (١٠٦) لاپەڕەی مام ناوەندییە!

دکتۆر کەمال مەزهەر، زۆر بە شان و باڵی کتێبەکەی (ئارشاك) هەڵدەداو دەنووسێت: "کوردناسێکی وەك پرۆ فیسۆر لازەرێڤ جارەهای جار لە نووسینەکانی خۆیدا ئەو کتێبەی بەکارهێناوە ."

خۆیشی وەك مێژوونووسێکی کورد لە ستایشی ئەو کتێبەی (ئارشاك سافراستیان) دەنووسێت: "زۆر کەم لە گەڕیدە و مێژوونووسە بیانییەکان، وا بە ئینسافەوە باسی مێژووی کورد و ژیانی کۆمەڵایەتییان کردووە -ل٥".

(سافراستیان) لە (٤٥-٤٨) باس لە ئیسلام و کوردستان (٦٤٠-١٥١٠) دەکات، تەنیا (ل٤٥) ی تایبەتە بە ماوەی کتێبەکەمان . با بزانین ئاخۆ (سافراستیان) ئەو کەسە بە ئینسافەیە، کە دکتۆر کەمال مەزهەر باسی لێوە دەکات !

لە (ل٤٥) دا (سافراستیان) لە بارەی فتوحاتی ئیسلامی بۆ دەرەوەی جزیرەی عەرەبی دەنووسێت: " کاتێك کە عەرەبەکان لەشکرشکێنانە بە پڕتاوی ئایینی تازەوە هاتن، کوردەکان، ئاشوورییەکان و هەموو گەلەکانی دەوروبەریان پاڵیان دایە پاڵی دەوڵەتی فارسەوە و، لە ژێر ئاڵای:- شاهی شاهان - بۆ بەرەنگاربوونی لافاوی هێرشی عەرەبەکان، کەوتنە خۆ."

ئەو قسەی (ئارشاك سافراستیان) جیاوازی چییە لەگەڵ قسەی (ئارشاك پۆلادیان)، ئەویش باوەڕی وابوو: "فتوحاتی ئیسلامی" شالاوی عەرەبەکان بوو.

جا بۆ ئەوەی شرۆڤەیەکی هەمەلایەنە بۆ پرسەکە بکەین و، مێژوو لە شتێکدا ببینین، ئەوا دکتۆر کەمال مەزهەر (١٩٨٣) لە بەرگی "مێژوو" قسەیەکی (ئەرماندۆ ساپۆری) ئیتالی دەگوازێتەوە : "مێژوو هەرگیز ناتوانێ بریتی بێ تەنها لە: مێژووی ئابووری، یا سیاسەت، یا ئەدەب، یا هی تر، مێژوو سەرتاپای هەموو ئەوانەیە بەسەریەکەوە ."

ئەو دیتنە هەمەلایەنە، بە تایبەتی خوێندنەوەی زمانەوانی دەق، چونکە وشەکانی دەق هەڵگری چەند واتایەکی پەنهانن .

هەژار موکریانی لە (ل٧٥٢)ی (هەنبانەبۆرینە) دەربارەی وشەی: (لافاو) دەنووسێت: (لاباو، لاخێز،سێڵاو) . شەوکەت مەلا ئیسماعیل لە (ل١٥٥٩)ی فەرهەنگی (مامۆستا) دەربارەی لافاو دەنووسێت: (لێزماو، لەهی، لی، باراناوی زۆر، ئاوی بە تەوژم، کە دوای باران هەڵدەستێ."

لە شیکردنەوەی هەردوو بەڕێزان دا، واتایەکی مەعنەوی دەردەکەوێت، کە (لافاو)، واتای: توندوتیژی و شەلم و کوێرم ناپارێزم، ڕادانی تەڕ و وشك دەدات. لە پرسی شالاویش، بۆ (ئارشاك بۆلاند)یانمان ڕوونکردەوە، ئەویش واتای: توند و تیژی و تەڕ و وشك ڕامالین دەدات...لە دکتۆر کەمال دەپرسم: ئەوە بە ئینسافیە، یا ئایدیۆلۆژییە؟؟!

سەبارەت بە مێژووی دێرین، ئایا پاش هاوپەیمانی (میدی - بابلی)، ئاشووری بە دەسەلات لە کوردستان مابوون؟

کام ژێدەر پاڵپشتی ئەو ڕایەی (سافراستیان) دەکات ؟ ئەوەندە ئاشووریەی دوای ئەو هەرەسە - هەرەسی نەینەوا، بوونە بەشێك لە دەوڵەتی (بابل)ی، کۆرشیش دەوڵەتی (بابل)ی لەنێو برد، کەواتە: ئاشووری چی؟

لەلایەکی تر، تۆش وەك (تۆفیق وەهبی) دان بەوە دەنێی، کە ساسانیەکان، (فارسی) بوون! جگە لە شەڕی (جەلەولا)، کوردەکانی خانەقین و حەلوان، هیچ کوردێك بەرەنگاری هاتنی موسڵمانەکانی نەکرد، بەڵکو وەك د.عبداللە مصطفی و جەمیل ڕۆژبەیانی (ل١٣) وتەنی: کوردێکی زۆر چوونە ڕیزی موسڵمانەکان، چونکە لە دەرفەتێك دەگەڕان، ڕزگاریان ببێت لە دەسەلاتی ستەمکاری بنەماڵەی ساسانی....

کەواتە داگیرکراوی کورد و ستەمی ساسانی، دوو هۆکارن لە داماڵینی وشەی ( لافاو، شالاو ) لە فتوحاتی ئیسلامی .

هەر لە (ل٤٥)دا (سافراستیان) درۆیەکی دی تۆمار دەکات و دەنووسێت: "ئەو مێژوونووسانەش، کە بە چاوی خۆیان ڕووداوەکانیان بینیوە، چ ئەرمەنی و، چ عەرەب، چ سوریایی، چ ڕۆمی بیزەنتی، باسی گەلێ جەنگی پاڵەوانانەی

کوردەکانیان دژ بە هێرشبەرەکان کردووە."

نازانم چ ژێدەرێك باسی هەبوونی (ئەرمەنی) کردووە لە عیراقی عەجەمی و ئەقلیم جیبال؟؟ ئەو (ئەرمەنە)ی هەبووە، بە یاریدەی ڕۆمەکان، باکووری کوردستانیان بۆ خۆیان داگیرکردبوو بێگومان ئەو داگیرکەرە ئەرمەنیانە بە ئینسافەوە باسی فتوحاتی ئیسلامی ناکەن، چونکە بە فتوحات، کۆتایی بە داگیرکاریی ئەوان هات لە باکووری کوردستاندا .

پێم سەیرە هیچ سەرچاوەیەکی ئیسلامی باسی ئەوە ناکات، کە هیچ مێژوونوسێکی عەرەب، هەتا (سەد) ساڵیش دوای (فتوحات) هاتبێتە کوردستان، نەك مێژوونووسێکی عەرەب بە چاوی خۆی ڕووداوەکانی فتوحاتی بە چاوی سەری بینیبێت!! مێژوونووسی سوریایی سەردەمی (فتوحات)، گومانێکی ترە (سافراستیان) لێرە دەیورووژێنێت .

کەلسومە جەمیل لە (ل٢١٦-٢١٧)ی کتێبی: (مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیك) باس لەوە دەکات: یۆنانییەکان زاراوەی (سریا)، نەك سوریا بۆ وڵاتی شام بەکاردەهێنا، بە واتای: لە سەردەمی فتوحات، ناوی وڵاتی شام هەبوو، کە پێشان (فینیقی) و (ئارامی) و (عیبرانی)تێدا ژیا بوو . لە لایەکی ترەوە، وشەی وڵاتی شام: (سوریای ئێستا و لوبنان و فەلەستین و ئوردنی دەگرتەوە!

دەپرسم: لە کاتی فتوحات دا، کام مێژوونووسی "سوریایی" لەوێ بوو، بە چاوی خۆی ڕووداوەکانی بینیبێت: عەرەب، کورد، دروز،..؟

ئاخر پسپۆری بە ئینساف! مێژوونووسی: (ئەرمەنی)، (عەرەب)، (سوریایی) لە کوردستانی ساسانی چی دەکرد؟! پەیامنێر و ڕاپۆرتنووس بوون؟؟

ئەوە دیتنی دوێنێ نییە بە چاوی ئەمڕۆ، دەترسم (ئارشاك)، ئەو قسانەی لە پێستەکەی د.سەعیدی سنەیی وەرگرتبێت! ئەگەرنا زۆربەی کورد بە ئاشتی و صوڵح موسڵمان بوونە، نەك جەنگ و هەرا.

(ئیبن ئەسیر) و (ئیبن خەلدون)... تەنها باسی یەك - دوو شەڕ لە نێوان لەشکری ئیسلام و کورد دەکەن، تەنانەت خودی (ئارشاك پوڵادیان) بە ڕاشکاوی دەڵێت: (ئەو شەڕانە لە دەرەوەی کوردستان بوون، نەك کوردستان).
کەواتە: ئەو کوردانە پیاوی دەوڵەتی ساسانی بوون، نەك پیاوی کوردستان .

لە نیوەی (ل٤٥)دا جیا لەم چەند دێرە، (ئارشاك سافراستیان) ڕاستیەکان تۆمار دەکات: "بە گوێرەی ئەو سیاسەتەی، کە هێرشبەرەکان لە سەری دەڕۆیشتن بچوونایەتە هەر وڵاتێك لەوێوە بەناوی خەلیفەوە بانگەوازی خەڵکی وڵاتەکە و دەوروبەریان دەکرد، کە یان وەرنە سەر ئەم ئایینە تازەیە، یان دەبێ باج و خەراج بدەن ." ئەم قسانەی (سافراستیان) تەواو پێچەوانەی قسەکانی سەرەوەیەتی.

لێرەدا، لافاو و شاڵاو و هەڵمەت و جەنگی پاڵەوانانەی کوردەکان نییە، بەڵکو "بانگەواز" حزووری هەیە، بۆ ئەوەی زەردەشتی و مەسیحیەکان بێ شەڕ بێنە ناو ئەم ئایینە تازەیە. یان باج و خەراج بدەن! دکتۆر ئەحمەد میرزا لە (ل١٧)ی نامیلکەی (انتشار الاسلام فی کوردستان) دەڵێت: باج و جزیە بۆ بەرگری بووە، نەك دینپارێزی بێ. هەر لە (ل٤٥) (سافراستیان) بەرگری لەو بۆچوونە دەکات و دەڵێت: "ئەم باج و خەراج دانانەشیان بۆ ئەوە نەبوو، سەرشۆڕی و نزمی بەو گەلانە بنوێنن، کە دەکەوتنە ژێر ڕکێفیانەوە، بەڵکو وەکو سەرچاوەیەکی دارایی و دەرامەد بۆخۆیان بەکاریان دەهێنا."

کێشەی ململانێ لە دەوڵەتی ساسانیدا حزووری هەبوو، بەڵام ئەو کێشەیە لە دەوڵەتی ڕۆم زۆر کەمتر بوو، بۆیە زۆربە کوردی کوردستانی ڕۆمی، یان موسڵمانبوون، یان ئامادەبوون (جزیە) بدەن، بۆیە دیانەکانی زۆر لە کوردستانی ڕۆمی هەن!

لە کۆتایی (ل٤٥) (ئارشاك سافراستیان) دەنووسێت: "عەرەبەکان ئیسلامیان بەزۆر بەسەر سەرزەمینی ئێراندا داسەپاند، چونکە فارسەکان خوانەناس بوون و سروشت پەرست .. "

لێرەدا (سافراستیان) تووشی دوو هەڵە دەبێت:

١- دەسەڵاتی ساسانی لە بەرایی، کە دروستبوو، دەسەڵاتێکی ئایینی بوو، (ئەردەشێر) دوای دەمکوتکردنی (ئەشکانییەکان) لە (٢٢٦) ی میلادی بڕیاریدا زەردەشتیەت بکرێتە ئایینی ڕەسمی وڵات، تا شوێنی ئایینی (مەقدۆنی) و (سلوکی) و (ئەشکانی) بگرنەوە، کەواتە: ساسانیەکان خواناس بوون، نەك خوانەناس. (کارل بروکمان ١٩٧٩ لە ل٧٩ )ی (تأریخ الشعوب الاسلامیة) دەنووسێت: ولقد عوملص الفرس اتباع زرادشت في ما بعد، معاملة اليهود و النصارى اذ

اعتبرهم المسلمون من أهل الكتاب." کەلسومە جەمیل لە (ل ٤١) ماستەرنامەکەی وتەیەکی خەلیفە عومەر دەهێنێتەوە، کە دەربارەی زەردەشتیەکان گوتویەتی: سنوا بهم سنة أهل الكتاب.

٢- ساسانیەکان سروشت پەرێس نەبوون، بەڵکو زەردەشتی بوون و کتێبی (ئاڤێستا) یان هەبوو.

جگە لە هەردوو شاری: (جەلەولا و نەهاوەند)، زۆربەی شارە کوردییەکان بەئاشتی گیراون، هەروەها لە شارەزوور، بزاڤێکی خەواریجی لە ماوەی کەمتر لە (٢٠) ساڵ دا دروست بوو، ئەو بزاڤەش بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە کەسانی زۆر نزیکن لە دەقی قورئان و فەرموودە.

لە ڕستەکانی کۆتایی (ل٤٥)دا دەنووسێت: عەرەبەکان بەرانبەر گەلانی تر، گەلانی (اهل الكتاب) نەرم و سوکبار بوون، لە ماوەی نزیکەی (حەفتا) ساڵدا (٦٤٠-٧١٠) چەند ڕێککەوتنامەی ئاشتی لەگەڵ گەلە خاوەن کتێبەکانی نێوان ڕووباری دیالە و چیاکانی قەفقاسدا بەسترا."

زۆربەی شارە - کوردییەکانی بن ڕکێفی ڕۆمی، بە ئاشتی و صوڵح موسڵمان بوون، یا لە سەر دینی خۆیان مانەوە، ئەوە وایکرد، تاکو ئێستاش ڕێژەیەکی زۆر لە باکووری کوردستان هەبن .

ئامانجی بنەڕەتی (فتوحات) بریتی بوو لە: ناساندنی چەمکی (الله) بە نەتەوەکان، گەر هەڕەشەی ڕۆمی و ساسانی نەبوایە، میکانیزمی شەڕ دوا دەرفەت بوو، گەرنا خەلیفە عومەر، چەندان جار ویستویەتی بە شەڕ نەیەتە کوردستان، بەڵام دەسەڵاتی ساسانی، هەر هەوڵی دەدا کوردستان بکاتە شەڕگە.

# نووسەرە کوردەکان و
# پرسی فتوحات

هەڵمەتی هەندێ نووسەری کورد لە سەر خودی قورئان، لە دەیان ڕۆژهەڵاتناس خراپترە . زۆربەی نوسەری کوردی شەست و حەفتاکانی سەدەی بیستەم، بەقەد دووری ئاو لە بیابان، ئەوەندە لە چەمکی قورئان و مێژووی ئیسلام دووربوون.

ئەو دووربوونە، دووربوونی جەستەیی نەبووە، بەڵکو دووربوونی ئایدیایی بووە، ئەگەرنا ئەوان لە نێو کۆمەڵگای کوردی ژیاون.

لەم بەشەدا ئاماژە و قسە لە سەر کتێبی هەندێ ئەو نوسەرە کوردانە دەکەین، بەتایبەتی ئەوانەی پرسی فتوحاتی ئیسلامی لە (پۆلادیان) و (سافراستیان)... وەرگرتووە، لەوانە:

## یەکەم: جەمیل ڕۆژبەیانی-وڵاتگیری ڕەشەخاکی عیراق:

سەعیدی سنەیی ناسراو بە (د. سەعیدی کوردستانی) بە شاهێدی: (د.جەمال نەبەز و د.عزەدین مستەفا ....و نەوشیروان مستەفا) لە دەستپێکی ئەو کەسانە بوو، کە شیعرێکی هۆنیەوە بۆ ئەوەی دەستپێکی ساختە بۆ دەقی کوردی دابنێت هەروەها "ئیسلام وەك داگیرکەر و بکوژ" بە خوێنەری کورد بناسێنی.

ئەو هەوڵەی دکتۆر سەعیدی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام، لە گۆڤارێکی (حوزنی موکریانی) بە خوێنەری کوردی ناسێندرا.

ئەو هەوڵەی (سنەیی) بەرهەمی نەبوو، چونکە بە دەیان دکتۆر و مامۆستای کوردی سیکیولەر، ئەو هەوڵەی ئەویان بە ساختە دانا .

لە دوای ئەو هەوڵەی (سنەیی)، هەوڵێکی دی لە ڕێگای کتێبێکی ترەوە لە دەرگای (فتوحاتی) دا ئەویش کتێبی: ( کوردستان و ئایینی ئیسلام ) بوو، کە (مەلا ) ڕەئوف سەلیم ناوێك، بە ناوی خۆی بڵاویکردەوە!

هەوڵی سێیەم، نامیلکەیەك یا سیپارەیەك بوو بەناوی: ( فتوح سواد العراق).

(مەلا ) ڕەئوف بە زمانێکی رۆمانسی و لایەنگرانە بە کۆمێك هەڵەی مێژوویەوە لە فتوحاتی ئیسلامی دەدوێت، کەچی (مەلا) جەمیل ڕۆژبەیانی بە زمانێکی توند و شێواوانە لە فتوحاتی ئیسلامی دەدوێت، بۆیە دەکرێت ئەو لە ڕووی مێژووەوە، یەکسەر لە دوای هەوڵەکەی سەعیدی کوردستانی (سنەیی) و حوسێن حوزنی موکریانی بێت .

جەمیل ڕۆژبەیانی لە بەرایی پەنجاکان دا، کتێبی: (شەرەفنامە)ی شەرەفخانی بدلیسی لە پەنجاکان تەرجەمەی عەرەبی کرد، هەروەها چەندان توێژینەوە و کتێبی نووسی. ئەفسووس لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی بیستەم، سیپارەیەکی بە ناوی: (وڵاتگیری ڕەشە خاکی عیراقی) لە فارسیەوە بڵاوکردەوە لەساڵی (١٩٩٨) دا چاپی یەکەمی نامیلکەکە بڵاوکردە، دوای تیرۆرکردنی (ڕۆژبەیانی) لە ماڵەکەی خۆی لە بەغدا، شاکر ڕۆژبەیانی لە (٢٠٠٥) چاپی دووەمی نامیلکەکەی بڵاوکردەوە .

چاپی دووەمی نامیلکەکە لە (٨٨) لاپەرە پێکهاتووە. لاپەڕەی سێ، وتەیەکی شاکر ڕۆژبەیانیی لەخۆگرتووە. لاپەڕە (٤-٥) سڵاوی صلی الله علیه وسلمه زنەدارە بۆ یادی ڕۆژبەیانی. لاپەڕە (٧-١٨) پێشەکی وەرگێڕی کوردیە، کە خودی ڕۆژبەیانی نووسیویەتی. لاپەڕە (١٩-٢١) دیباچەی وەرگێڕی فارسیە کە مەلا عەبدلعەزیزی واعزییە. لاپەڕە (٢٢-٢٩) پەراوێزەکانی رۆژبەیانییە. لە (ل٣٠-٨٦) دەقەکەی (واقدی) و تێبینیەکانی (ڕۆژبەیانی)یە.

زۆر قسە لە سەر خودی نامیلکەکە ناکەین، چونکە زۆر نزیکە لە کتێبەکەی مەلا ڕەئووف سەلیم حەویزی، تەنیا لە ڕووی جۆری زمانەوە لەیەك جودان.

ڕۆژبەیانی لە (ل١١ -١٢)ی پێشەکی (وڵاتگیری ڕەشەخاکی عیراق) دەنووسێت:

" کە ئەم سیپارەی (وڵاتگیری)م خوێندەوە بۆم دەرکەوت: ئەمە هەر کتێبەکەی (فتوح سواد العراق)ی مەلا صەمەدە، کە مەلا ڕەئوف کردوویە بە هی خۆی...، بەڵام مەلا ڕەئوف ناوەکەی گۆڕیوە بە ( کوردستان و ئایینی ئیسلام ) ئەمەی بە هۆنراوە هۆنیوەتەوە، بەڵام بۆ پەخشانەکەی ناوناوە: ( غەزەواتی صەحابان لە بەشی سەرووی کوردستان ."

لەمەش زیاتر (ڕۆژبەیانی) وەرگێڕی دەقەکە تەواو دڵنیا نییە ئەو کتێبە هی واقدییە، یان نە؟ هەروەها لە (ل ٨) دەربارەی نامیلکەکە دەنووسێت: "لە بەشی کوردستانی خوارووی نێوان دوو (زێ) دا سەدان ساڵە کتێبێکی دەستنووسی پڕ لە درۆ و دەلەسە هەیە ناوی: ( فتوحات سواد العراق ) - وەو دەنگی داوەتەوە وەکو (شانامە)ی جاری جاران لە دیوەخانان و لە مزگەوتەکانیشا بۆ کوردی سادە ئەخوێندرێتەوە. کەس نازانێ کێ نووسیویە؟ کەی نووسراوە؟"

ناوی ڕەشەخاکی عیراقی، لە ڕووی جیۆگرافیەوەش دروست نییە . ڕۆژبەیانی لە هەمان لاپەڕەدا دەنووسێت: "هیچ پەیوەندیەکی بە ( سواد العراق )ەوە نییە، چونکە (سواد العراق) بە وڵاتانی ناو ئەم سنوورانە دەڵێن: نێوانی بەسرە و کوفە چونکە خاکەکەی لەبەر زۆری دارخورما، لە دوورەوە خۆی ڕەش دەنوێنێ ."

(بەلازری) لە (ل١٤٦) باس لەوە دەکات، کە خاکی (سەواد - ڕەشەخاك) لە سەردەمی خەلیفە ئەبوبەکر ئازاد کرا، نەك خەلیفە عومەر.

ڕاستە ئەو نامیلکەیە بە (فتوح الشام)ی (واقدی) دەچێت، بەڵام هەڵەی زۆر زەقی یارانی پێغەمبەری تێدایە، جا (ڕۆژبەیانی) وتەنی، باوەڕناکرێ (واقدی مەکەیی) نەزانێ زۆربەی ئەو یارانە لە مەکە مرد بن و کوردستانیان

نەدیتبێ!
ئەم نووسینە لە دوو لاوە شرۆڤە هەڵدەگرێت:

١- مەتنی ڕوداوەکان دوورن لە قورئان و قورئان رەفتاران، هەروەها ڕاستی مێژوویی.

٢- گریمان کتێبەکە هی (واقدیە)، ڕوداوەکان هی کاتی دوورە مەزهەبیە، بەڵام کاتی نووسینی سیپارەکە، هی کاتی مەزهەبیە. چ لۆژیکێك قەبوڵی دەکات واقدیەکی شیعە، لە سەر ڕوداوەکانی ئیسلامی لە خاکی شیعە ڕاست بنووسێت؟؟
ئەوەی گرینگە لای ئێمە وەك توێژەرێکی کورد، دیتنی (ڕۆژبەیانی)ە بۆ فتوحاتی ناوچە کوردییەکان، نەك (واقدی) .

(واقدی) و (مەسعودی) و (یەعقوبی) لە زۆر شوێن بە چاوێکی مەزهەبی شیعەگەری تاوتوێی بابەتی فتوحاتیان کردووە، هەرچی (ڕۆژبەیان)ییە بە چاوێکی قەومی، دیتنی خۆی بۆ فەتحی ناوچە کوردییەکان و کاراکتەری صەحابەی شەهید بوو لە کوردستان دەربڕیوە، وەك بڵێی، کورد دەوڵەت و ئایینی خۆی هەبووە، لەشکری ئیسلام هاتووە وەك داگیرکەرێك لەناویان بردووە، بۆیە ئەو صەحابانە لای (ڕۆژبەیانی) شایەنی ڕێز نیین،ئەوەتە لە (ل٩) دەنووسێت: "لە مزگەوتی گوندەکەدا گۆڕێ هەبوو، گوایا: هی یەکێك لە یارانی - صحابە-ی پێغەمبەرە - صلی الله علیه وسلم - لەوانەی سوپای عارەبیان هێناوە بۆ موسڵمان کردنی خەڵکی کوردستان، جا هەر هەرێمێ کە ئیسلامی قەبووڵ نەکردبێ، بە ڕم و شمشێر و نێزە خەڵکەکەیان قڕکردووە، سامان و ماڵ و منداڵیان بەتاڵان بردوون. " ئەوە ڕێك قسەی سەعیدی کوردستانیە لە دەقی (هورمزگان)، کەچی (طبری) و (بەلازری) و (ئیبن ئەسیر) .... تەواو پێچەوانەوەی ئەو قسەی ڕۆژبەیانین، بۆ نموونە: (بەلازری) لە (ل١٨٢) دەربارەی ڕزگارکردنی (حلوان) دەنووسێت :جەریر حەلوانی بە صولح فەتح کرد، بەو مەرجەی دەستیان لێیان هەڵگرن لە خوێنڕشتن و سەروسامان و ڕۆیشتن لە (حەلوان) ئازادیان بکات." بە واتای: زۆربەی حلوانیەکان مووسڵمان نەبوون،

ئەوجا خوێن و نامووس و سامانیان پارێزرا.

هەر لە هەمان لاپەڕەدا دەڵێت : ئەوەی کۆمەڵگای کوردی بە شەهید ناویان دەبات بۆ تاڵان و ڕاوڕووت هاتۆتە کوردستان ." (ڕۆژبەیانی) وەك مەلایەك لە من چاکتر دەزانێت ئەو دیتنە بۆ صەحابە چەند خەتەرناکە.

ئەوەی بە ڕاستی مەلا بێ کڕنۆش بۆ گۆڕی پێغەمبەریش نابات، نەك گۆڕی صەحابە !.

ڕۆژبەیانی لە (ل١٣) دەنووسێت: کوشتارێکی زۆریان لە کوردی ئەو ناوە کرد-هەر لە خانەقین (١٠٠)هەزار کورد کوژرا."

هیچ سەرچاوەیەك ئاماژە بە هیچ شەڕێك لە (خانەقین) ناکات .مەحمود شاکر لە (ل١٧٢-١٧٥) ی بەرگی (٣-٤)ی (التاريخ الاسلامی) باسی شەڕی مەدائین و جەلەولا و حلوان دەکات، بە دێرێکیش باسی شەڕی (خانەقین) ناکات .

طبری لە (ل٤٢٨-٤٣٥)ی بەرگی سێیەم ئاماژە بە هیچ شەڕێك لە (خانەقین) ناکات. بەلازری لە (ل١٨٢) ئاماژە بە هیچ شەڕێك لە خانەقین ناکات. ئیبن ئەسیر لە (٣٥٧تا ٣٧٠) بەرگی (٢) باسی فەتحی: (مەدائین، تا قرقیسیا) دەکات ئاماژە بە شەڕێك بە ناوی شەڕی خانەقین ناکات. (کریستینسن) لە (ل٦٢٤-٦٢٦) باسی شەڕی (تەیسەفۆن - مەدائین) و هاوسنووری خانەقین دەکا، بەڵام بەهیچ جۆرێك باسی شەڕێك ناکات بە ناوی شەڕی خانەقین. تەنیا حەسەن مەحمود لە (ل٣٣)ی فەتحی ناوچە کوردییەکان دەڵێت: (خانەقین) بە ئاشتی ڕزگار کرا.

کەواتە شەڕی (خانەقین) بەشێك لەو باوەڕە پوچەی ناو ئەفسانەیە، ئەفسانەش لەناو نووسینی ئەکادیمی جێی نابێتەوە!

(ڕۆژبەیانی) بۆ ئەوەی لە شەستەکان و هەشتاکان دەربارەی کارەکتەری عەرەبە موسڵمانەکان هەیبووە، لە ژمارە (١٨٩٠)ی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ دووبارەی دەکاتەوە و دەڵێت: "ئەو عەرەبانەی هاتوونەتە کوردستان....

زۆربەیان بۆ ڕاوڕووت گەیشتوونەتە کوردستان." ئەو قسەیە هەمان قسەی پێشەکی نووسەرە کە لە پێشەکی: (وڵاتگیری ڕەشەخاکی عیراق) لە ساڵی (١٩٨١) کردوویەتی.

گەر لاپەڕەکانی: (طبری و ئیبن ئەسیر و بلازری...) لە بارەی فتوحات لە ماوەی (١٦-٤٠) هەڵدمیەوە، پەرەگرافێك نادۆزیەوە باسی سەحابەیەکی کردبێ، کە شتێکی لە کورد دزی بێت. (کریستینسن) لە (ل٦٢٥) باسی سامانی گیراوی (یەزگورد) دەکا، کە زۆربەی هەرە زۆری لە زێڕ دروستکرابوو، هەموو بە پێی ڕێسای جەنگ پاش جوێکردنەوەی پێنج یەکی خەلافەت، ئەویتر بە سەر سەحابیەکان دابەشکرا، کە هەر یەکەی (١٢٠٠٠) درهەمی بەرکەوت."
باوەڕناکەم ڕۆژبەیانی خەمی سامانی (یەزگورد)، هەراسانی کردبێت!!

هەر (کریستینسن) لە هەمان لاپەڕە دا باس لەوە دەکات، کە بەشێك لە سامانی (یەزگورد) بریتی بوو لە "زرێ و کراسی گەوچنی زرێ و ئەو شیرانەی، کە لە هێرقلی قەیسەری ڕۆم و خاقانی ترك و - داهیر-ی پادشای هیند و - وەهرامی چووبین - گرتبوویانن، کەوتنە دەستی عەرەبەکان."

بە واتای: چۆن سامان و سەروەتی لە قوتی خەڵك و دەستکەوتی جەنگ کۆکردبۆوە، بۆ موسڵمانەکان بەجێیهێشت، بە واتای کۆکردنەوەی دەستکەوتی جەنگ مێژوونێکی کۆنی هەیە، بەڵام تەنیا لە ئیسلام بە سیساتماتیککرا بەوەی سەربازەکانی بەرەی شەڕ، وەك سەرکردە و فەرماندەکان پشکی خۆیان هەبێت.

ئەمڕۆ بەشێك لە بەرەی عەلمانی کوردی لە ئاست دەستکەوت و سوتماککردنی ئاشووری و دەستکەوتی ساسانی و ڕۆمی بە کوێری لێدەخوڕن لە کاتێکدا ئەو سیاسەتە لە لوتکەی نا- ئینسانیدان، کەچی لە مێژووی ئیسلامدا بە تایبەتی لە ماوەی شەڕی بەدر، تا نەهاوەند هیچ دیاردەیەکی سوتماککردنی وڵاتەکان دروست نەبوون، دەسکەوتی جەنگیش بە سیستماتیککرا، بۆنموونە: سەیرکە پادشای ئاشووری چی بە کورد و کوردستان کردووە: "ئەو میرە میدیانەم بەزاند، کە دژی من ڕاپەڕین...، زۆر شاری بەهێزم لێگرتن، بەشێك لە میرەکانم ئەسیر کرد و بردیانم بۆ نەینەوا، لەو هەڵمەتە دەستکەوتێکی زۆرم بەدەست هێنا، (ڕێبەر

جەعفەر ٢٠١٢، ل١٥٩). ئەو هەموو زۆرداریيەی ئاشووری لە کوردستان، ویژدانی عەلمانیەکی کوردی نەبزواند شتێك لە بیرەوەری خەڵکی سادەی کورد تۆمار بکات.

توێژینەوەکەی ئێمە، هەر شرۆڤەکردنی ڕوداوی مێژوو نییە، بەڵکو لە هەندێ شوێن، خوێندنەوەیەکی مۆرفۆلۆژی و سیمانتیکی وشەکان دەکات، بۆ نموونە: وشەی (ئەنفال) لە دەقی قورئان و فەرهەنگەکاندا بەواتای دەسکەوتی جەنگ دێت،بەڵام مەلایەکی شارەزای کورد وەك: (جەمیل ڕۆژبەیانی) لە (ل١٣)ی پێشەکی وڵاتگیری... خوێندنەوەیەکی کەلتووری بۆ وشەی(ئەنفال) دەکات بە (تاڵان) شرۆڤەی دەکات، هەتا فتوحات بە ڕاوڕووت و تاڵان بناسێنێت.

## دووەم، ڕەفیق سابیر ....بەرەو مێژوو:

ئەم کتێبەی ڕەفیق سابیر ناوی (بەرەو مێژوو ) ە و (١٢٩) لاپەڕەیە ، یەکێکە لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری (ڕابوون)، کە لە ساڵی (١٩٩١) لە سوێد بڵاوکراوەتەوە. ئەوەی دەربارەی (ڕەفیق) زانراوە شاعیرێکی ناو حیزبی شیوعی بووە و باوەڕی بە ماتریالیزمی مێژوویی هەبووە. ئەو دیتنەش بۆ مێژوو لە سەر فاکتەری ئابووری وەستاوە .

موحەممەد یوسف (١٩٩٩)لە (١٩)ی گۆڤاری (ئاڵای ئیسلام، ژ.١) دەربارەی نووسەرە مارکسیەکان، لەوانەش مارکسی کوردی تۆ وەك خوێنەرێك بۆت نییە باسی دایەلۆگی دیموکراتی و نووسینی وەسیقەداری بێلایەن و ئەکادیمی بکەی، بەڵکو ئەوەی دەبینی، نووسینێکی ئایدیۆلۆژی، کە زۆربەی شتەکان بە مەقلوبی دەبینی."

ئەو خوێندنەوە ماددیە بۆ مێژوو لای (ئەرماندۆ ساپوری) مێژوونووسی ئیتاڵی، خوێندنەوەیەکی ناکامڵە، چونکە "مێژوو هەرگیز ناتوانێ بریتی بێ تەنها لە مێژووی ئابووری...( د.کەمال مەزهەر١٩٨٣،بەرگی مێژوو).
موحەممەد جابریش باوەڕی وایە: ئەو خوێندنەوەیە، بەرهەمی تەنها

مارکسیەتی قۆناغی ستالینی یە، ڕەفیق صابریش، یەکێ لە بەرهەمەکانی ئەو قۆناغەیە لە باشووری کوردستان دا .

لەم کتێبەی ڕەفیق صابر دا، تەنیا بەشی دووەمی کتێبەکە (٢٣-٤٠) دەربارەی خودی ئیسلام و فتوحاتە، بە واتای تەنیا لەو چەند لاپەڕەیە بە دیدێکی ماتریالی، گەنگەشە لە سەر ڕوداوانێك دەکات، کە تەنیا لە کتێبی: (طبری و ئیبن ئەسیر و بلازری و ئەبوفیدا...) حزوریان هەیە، کەچی ئەو، جگە لە (طبری)، هیچیان بە سەرچاوەو ژێدەر بۆ کتێبەکەی وەرناگرێ .

ئەم بەشەی کتێبەکە بە ناوی: "ئەنترۆلۆژیای ئیسلام و بە خۆنامۆکردنی نەتەوەی کورد-ە.

گەر لەو چەند لاپەڕەی نێوان (٢٣-٤٠) قسە بکەم، دەبێ کتێبەکەم تایبەت بکەم بە وەڵامدانەوەی ڕەفیق سابیر، بۆیە بەپێی: (مشتێك نموونەی خەروارێك) قسە دەکەم.

زانیاری دەربارەی مێژووی (فتوحات) لە کوردستان لە: (واقدی و طبری و ئیبن ئەسیر....) دەستدەکەوێت، کاکی دکتۆر ڕەفیق لە (ل٣٨-٣٩) لە ژێر ناونیشانی: (سەرچاوە و پەراوێزەکان)،(٩) سەرچاوە و پەراوێز دەنووسێ، کە دوور و نزیك پەیوەندیان بە فتوحاتەوە نییە! تاکە سەرچاوەیەك، کە ئیسلامناسی عەلی میر فیتروس-ە، کە دەزگای تیشك بە کتێبێك وەڵامی دایەوە!

گەر ئەوەندە نووسینە بدرابایە بەشی مێژوو، هەر لە سکرتاریەتی بەش، ڕەت دەکرایەوە، چونکە ڕووداوی مێژوویی سەدەی حەوتی میلادی، بەپاڵپشتی سەرچاوەی سەدەی بیست نووسراون!

لە (ل٢٤) دا شتێك دەنووسێت، بێئەوەی ئاگای لێبێ، ئیسپاتی دەکات، کە بە قەد گەردیلەیەك ئاگای لە ژیانی کورد پێش ئیسلام نییە! لەوەدا ناهەقی ناگرم، کە شیوعیەت لە عیراقدا، کوردایەتی بڤە دەکات، هەربۆیە بە قسەی کوێخای سۆڤیەتی، بەشداری شۆڕشی میللی (١٩٧٤-١٩٧٥) ناکات و بەرەی لای (مام صەدام)یان هەڵدەبژێرێت، ئاساییە تیغانی تیژ بکات لە ئیسلام،

چونکە لای مارکسیەکان "دین ئەفیونی گەلانە"!

کەسێکی بێ ئاگا لە مێژوو، کە ئەو چەند دێڕەی جەنابت دەخوێنێتەوە، وا دەزانێ، پێش هاتنی ئیسلام، کورد دەوڵەتی سەربەخۆیی و ئایینی نەتەوەییان هەبووە . تۆ دەڵێی: "ئیسلام لە کوردستان و گەلێ ناوچەی تردا، نەك هەر پۆزەتیڤانەی دیاری نەکرد، بەڵکو دیوارێکی بەرزی لەبەردەم گەشەکردنی ژیانی فیکری و کولتووریدا هەڵچنی و، بگرە ژیانی ڕۆحی نەتەوەییمانی وێرانکرد."

ئیسلام کە هاتە کوردستان، ئیمپراتۆریەتی ساسانی لە (٢٢٦-٦٥١)، بە واتای زیاتر لە (چوار سەد) ساڵ بوو، کوردستانی داگیرکردبوو، پاشای کوردی کوشت بوو، هاوڵاتی کوردی قەتل و عام کردبوو...تۆفیق وەهبی (١٩٦١، ل١٥-١٦)ی بنەچەکەی کوردان.. شوناسی نەتەوەیی ونکرابوو .

لە (٣٣١پ.م) ئەسکەندەر مەکدۆنی (ئاڤێستا)ی زەردەشتی سوتاند بوو، ئەردەشێر بابکانیش پاش زیاتر لە (پێنج سەد) ساڵ (ئاڤێستا)یەکی بە (موگ-موغە)کانەوە نووسیبۆوە و کردبویە ئایینی ڕەسمی ئیمپراتۆریەت ...کەواتە: ئەوەی ژیانی کلتووری و ڕۆحی کوردی وێرانکرد، یۆنانی و ساسانیەکان بوون، نەك عەرەبە موسڵمانەکان.

لە (ل٢٥) لە کتێبی حسێن مروە: (النزاعات المادیة) دەگوازێتەوە گوایە: "سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام لە دورگەی عەرەبدا،پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە گەشەکردنی ژیانی ئابووری و، بە تایبەتی ژیانی بازرگانی ئەو سەردەمەی دوورگەی عەرەبەوە هەبوو." لە بەرایی (ل٢٨) یش دەنووسێت : هێرشی لەشکری موسڵمانانی عەرەب بۆ سەر کوردستان، ئەوەندەی داگیرکردنێکی ئابووری بوو هێندەش داگیرکردنێکی کولتووری، فیکری و ڕۆحی بوو.."

ڕەوشی ئابووری، لە سەردەمی پێش ئیسلامدا زۆر بەهێزبوو، بەڵام بە پێچەوانەی (مروە) و (سابیر) لە کاتی سەرهەڵدانی ئیسلامدا زۆر لاوازبوو، چونکە قوڕەیش، یا دەسەڵاتی عەرەبی لە مەککە، هەمووی بۆ خۆی قۆرخ کردبوو. (مبارکفوری) لە (ل٤٦)ی (الرحیق المختوم) دەنووسێت: "باری ئابووری

لە کۆمەڵگای عەرەبی سەردەمی نەفامیی، وابەستەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی بوو، ئەگەر سەیری بژێوی عەرەبەکان بکەین، زیاتر ئەم خاڵەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە: بازرگانی گەورەترین هۆ بوو بۆ دەوڵەمەندبوون و دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیان.."

هەروەها لە (ل٥٦٦-٥٦٧) لەخاتو عائیشە دەگێڕێتەوە:کە لە ماوەی دوو مانگدا، (سێ) جار مانگمان بەشێوەی دەمەداس(هلال) دەبینی، هێشتا لە ماڵەکانی پێغەمبەر دا ئاگر نەکرابۆوە .....تەنیا بە دوو شتە ڕەشەکە(ئاو و خورما) دەژیان. "هەروەها زۆربەی کتێبەکانی (سیرە) باس لەوە دەکەن، کە پێغەمبەر وەفاتی کرد: زرێیەکەی لە ڕەهن دابوو لای جولەکەیەك ...."

کەسانی بازرگانی وەك: (ئەبوبەکر و عوسمان و عەوف) زۆربەی سنوورەکانیان لێ قەدەغەکرابوو، بازرگانیەکەیان بووە لۆکالی! جا لە کاکی (مروە) و (رەفیق) دەپرسم: ئەرێ گەشەسەندنی ئابووری لە کوێ بوو؟!!

لە زۆر شوێنی ئەم کتێبە ئاماژەمان بە نامە و قسەکانی عومەری کوڕی خەتاب کردووە، کە خۆزیای خواستووە: لە نێوان موسڵمانەکان و کوردستان، چیایەك لە ئاگر هەبێت، هەروەها هەمان شتیشی دەربارەی فارسەکان وتووە. جا مەسەلەی فاکتەری ماددی، تەنیا مارکسی و رۆژهەڵاتناسە تەبشیری و سیاسیەکان فرچکیان پێگرتووە !!

لە (ل٢٧)، کە هاتنی ئیسلام بە کارەساتی مێژوویی ناودەبا، بیەوێ و نەیەوێ ئیسپاتی ئەوە دەکات، کە چۆن کورد (١٣٠٠)ساڵ دوای ئیمپراتۆریەتی (میدیا)، دیل و یەخسیری: (ئەخمینی و یۆنانی و ئەشکانی و ساسانی) بوو، دەیەوێت ئەو ڕەوشە داگیرکراوییە درێژە بکێشێت !! لەوانەیە کاك (مروە) و (رەفیق) هێشتا باوەڕیان وابێ، مانەوەی کورد لە بن چەتری ساسانی جۆرێك بێت لە "دروستکردنی ئوممەی ئایدیۆلۆژی"!!

لە (ل٢٨)دا دەنووسێت: " کاتێ لەشکری ئیسلام هێرشی بۆ سەر ئێران - بە کوردستانیشەوە - برد، عومەری خەتاب وەك ئیبن خەلدون لە (المقدمة) دەڵێ:

فەرمانی بۆ لەشکرەکە دەرکرد: هەرچی کتێب و نووسراوێکیان بەردەست کەوت بیسوتێنن- بەپێی هەمان میتۆد و عەقڵیەت، کتێبخانە مەزن و بەناوبانگەکەی شاری ئەسکەندەرییەیان سوتاند."

**پرسەکە وا دەخوازێت چەند سەرەقەڵەمێك دەربارەی کتێبخانەی ئەسکەندەرییە بنووسم :**

**لای مێژوونووسەکان سێ ناو لە پرسی دروستکردنی کتێبخانەکە دێت :**

١- بەتلیمۆسی یەکەم.
٢- ئەسکەندەری مەکدۆنی، قوتابی ئەرستۆ بوو.
٣- بەتلیمۆسی دووەم .

سەرچاوە یۆنانی و ڕۆمانیەکان جەخت لە سەر ئەوە دەکەن، کە کتێبخانەی ئەسکەندەرییە لە سەردەمی (یۆلیۆس سیزەر) لە (٤٨ پ.م). سوتێندراوە، ئەوەی پشتگیری ئەم ڕایە دەکات :

١- پلوتارك لە کتێبی (ژیانی سیزەر کۆتایی سەدەی یەکەم).

٢- ئولوس گەلیوس: شەوە سادەکان لە سەدەی دووەم سەربازانی ڕۆمانی بە هەڵە کتێبخانەکەیان سوتاند .

پاش دوو سەدە لەو مێژووە، (ئەمینیوس) و (ئۆرسیوس)ی مێژوونووس، دەنووسێت: ئەو کتێبخانەیە بە هەڵەی سەربازەکانی (سیزەر) سووتاوە.

دکتۆر (زیگرید هونکی) لە (ل٨٣-٨٧)ی کتێبی (الله لیس کما تروجون)، جگە لەوەی ئەوەی سەرەوە پشتڕاستدەکاتەوە، ئەم زانیاریانەش دەخاتەڕوو، بەناوی: (سوتاندنی مەکتەبەی ئەسکەندەرییە لای سیزەکان)،(زیگرید) بیرۆکەی سوتاندنی مەکتەبەی ئەسکەندەریە لە چەند خاڵێك کورت دەکاتەوە:

١- ساڵی (٤٨پ.م) مەکتەبەکە تووشی سوتان بوو لای (سیزەر).

٢- لە قەرنی سێی میلادی دووبارە مەکتەبە دووچاری سوتان بۆوە (سیزەر)

(کاراکالا) هەروەها قەسابخانەیەکی لە زاناکان کرد.

٣- لە ساڵی (٣٦٦)(سیزەر ڤالینز) جارێکی تر مەکتەبەکەی ڕوخاند و کردیە دێر و کەنیسە.

٤- لە ساڵی (٣٩١) (سیزەر تیۆدۆرۆس) جارێکی تر مەکتەبەکە بڕوخێنن، ئەو شوێنە ٣٠٠٠٠٠ کتێب و مەختوتەی تێدابوو.

٥- لە قەرنی پێنجەمی میلادی، تیرۆریست و بەکرێگیراوەکانی بەتریکی (ئەنتاکیە)، هەم کەوتنە ڕاونانی زاناکان، هەم هەرچیان بەدەست کەوت لە کتێب و مەختوتە سوتاندیان.

٦- کاتێك عەرەب لە (٦٤٢)ی میلادی هاتنە (مصر)، هیچ مەکتەبەیەك نەمابوو بە ناوی: (مەکتەبەی ئەسکەندەرییە)!"

مێژووی فتوحاتی ئیسلامی، لە کتێبی: (طبری و بلازری و ئیبن ئەسیر...) هەیە، ئەوانەش بە باش و خراپ، باسی سوتاندنی ئەو کتێبخانە ناکەن، لە (٢٢ك)، بەتایبەتی (طبری) هەر ئەوەی بەر گوێی کەوتووە، نووسیویەتی، ئەرێ خێرە سوتاندنی ئەو کتێبخانەی نەنووسیوە؟! نا، چونکە سووتاندنەکە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب ڕووینەداوە، بەڵکو لە سەردەمی (سیزەرەکان) لە پێش میلاد و پاش میلاد ڕویداوە .

دیارە ڕەفیق سابیر نازانێت، لە سەردەمی ساسانیەکان دا، میسر لە دەست کێ بووە؟ بۆیە هۆکاری سوتاندنە ئەفسانەیەکە دەباتەوە بۆ ئەوەی "دیارە ئەوان دەیانزانی گەلانی ئەو سەردەمی ئێران خودانی چ کولتوور و شارستانیەکی دێرینن - ل٢٨ ."

هەموو سەرچاوەکان قسە لە سەر ئەوە دەکەن، کە ئەسکەندەری مەکدۆنی، کولتووری ئێرانی لە (٣٣١ پ .م) سوتاند...، ئەسکەندەرییە لە ژێر دەسەڵاتی پیاوانی ئەسکەندەر دابوو، کە ئایینیان تەواو جودا بوو لەگەڵ فارسەکان؟ بە چ لۆژیکەك ئەسکەندەر لە ئێران، کولتووری ئێرانی سوتاند بێت، بەڵام لە میسر کولتووری ئێرانی پاراست بێت؟؟!

لە (ل٢٩) باس لەوە دەکەی، کە موسڵمانەکان دەرکیان بەوە دەکرد، کە بەبێ لەناوبردنی ئەم کولتوور و شارستانییەو بەبێ ڕیشە هەڵکێشانی ئایینی زەردەشتی و مانی .."

زانینی ماوەی دەرکەوتن و سالاربوونی دینەکان، بۆ توێژەر زۆر گرینگە .

شەهرستانی لە (ل ٧٨)ی (الملل و النحل) باسی باوەڕی (مانیزم) دەکات، کە بریتیە لە: هەبوونی دوو هێزی: (ئاهورامەزدا و ئەهریمەن). وەك طبری لە (ل١٦)ی جوزئی دووەم دەڵێت : (مانی ) لە سەردەمی شاپوری یەکەم (٢٤١-٢٧٢) ی میلادی پەیدابوو. (مانیزم) لە هەولێر و هەردوو ئەقلیمی جیبال و جەزیرە بڵاوبۆوە ، ئادی شێر باوەڕی وایە: (مانیزم) ڕۆژهەڵات و ئەوروپاشی گرتەوە - ل٢٣.

کەلسومە لە (ل١٢١)ی (مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیك) لە (یەعقوبی) دەگوازێتەوە، کە لە سەردەمی بەهرامی برای هورمزدی یەکەم، (مانی) درایە دەست موغەکان، ئەوانیش گرتیان و بەند و ئازاریان دا، هەتا لە (٢٧٦) گیانی لە زیندان لە دەستدا... لە گێڕانەوەی تر، لە خاچ درا ."

کەواتە: کە لەشکری ئیسلام هاتە کوردستان، ( مانی ) زیاتر لە (٣٥٠) ساڵ بوو (موغ)ە زەردەشتیەکان لە خاچیان دابوو. نازانم ئیسلام چ ترسێکی لە ئایینێکی مردوو و دوورە دەسەڵاتی وەك (مانیزم) هەبوو؟؟!

برای دکتۆر! دەسەڵاتی زەردەشتی، خۆی (مانیزمی) لەنێوبرد،نەك ئیسلام!

قسەکانی کتێبی( بەرەو مێژوو ) لە سەر ڕوداو و کتێبی ماوەکە دانەمەزراون، بۆیە چی تر کات بە فیرۆ نادەین لەو جۆرە قسانە .

## سێیەم: ڕەفیق سابیر - ئیمپراتۆریای لم:

ئەم کتێبەی رەفیق سابیر، هەر لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری (ڕابوون)ە کە لە سوێد لەدووتوێی (٢٣٠)لاپەڕەبڵاوکراوەتەوە .تەنیا بەشی یەکەمی کتێبەکە، کە بەناوی ئیسلام: ناکۆکی پەیام و دەوڵەتی خێڵ-ە نزیکە لە بابەتی ئەم کتێبەی ئێمە. ئەو بەشەی کتێبەکەی رەفیق سابیر لاپەڕە (١٧ تا ٦٦) گرتۆتەوە.

شاعیر ڕەفیق سابیر لە ساڵی (١٩٧٦)ەوە تا (١٩٩٧) ( دە) بەرهەمە شیعری لە شێوەی کتێب لە بەغدا و لەندەن و بەیروت و سوێد و ئەڵمانیا بڵاوکردۆتەوە، بە واتای: رەفیق سابیر وەك شاعیرێك، شاعیرێکی چەپ ناسراو بوو.

لە (١٩٩١) لە (سوید) کتێبی (بەرەو مێژوو) ی دەرکردووە، لە (١٩٩٨) هەر لە (سوید) کتێبی: (ئیمپراتۆریەتی لم)ی بڵاوکردەوە.

لە سەرەتادا دوو خوێندنەوەی جیاواز لەمەڕ گریمانە سواوەکانی ڕەفیق سابیر دەخەینەڕوو:

موحەممەد یوسف (١٩٩٩)لە (ل١٩)ی وتارەکەی، بەبەڵگە دەیسەلمێنێت، کە دکتۆر رەفیق سابیر ئەو چەند لاپەڕەی سەرەوەی، پاش مکیاژکردن و چەپکردن، لە کتێبی: (العقل السياسي العربي) د٠محمد جابري بردووە. ئەو دیاردەیە لای دکتۆر ڕەفیق نامۆ نییە، چونکە حەمەسەعید حەسەن، هاوڕێی ئایدیۆلۆژیا و حیزبی ڕەفیق سابیر لە سیپارەیەکدا، وا باسی کۆنە هاوڕێکەی دەکات: "بە خۆی دیداری لەگەڵ خۆی کردووە و بەشانوباڵی خۆی هەڵداوە!"

١- موحەممەد یوسف (١٩٩٩) لە ژمارە یەکی ساڵی (دەهەمی) (ئاڵای ئیسلام) لە (ل١٩-٢٨)ی گۆڤارەکە، وتارێکی ڕەخنەئامێزی بە زمانی عەرەبی بەناوی (امبراطورية الرمال ام امبراطور التضليل؟؟ رد على مغالطات رفيق صابر) بڵاوکردۆتەوە.

کتێبەکەی ئێمە قسە لە سەر (فتوحات) لە ماوەی (٩ك-٤٠ك) دەکات، نەك وەڵامدانەوەی ئەوانەی ڕەخنە لە قورئان دەگرن، بۆیە چەندی پێمان بکرێت،

خۆمان بە قەدەر توانا دوور دەگرین-کتێبی ترمان بۆ ئەو باسە بڵاوکردۆتەوە بە ناوی: (سیکیولەری کورد و قورئان) .

کتێبی: (ئیمپراتۆریای لم) دووەم کتێبی مێژوویی ڕەفیق سابیرە، لە نەزەر فاروق ڕەفیق، ئەم کتێبەی رەفیق سابیر لێکۆڵینەوە نییە، بەڵکو حەکایەتە و هەڵگری هیچ ئارگومێنتێك نییە. موحەممەد یوسف لە (ل١٩)ی وتارەکەیدا دەڵێت: ئەم کتێبەی (رەفیق)، هەمان کتێبی دکتۆر موحەممەد جابری یە، تەنیا هەندێ نوژداری جوانکاری بۆ کراوە، هەروەها (ڕەفیق) لە مەتن و ژێدەر، ئاماژە بە (جابری ) و کتێبەکەی ناکات!

د.ڕەفیق سابیر لە بەرایی (ل١١) دا دەربارەی کتێبەکەی دەنووسێت: "ئەم باسە ناوەڕۆکی فەلسەفیی ئیسلام و مەسەلەی وەحی ناگرێتەوە، بەڵکو لایەنی ئەنترۆپۆلۆژیای ئیسلام، بە تایبەتی پەیوەندی لەگەڵ لایەنی سۆسیۆکولتووری و ناوەڕۆکی دەوڵەت، دەگرێتەوە."

موحەممەد یوسف لە (ل١٩-٢٠) دەربارەی ئەم پێناسەیەی (رەفیق) بۆ کتێبەکەی دەنووسێت : نووسەر لە (ل١١) بانگەشەی ئەوە دەکات: کتێبەکەی بە باوەڕ و سروشی ئیسلامەوە پەیوەست نییە، کەچی تیرێك لە جوبەی - گیرفانیەوە ناهێڵتەوە، کە ئاڕاستەی باوەڕی ئیسلام، کە بنەما و جەوهەرەکەی بریتیە لە قورئان نەکات، هەروەها چەندان جار ئیسلام بە ئەنزیمەی میسۆلۆژی - ئەفسانەیی دەشوبهێنێت."

چواندنی دەقی قورئان و دەقە ئاسمانییەکانی بە ئەفسانە، مێژووێکی هێندە کۆنی هەیە، لەوانەیە لە سەردەمی (نوح) پێغەمبەرەوە دروستبوویێت، ئەوەتە قورئان خۆی ئەو بانگەشانەمان بۆ دەگێڕێتەوە: "

کەسانی دەرەوەی ئیسلام لە هەر نەتەوەیەك بن، بە دیدی جیاواز تەماشا و شرۆڤەی ئەفسانەیان کردووە. قورئان لە چەندەها دەق، باسی ئستورەی کردووە، لەوانە: (سوڕەتی الانفال و سوڕەی النحل، المؤمنون، ئایەتی (٥ و ٦)ی سوڕەتی الفرقان) هەروەها ئایەتی (٦٨)ی (النحل) پێمان دەڵێت: ئەوانەی لە

دەرەوەی قورئانن، بە موسڵمان دەڵێن: "قورئان ئستورەی پێشینانە....".

ئەو وشەی (ئستورەیە) لە ڕاڤەی قورئان بە شێوەی جیا هاتووە، وا دیارە بەرێزان تەواو ئاگادار نیین لە زاراوەسازی ئەو بوارەدا، بۆیە یەکێك بە (ئەفسانە) و یەکێ بە (داستان) و یەکێ بە (قسەی پێشینان) و یەکێ بە (خورافە) ڕاڤەی کردووە.

مەلا عەبدولکەریمی مودەریس (٢٠١٠،ل٣٦٠) لە (خولاصەی تەفسیری نامی) دا ئەوهای ڕاڤە کردوون: "هەروا ئەم کافرانە وتیان :ئەم قورئانە ئەفسانەی پێشینانە لە ڕووی کتێبە ئەفسانەکانی کۆن بۆی نووسراوەتەوە.... نەخێر وا نییە ...ئەم قورئانە، ئەو خوایە....ناردیویەتەخوار..".

"هەژار موکریانی ( ٢٠٠٠، ل٣٦٠ ) لە ڕاڤەی ئەو ئایەتەدا، دەنووسێت: " وتیان :ئەمانە چیرۆکی پێشینانن....بێژە: کەسێکە ناردوویە،لە نهێنی عاسمانەکان و زەمینێ ئاگادارە." بورهان ئەمین (تەفسیری ئاسان، ل٣٦٠ ) دەربارەی هەمان ئایەت، دەنووسێت:" هەروەها وتویانە: ئەم قورئانە داستانی پێشینەکانە داوای نووسینەوایانی کردووە... تۆ ئەی موحەممەد بڵێ: ئەو زاتەی ئەم قورئانەی دابەزاندووە، بە هەموو نهێنیەك دەزانێت..."

نزامەدین عەبدولحەمید ( ٢٠٠٤،ل ٧٦٩ ) دەنووسێت: "بێباوەڕان و بتپەرستان دەیانوت: ئەم قورئانە درۆدەلەسەی پێشینانە....ئەی پێغەمبەر! تۆش پێیان بڵێ: ئەم قورئانە خودا ناردوویەتی خوارەوە."

هەرچی ئەحمەدی کاکە مەحمودی ڕەحمەتیە ( ٢٠١٢،ل٥٩١ ) دەنووسێت: " گوتیان ئەم قورئانە هەموو ئەفسانە و وتەی باتڵ و پڕوو پووچی پێشینانە، ئەوان بۆی ڕێنووس دەکەن وەك داستانی: ڕۆستەم، ئەسفەندیار... ئەی پێغەمبەر! بڵێ : وانیە ئێوە دەیڵێن!" ڕزگار کەریم و ناصح فتاحیش( ١٣٨٣،ل٣٦٠) دەڵێن " ئەو ئایەتەی ئەو خورافات و درۆیانەی لە کتێبەکانیان نووسراوەتەوە." هەروەها لە ڕاڤەی ئینگلیزی لاپەڕە (١٠٣٣)هاتووە کە مەبەست لە ئستورە: "چیرۆکی پێشینانە ....ئەو چیرۆکانە باشن بۆ ڕابواردن و خۆشی، نەك مەسەلەی جدی وەك پەرستن..."

کاك ڕەفیق، زۆر بێئاگایە لە مێژووی ئیسلامی، بۆیە لە زۆر پرس سەرچیخ دەچێ، ناهەقی ناگرم، ئەو هەتا پرسەکان بە نوقصانی دەگوازێتەوە، چونکە ئاگای لە پرسەکە نییە، بۆ نموونە:

أ- لە (ل٢٢) باس لە پرسی کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی خەلیفە عوسمان دەکات ....بۆ نموونە: گروپی ئەلموعتەزیلە سورەتی (المسد)یان بە بەشێك لە قورئان نەدەزانی. هەروا ئەلخەواریجەکان سورەتی (یوسف)یان سەرلەبەر ڕەتدەکردەوە."

مێژوو نووسینەوە، شاعیرێتی نییە، وادەزانی تێکەڵکردنی زات و ئارەزوو بە ڕوداوی ناو مێژوو ئاساییە !

براله، نووسینەوەی مێژوو، ئەرك و بەرپرسیاری ڕۆناکبیرە . گەر تۆ کەمە شارەزایەکت لە مێژووی ئیسلام هەبوایە، پرسی قورئان کۆکردنەوە و موعتەزیلە و خەواریجت تێکەڵ یەك نەدەکرد ! ئاخر کەی لە زەمەنی عوسمان دا، موعتەزیلە و خەواریج دەرکەوتن؟؟!( موحەممەد،ل٢٠)

ب- پرسی تاڵان و دەقی قورئان:

بڕیاری پێشوەخت دەربارەی قورئان تەواو گریمانەکانی (د.ڕەفیقی) داچۆڕیوە لە ئارگومێنتەکان، دکتۆر وەك (مەلا) ڕۆژبەیانی، دەیەوێت ئامانجی فتوحات لە فاکتەری ئابووری و تاڵانکاری کورت بکاتەوە. وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا، دکتۆر (زیگفرید) ئامانجی فتوحات بریتی بوو لە: ناساندنی چەمکی (الله) بۆ نەتەوەکانی تر، موحەممەد یوسفیش لە (ل٢٣) لە (ئیگناسیۆ ئولاگی) مێژوونووسی ئەسپانی دەگوازێتەوە، کە ئەوە هێزی بیرۆکە بوو، نەك هێزی سوپای ئیسلامی بڵاوکردەوە." ئەو دووە هەردووك لە کۆنتێکستی جیۆگرافی دەرەوەی قەڵەمڕەوی ژیاون و، ئاوا لە ئامانجی فتوحات گەیشتوون، کەچی د.ڕەفیقی گەورەبووی ناو کۆنتێکستی روحی و ماددی ئیسلام، ئەوها بەسەقەتی لە ئیسلام گەیشتووە..

ئایەتی (٩٤) سورەتی (النساء) و پرسی ( مەرداسی ) شوان و وشترەوان، تەواو فاکتەری ئابووری و تالآنی رەت دەکەنەوە، خودای بەرز و مەزن لە دەقی ئایەتەکەدا دەڵێت: "ئەی ئیمانداران! مەبەستان دەستکەوتی ژیانی دنیا نەبێت، لای خودا دەستکەوتی زۆر هەیە..."

لە فەرموودەکەش دا، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە (ئوسامەی) هاوەڵی زۆر تورە دەبێ، کە مەرداسی وشترەوانی کوشت و مەرەکانی بە تالآن هێنا، هەروەها خەلیفە عومەریش زۆر لە (ئەشجەعی) تورەبوو، کە هەندێ تالآنی گرانبەهای بۆ نارد.

ئیسلام تاکی عەرەبی لە قۆناغی قەبیلەکاریەوە، گواستەوە بۆ قۆناغی ئوممەکاری، بۆیە توانی هەم دوو ئیمپراتۆری سەردەم بروخێنێت، هەم شارستانیەتێکی ئیمانی دابمەزرێنێت، کە هەموو نەتەوەکانی ناوچە بەشداربن تێیدا، بەڵام ئەفسووس، دکتۆر رەفیق دەیەوێت جارێکی تر بیگەرێنێتەوە بۆ قۆناغی کۆچەری و کێویلەیی، بەڵام کێویلەیی پێشکەوتوو.

ج- سێ مەرجە دیموکراسیەکەی خەلیفە عەلی:

جیایی هزری لە مێژوو ئیسلامیدا، گەیشتۆتە باوەرنەبوون بەخودی خەلیفە. ئیمام عەلی هەر خەلیفە نەبوو، بەڵکو (ئامۆزا) و (زاوا)ی پێغەمبەر بوو. خەواریج، کە لە خەلیفە عەلی جیابوونەوە، هەر لە کۆمەڵگای ئیسلامی دەژیان، خەلیفە عەلی سێ مەرجی بۆ دانان: "مزگەوتی خوداتان لێ قەدەغە ناکەین، دەستپێشخەر نابین لە شەر لەگەڵتان، بێ بەشتان ناکەین لە داهاتی دەوڵەت. "موحەممەد لە (ل٢٥) لە (سرخسی) دەگوازێتەوە: " ئەم وتەی خەلیفە بەڵگەیە کە هەر گروپێك یاخی چەکداری نەبێت لە دەسەڵات، ئیمام حەپس، یا نایانکوژێت...."

(ستالین و ماو و پۆل پۆت) خەلیفەکانی بنیاتنەری هزری جەنابت ئەوهابوون لەگەڵ خەڵك و هاورێکانیان، یا هەموویانیان قرکردن؟؟

تۆ باسی بەدەویەتێك و بیابانێك دەکەی، کەسی وەك خەلیفە عەلی بەرهەمهێناوە،

منیش ئاماژە بە بەدەویەتێکی ئایدیۆلۆژی و تەکنەلۆژی دەکەم، کە کەسانی وەك: (ستالین و ماو و پۆلی پۆت و هیتلەر و مۆسۆلینی) بەرهەم هێناوە !
بزانین کامە نموونەی دیموکراسی نموونەیین؟

٢- فاروق ڕەفیق (٢٠٠٦ لە ل٢٩٧-٣٠٤)ی (غەمە جڤاتیەکان)ی تەرخانکردووە بۆ قسەکردن لە سەر تایتل و ناوەڕۆکی هەمان بەشی کتێبەکەی ڕەفیق سابیر.

فاروق ڕەفیق بە دیدێکی جیا لە موحەممەد یوسف، ڕەخنەی توندی لە ڕەفیق سابیر گرتووە.

فاروق هەر لە (ل٢٩٧)ەوە دەست بە ڕەخنەکانی دەکات .سەرەتا لە ناونیشانی کتێبەکەوە دەست پێدەکات . فاروق دەڵێت : ناونیشانەکەی ڕەفیق سابیر ناچارمان دەکات ئاماژە بە دوو ئایدیا بکەین:

یـــەك: مەبەست لە (ئیمپراتۆریای لم) ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیە، یا ئیمپراتۆریەتە ئیسلامیەکانە ....کە بۆنی لمی لێدێ. ئەو جۆرە ئیمپراتۆریەتە، زادەی عەقڵێکی بەدەوییە، خێڵەکیە و ناشێ شارستانێتی بنیادبنێ."

دوو: ئیمپراتۆریا ئاماژەکردنە بۆ هەموو ئەو سیستەمە سیاسی و کۆمەڵایەتیانەی، کە گوایا لە سەر بنەمای ئیسلامەوە دامەزرێندراون و درێژکراوەی بیابانن.

ئەو دیتنەی (ڕەفیق)، شتێکی نوێی تێدانیە، چونکە دروستکردنی ئەو خاسیەتە شوناسیەیانە، تەمەنێکی درێژی هەیە .فاروق ڕەفیق هەر لە کۆتایی (ل٢٩٧) ەوە دەنووسێت : "ئەمەش کتومت ڕای چەند مێژوونوسی خۆرئاوایی و چەند ئۆرینتالیستێکە - ڕۆژهەڵاتناسێکە-لەوانە: بورکهات، گۆڵدزیهر، سیر هاملتۆن گیب..."

کەواتە ڕەفیق سابیر، جگە لە گوێزەرەوەی چەند ئایدیایەکی دژە ئیسلام لە ئەوروپا چیترە؟ جیهانبینی قورئان، سنووری شوێنەکان و خاسیەتەکانی بڕیوە و لەوە دەرچووە، تازە بە تازە شەهادەداری ئایدیۆلۆژیکاری کورد، هەمان شرۆڤە و خوێندنەوەی کەسانی ناو کۆنتێکستی جیۆگرافی نامۆ بە ئیسلام، بە خوێنەری

کورد بفرۆشیەوە.

لە بەرایی (ل٢٩٨)دا فاروق دەنووسێت :"ئیتر لەو ناونیشانەوە کێشەکانی ئەو کتێبە دەست پێدەکەن، گرفتە قووڵەکانی کە پێوەی دەتلێتەوە لاوازی شیکردنەوەکان،بە هەڵە تێگەیشتن لە ئایین و سیاسەت و ناسیۆنالیزم و شارستانیەت و دووبارەکردنەوەی دۆگماکان.
لێرەوە ئەم کتێبە دەبێتە حیکایەتێك، نەك لێکۆڵینەوەیەك لە سەر سەرهەڵدانی ئیسلام، حیکایەتێکی ئۆرینتالیستانە..."

ئەو دووبارەکردنەوەی قسەکانی، زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسەکان دەربارەی ئیسلام و کارەکتەری پێغەمبەری ئیسلام، توێژەر قەڵس دەکات، چونکە شرۆڤەکانی (ڕەفیق سابیر) لێواولێون لە ئیشکالیەتی هزری و ئەبستمۆلۆژی .
(فاروق) لە هەر هەمان لاپەڕە دا دەنووسێت :" گەر بمانەوێت لە کێشە تیۆرییەکانی ئەم کتێبەش قسە بکەین،ئەوا دەبێت دێڕ بەدێڕ ئیعرابی بکەین و پەنجە بخەینە سەر ئیشکالیتە فیکری و مەعریفیەکانی..."

فاروق ڕەفیق، دەربارەی کتێبەکەی (ڕەفیق سابیر)، سەرنجەکانی خۆی تەنیا لە سێ خاڵ کۆدەکاتەوە، چونکە کتێبەکە ئەوە هەڵناگرێ دێڕ بە دێڕی ئیعرابی بکرێت.

# وەڵامێکی مێژوو ئامێز
# بۆ بەرنامەی تەبشیری
# ( سؤال جريء )

تەلەفزیۆنی (الحياة) دیدارێکی لەگەڵ دکتۆر (مجدی خلیل) کردووە . جیا لە تەلەفزیۆنە عەرەبیەکان تەلەفزیۆنی تەبشیریەکە، تەلەفزیۆنی (الحياة)، ئەو کۆتە سایکۆلۆژیەی بە نیازی تەبشیری دەشکێنێت، شکاندن و جۆری شکاندنەکە ئەو پەندە عەرەبیەی لە سەر پیادە دەبێت :" سكت دهرا و نطق كفرا".

ڕاگەیاندنی عەرەبی بە هەموو ڕەوتەکانەوە، پەردە و دیوارێکیان لە نێوان خۆیان و کورد داناوە، تەلەفزیۆنی ناوبراو بە دەنگ هات، بەڵام چ بە دەنگ هاتنێك؟

الاخ رشیدی تەبشیری (بێژەر)ی بەرنامەکە، بە دەستێك قورئان و بە دەستەکی تری، کتێبی پیرۆز، نمایشی ڕەوشی ئێستای دۆزی کورد دەکات!

وەك گوتمان، تەلەفزیۆنەکە بەرنامەی (٤٣٩) سؤال جری بەناوی: (الاكراد والاسلام) ئەم (کۆت) و (کۆد)ەی بە نیازی تەبشیری پچڕاند و داوەتی دکتۆرێکی تەبشیری بە ناوی (د.مجدی خلیل) بە کۆمەڵێك کتێبەوە کرد.

کەسێك نەزانێت هەڵگرانی " خاچ" هەردەم دەرگایان بۆ کورد کردۆتەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك ئاماژە بۆ شکستی شۆڕشی کامەران بەدرخان (١٨٤٦)، شۆڕشی عوبێدەلای شەمزینی (١٨٨١) ...شۆڕشی ئەیلول (١٩٧٥)، کە بەرهەمی هەڵگرانی خاچ بوون!! ناکات، هەروەها کەسێك نەزانێ (سایکس-

بیکۆ ١٩١٦) و (لۆزان ١٩٢٣)، کە سێ بەشی کوردستانیان لە نێو عەرەب و تورك پارچە پارچە کرد...بەرهەمی (لا اله الا الله) ن؟؟! یان باپیری کاکی بێژەر و مێوانی بەرنامەن؟

لە سەرەتا دکتۆر (مجدی خلیل) قسە لە سەر زۆر شتی لابەلا دەکات، ئێمە لێرەدا ناتوانین وەڵامی هەموویان بدەینەوە، بۆیە تەنیا وەڵامی ئەو قسە بێ بنەمایانە دەدەینەوە، کە تایبەتن بە کتێبەکەمانەوە!

**دکتۆر مجدی زۆر ڕاستی تاڵ دەڵێت، لەوانە:**

١- باسی هەبوونی ڕەگی زەردەشتیەت لە نەشیدی (ئەی ڕەقیب) و( ئاڵای کوردستان)، کە ڕۆژەکەی ناوی هەڵگری (٢١) تیشکی زەردەشتی دەکات، هەروەها دەڵێت : ژمارەکە پیرۆزە لای یەزیدییەکان .

٢- چەندان کەسی وەك: (سەلاحەدین و عەقاد و ئیبن تەیمییە و ئەحمەد شەوقی) لە ئەصڵدا کوردن، بەڵام هیچیان بۆ کورد نەکردووە!

٣- کورد هەر کاری لە سەر قەبیلەبوون کردووە، نەك دەوڵەتداری مۆدێرن، هەربۆیە لە کوردستان سنوور نییە!

٤- دەوڵەتانی موئتەمەری ئیسلامی و ڕابیتەی ئیسلامی، هیچ بە هاواری کورد نەهاتن، بە تایبەتی لە هەڵەبجە!

دەربارەی ئەم چوار خاڵە دەڵێین : بزاڤی عەلمانی کوردی، هەر لە سیەکانی سەدەی بیستەوە، خەریکی تەوزیفکردنی بنەماکانی زەردەشتیەت بوونە لە بزاڤی کوردیدا، شۆڕشی کەلتووری ئاگری داغ، کاژیك (١٩٥٩)، ڕوانگە (١٩٧٠)، پەکەکە (١٩٧٩)...باشترین نموونەن.

مەسعود عبدالخالق ناهەقی نییە عەلمانیەتی کوردی بە مەینیەتی کوردی ناودەبات، لەوەش زیاتر بزاڤی نا - ئیسلامی کورد لە (١٩٣٤تا ٢٠١٦) شاهێدی دەیان نسکۆی کوردن!

لە لایەکی تر، گەر سەلاحەدین و بن تەیمیە، هیچیان بۆ کورد نەکردووە، ئەوا دەتوانین پاساویان بۆ بێنینەوە، چونکە سەردەمی ئەوان، سەردەمی کوردایەتی نەبوو، بەڵام دەڵێی وەك: (لەیلا بەدرخان، سوعاد حسنی، سەلیم بەرەکات، یەشار کەمال)، لە سەردەمی کوردایەتیدا، کە کورد و عەلمانیین، هیچیان بۆ کورد نەکرد!

خەتای ئیسلام لە چییە، کە کورد هێشتا لە قەبیلەبوون دەرنەچووە؟ چەپی کوردی لە سیەکانەوە سەرکردایەتی لایەنی کەلتووری و حیزبی کوردی کردووە!

ئەم دەوڵەتانەی دکتۆر مجدی بە " ئیسلامی" ناویان دەبات، تەنیا بە " قاڵك" ئیسلامین، ئەگینا زیندانەکانیان لە کەسی ئیسلامی جمەی دێت، بە واتای: بەر لەوەی بە هانای کورد نێن، بە هانای ئیسلامیەکانی ناوخۆیانیانیش نەهاتوون، هەربۆیە بەهاری ئیسلامیان لەناودا بەرپابوو، بەڵام ئەمریکا و ئەوروپیەکان (مەسیحی) لەگەڵ دکتاتۆرەکانی وەك: (بوتفلیقە و سیسی و بەشار) لێیانکردنە " پایزی ڕۆژهەڵاتی ناڤین"! قسەکردنیشیان لە سەر هەڵەبجە کردە بڤە!

نموونەی وەك: (بوتەفلیقە و سیسی) کودەتایان لەسەر " شەرعیەتی هەڵبژاردن " کرد، ئەوروپا و ئەمریکای مەسیحی و قیبلەی مرۆڤدۆستی لای عەلمانیەکان، فزەیان لێوە نەهات!!

**هەروەها لەم چەند خاڵەی خوارەوە : ئیسلام و موسڵمانی شیوعی... تێکەڵ یەك دەکات:**

٥- کورد زۆر چەوساندنەوەی لە ئیسلام دیتوە بە جۆرێك لە ئەمازیغ زیاتر بینیوە!

٦- کورد لە زەمانی عومەرەوە، تا ئەردۆگان، لە هەموو نەتەوەیەك زیاتر دژی ئیسلام ڕاپەڕیوە!

٧- بارزانی و تاڵەبانی وەك دوو قەبیلەدار لە دژی یەك بوون، بە (ئۆلبرایت)ی (ئەمریکی : مەسیحی) لە (١٩٩٧) ئاشت بوونەوە.

٨- زۆربەی هەڵەکانی کورد بەهۆی ئیسلامەوە بووە، کەسایەتییە ناودارەکانی کورد لە مەلا ئیدریسی بدلیسیەوە، تا مەلا کرێکار خیانەتیان لە نەتەوەی کورد کردووە.

٩- کورد یەکەم نەتەوەن لە شوێنی خۆیان دەوڵەتیان بۆ دروستنەکراوە!

لە خاڵی کۆتایی دەست پێدەکەین: کێ بوو نەیهێشت کورد لە وڵاتی خۆی دەوڵەتی هەبێ؟ نەوەکانی خەلیفە، یا نەوەکانی قەشە؟ مەلا ئیدریسی بدلیسی، هەم میرە کوردەکانی دەوڵەتی عوسمانی کردە یەك، هەم جۆرە کۆنفیدرالیەکی لە نێوان دەسەڵاتی کوردی و دەوڵەتی عوسمانی بەرپاکرد، کە ئێستاشی لەگەڵ دابێ سەرانی عەلمانی کورد، تەنیا بەشێکی کوردستانیان کردۆتە چەند بەش!
کەواتە: هەڵەکانی کورد، بەرهەمی چەپی کوردییە، نەك مەلای کوردی.

لە بەشێك لە دیدارەکەدا دکتۆر مجدی دەیەوێت، بارزانی و تاڵەبانی بە دووسەرکردەی ئیسلامی ناوزەد بکات، کە بە ئۆلبرایتی (مەسیحی) ئاشت بوونەوە، کەچی نەوەی نوێی کوردیش دەزانێ، ئەو دووە سەرۆکی حیزبی عەلمانی کوردین، نەك ئیسلامی! هەر لە سەر ئەو ڕێڕەوە دەپرسین: تەیمورلەنگ و صەدام حسێن، چ پەیوەندیان بە ئیسلامەوە هەیە؟ گەر مەبەستت ناسنامە بێ، ئەدی ناسنامەی دینی (میشێل عەفلەق) چییە، خۆ خەلیفە نەبووە؟!

لە سەردەمی عومەردا بانگەشەی ئەوە دەکەی، کە (١٤) یاخیبوون و هەڵگەڕانەوەی کوردی دروست بووە!
لە سەردەمی خەلیفە (عومەر)دا هیچ هەڵگەڕانەوەیەکی کوردی لە خاکی کوردی نەبووە، دەزانی بۆ ؟ چونکە کورد بە فتوحاتی ئیسلامی ڕزگاری بوو، لە هەیمەنەی فارسی لە خاکی کوردی.
باشە لە جەزیرەی عەرەبی، لە زەمەنی خەلیفە (ئەبو بەکر)دا هەڵگەڕانەوەی عەرەبی بە سەرکردایەتی: موسەیلەمەوە دروست نەبوو؟ گەر لە هەندێ شوێنی ناوەوە و دەرەوەی کوردستان لەبەر ئەم دوو هۆیە ،هەڵگەڕانەوە دروست بوبێت:

١- پیاوی ساسانی بوون.
٢- ئاشنانەبوونی کورد بە ئیسلام، بە تایبەتی کوردەکانی ناو دەوڵەتی ساسانی

وەك فارسەکان شەڕی ئیسلامیان کردووە!

کورد هیچ چەوسانەوەیەکی بە دەست دەقی ئیسلام نەبینیوە، چونکە دەقی قورئان، زمان جیایی و نەتەوە جیایی بە دوو ئایەتی خوا دەزانێت، بەڵام ئازارێکی زۆری بینیوە بە دەست عەلمانیە " موسڵمان"ەکانی عەرەب و تورك و فارس، بۆیە (شناوی)، نوسەری ئیسلامی، کوردەکان بە هەتیوی موسڵمانەکان ناودەبات، چونکە دەوڵەتی: عەرەب و تورك و فارس، بەرهەمی (سایکس بیکۆ) بوون، کە باپیرانی (ڕەشید) و (دکتۆر مەجدی) دەوڵەتی بۆ ئەوان لە سەر حسێبی کورد دروست کردبوو!! لەگەڵ چەندان قسەی بێ بنەما وەك: " غلبان"، " همجي"، " غير منفتحين على العالم"، " دور الكاربي لشيوخهم"!!...

دکتۆر، دیتنی خۆی بە" دراسة عميقة - توێژینەوەی قووڵ" دەربارەی کورد ناودەبات، کە لە سەر چەند کتێبی وەك: کتێبەکەی (طبری و ئیبن ئەسیر و شەرەفنامە و خولاصەیەکی مێژوویی...)دامەزراوە!

لەم وەڵامەدا ئیسپاتی دەکەین: دکتۆری تەبشیری، زۆر سەرچیخ چووە و قسەکانی تەواو بێ بنەما و ئەرگیومێنتی مێژووییین، وەك ئەفسانەی بەشداری ئاشووری لەگەڵ کورد لە ژێر ئاڵای ساسانی دژی موسڵمانەکان!!

لە بەشێك لە دیدارەکەدا، دکتۆری ناوبراو زۆر قسە لە سەر (شەرەفنامە) دەکات، جابا بزانین شەرەفخان ئەوهای گوتووە؟!

## شەرەفخانی بدلیسی و فتوحاتی ئیسلام:

دکتۆر مەجدی بە ئارەزووی خۆی قسە بە زمانی (شەرەفخانی بدلیسی) دەکات، گوایە: ئەوە شەرەفخانە باس لە " دوعای پێغەمبەر لە کورد" دەکات ؟ دکتۆر مەجدی، هیچ دەقی قسەکە ناهێنێت، بەڵکو لە کۆنتێکست دایدەبڕێت. ئەصڵی قسەکە لە (ل١٦)ی چاپی کوردی (شەرەفنامە) دایە: "ئۆرغانی تورکستانی، (بوغدوز) ناوی کوردستانی ناردوە لای پێغەمبەر. (بوغدوز) ئەوەندە ناشیرین و ڕەزاگران بو: پێغەمبەر بێزی لە چرۆچاوی هەڵقرچاوی هەستا و لە

داخانی توك و نەفرینی لە هەمو کوردی سەرزەمین کرد!"

ئەمە قسەی شەرەفخان نییە، بەڵکو قسەی خواجەی تورك-ە لە (تاج التواريخ) بەنیازی دوورخستنەوەی کورد لە ئیسلام نووسراوە، زێتر هەژار موکریانی دەربارەی ئەم درۆ و دەلەسەیە لە (ل١٦)ی (شەرەفنامە) دەنووسێت :" حاشا کە پێغەمبەری خوا ئاکاری وا نالەباری بوبێ و ئەم درۆپوچ و بەریادە لەدەمی ئەوانە زیادە، کە بۆ لاکی مرداری دنیا ڕێکیان خستوە."

هەر بە پاڵپشتی شەرەفنامە ( شەرەفخان بەرییە لەو تۆمەتانە) تۆمەتێکی تر بە پێغەمبەر دەکات و دەڵێت : بە پێی گێڕانەوەی (کولەینی)، پێغەمبەر وتویەتی: "

کولەینی لە (ئەبو ڕەبیعی شامی)ەوە ڕیوایەت دەکات، دەڵێ :

"سالت ابا عبدالله - عليه السلام - فقلت : ان عندنا قوما من الاكراد ، و انهم لايزالون يجيئون بالبيع ، فنخالطوهم و نبايعهم ؟ فقال يا ابا الربيع ! لا تخالطوهم ، فأن الاكراد حي من احياء الجن ، كشف الله عنهم الغطاء ، فلا تخالطوهم.

واتە: پرسیارم کرد لە ئەبو عبدالله - عليه السلام - وتم : ئێمە خەڵکانێکمان لایە کوردن، شت دەفرۆشن، ئایا تێکەڵاوی و کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ دا بکەین؟ ئەویش وتی: ئەی باوکی ڕەبیع! تێکەڵاویان مەکەن، کوردەکان بەشێکن لە جنۆکە، بەڵام خوای گەورە پەردەی لە سەر هەڵماڵیون، جا تێکەڵاویان مەکەن."

(ڕەبیع شامی) ڕیوایەکی دی دەگێڕێتەوە: "و لاتنكحوا من الاكراد احدا ، فانهم جيش من الجن كشف عنهم الغطاء- ژن لە کوردان مەخوازن، لەبەر ئەوەی سوپایەکن لە جنۆکە، پەردەیان لە سەر هەڵمادراوە."

جگە لە (کولەینی) دەیان شێخ و نووسەری شیعی، دەیان قسەی ناشرین لە سەر کورد دەنووسن وەك: (ئیبن ئیدریسی حللی، یەحیای حللی، ئیبن موتەهری حللی و تووسی، ئیبن فەهدی حللی، مەسعودی....).

ئەم شیعانە سەدان قسەی نابەجێ لە سەر قورئان و خودا و سوننە دەڵێن، جا چۆن قسە لە سەر کورد ناکەن؟! فتوحاتی ئیسلامی و شەڕی (چاڵدێران)

زۆربەی کوردی لە مەملەکەتی یەزگوردی و شیعی کردەوە، جا شیعە هەموو شتێك بە پێچەوانە دەربارەی کورد دەڵێت، دکتۆر مەجدی تەبشیریش ئەمە بە ئیسلامی دەزانێت!!!

پرسی: "اکردوهن في الجبال" هیچ پەیوەندی بە نەتەوەی کوردەوە وەنییە، دکتۆر محمد بهجت قبیسی لە (ل٢٥٠-٢٥١) ی کتێبی (الاكراد و النبي) دەڵێت: وشەی کوردە (کرد) واتای نەتەوەی کورد ناگەیەنێت، بەڵکو واتای (دوورخستنەوە یا نەفیکردن) دەگەیەنێ کەواتە (اکردهن فی الجبال)، واتای: دوورخستنەوە بۆ نێو چیا دەگەیەنێت، ئەمەش هەمان قسەی بێ بنەمای فیردەوسییە.

هەژار موکریانی لە (ل١٤-١٥) دەنووسێت: "(فیردەوسی)، گوایە بەزەیی بە ئێمەی کورد هاتۆتەوە لەناو کەڵپ و پەنجەی زەهاکی خوێنمژ و ناپاکی دەرهێناوین و( بەرەو چیا) ڕاوی ناوین و لەسایەی سەری ئەو چیارژد و هەڵەموتانەوە ماوین..."

کەواتە دەقی قورئان و شەرەفخانی بدلیسی، بەریین لەو قسانەی سەرانی شیعە، قورئان بە ڕاشکاوی وەڵامی بە جنۆکە دیتنی مرۆڤەکان ڕەتدەکاتەوە و لە دەقێکدا دەفەرموێت: " (و الله جعل لكم من انفسكم ازواجا) هەروەها ابن عساکر لە حەسەن بەصیری دەگوازێتەوە، کە وتویەتی: " الجن لا يتوالدون اي ان المرأة من الانس لا تلد من الجن(جابانی کوردی، ل٢١٣).

## موحەممەد ئەمین زەکی و ئیسلام :

دکتۆر مەجدی زۆر بێ ویژدانانە بە زاری گەورە مێژوونووسی کورد موحەممەد ئەمین زەکی قسە دەکات، بە جۆرێك کەسێك ئاگاداری مێژوو نەبێ، وا دەزانێ موحەممەد ئەمین زەکی، دژی ئیسلامە!

سەیرکە لە (ل٨٩) بەراوردی ڕەوشی کوردستان لە کۆتایی حوکمی (هراقل) و سەرەتای ئیسلام دەکات و، دەیەوێت وێنەی تەبشیری زاڵ بکات، بەڵام لای

موحەممەد ئەمین زەکی تەواو بە پێچەوانەیە، (هراقل)ی نوێنەری تەبشیری داگیرکەرە ئیسلام هیدایەت ئامێزە: " هراقل بۆ تەعقیبی خەسرەوی پەروێز، بە سەر شارەزووردا تێپەڕی و مانگی شوباتی (٦٢٨ م) ی شارەزووردا رابوارد و هیچ شار و گوندی تیا نەهێشت و سووتاندی و لە پاشدا رووی کردە ئەردەڵان، ئەم وەقایعە تەسادوفی زهوری ئیسلامی کرد و لەم وەقتەدا بوو، کە ڕۆژی هیدایەت لە ئوفقی موبارەکی مەککەی موکەڕەمەوە هەڵهات و بەرەبەرە دەستی کرد بە ڕووناك کردنەوەی وڵاتانی ئەترافی."

دەسەڵاتی فارسی، پێش و پاش دۆڕاندنی شەڕی (چالدێران) بەردەمێتە گیانی سەرکردەکانی کورد، وەك: دکتۆر جەمال نەبەز لە کتێبەکانی ئاماژەی پێدەکات، کە ئەمین زەکی باسی ستەم و بێدادی (ئیسماعیلی صەفەوی) دەکات...ئەمە چ پەیوەندی بە ئیسلامەوە وەیە، د.تەبشیری بە نموونە دەیهێنێتەوە؟صەفەوی بە هەزاران کەسی لە تەبرێز کوشت، هیچیشیان کورد نەبوون، بەڵکو سوننە مەزهەب بوون!!

## موحەممەد ئەمین زەکی و فتوحاتی ئیسلامی :

موحەممەد ئەمین زەکی، زۆر دادوەرانە مامەڵەی لەگەڵ پرسی فتوحات کردووە، کە زۆربەی بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی دکتۆر (مەجد)یە، زۆر نووسەری وەك (ڕۆژبەیانی) باسی چەکداری کورد لە (جەلەولا) دەکەن، ئەمین زەکی ئاوا باسی بەرایی شەڕ دەکا و ئاماژە بەوە دەکات، کە جەلەولای کوردی، سوپای فارس داگیری کردووە :" لە دوای فەتحی مەدائین...(سەعد کوڕی وەقاص) لە ژێر قوماندای (هاشم بن عتبە) ئۆردوویەکی ناردە سەر جەلەولا، چونکە بەقایای ئۆردووی فورس لەوێ گرد بووبۆوە." هەروەها لە هەمان لاپەڕەدا، (ل٩١)، دەنووسێت :" ئۆردووی ئیسلام لە پاش شەڕێکی موناسیب، فورسیان دەربەڕاند. وە حەزرەتی (قەعقاع) شوێنیان کەوت و (حەلوانی) زەوت کرد . وە بەم نەوعە ئەوەڵ تەماسی کورد و وەتەنی کورد لەگەڵ ئۆردووی ئیسلاما واقیع بوو.."

مەحمود شاکر (٢٠٠٠) له (ل١٧٣-١٧٥)ی بەرگی (٣-٤)ی (التاريخ الاسلامی) دەنووسێت: " و اقاموا بجلولاء و قد تحصنوا بها، و حفروا الخنادق حولها.. فسار هاشم و حاصرهم و اشتد القتال، و كانت تصل النجدات الى الطرفين، و فتح الله على المسلمين جلولاء و قد قتلوا من الفرس الكثير تجللت بجثتهم الارض.."

دکتۆر زرار صدیق له (ل٢٥) به چەواشەکاری له (ل١٢٢)ی کتێبەکەی: (دینەوەری) دەگوازێتەوە و دەنووسێت: "ڕێژەی ئەم ئافرەتە دیلکراوانە هەندە زۆربوو و هەند ستەم و بێدادیان دەرهەق ئەنجامدرا، تا ئەو ئاستەی خەلیفە عومەر بێژێت " اللهم اني اعوذ بك من اولاد سبايا الجلوليات."

**دەقی قورئان و فەرموده دوو شتی گرینگ له یەك جیادەکەنەوە :**

١- کەسانێك لەناو سوپای ئیسلام هەن، تەنیا له پێناو خودا و پێغەمبەر شەڕ دەکەن، نەك غەنیمەت و سەبایا!

٢- کەسانێکی کەمیش هەن له پێناو غەنیمەت و سەبایا دێنە جیهاد!

له دەقەکەی دینەوەری دەردەکەوێ: ئیمامی عومەر خۆی به خوا پەنا داوه له ئافرەتانی گیراوی جەنگ .

پاش ئەو هەموو ڕاستیە، دکتۆر زرار وەك دکتۆر مجدی، هەر بەشێکی تێکست له کۆنتێکست دادەبڕێ و بەس بۆ ئەوەی مەخسەدی خۆی بپێکی، بەڵکو ناسنامەی کچەکانیش دەگۆڕێت له (فارس) ەوە بۆ (کورد). سەیر بکەن دینەوەری له (ل١٢٩) هەمان کتێب: (الاخبار الطوال)، چۆن باسی (جەلەولایەکان) دەکات؟ ئەو جەلەولایانە کچ بوونە، نەك ژن، هەروەها ئەو کچانە، کچی ئازادی فارسی بوونە، (کچانی ماڵبات، بەتایبەتی ماڵباتی دەسەڵات) نەك کورد!! هەروەها هیچ ستەم و بێدادیەك له ئارا نەبووە، هەتا چەندەها کوڕ لەو ژنانە پەیدا بوونە، که بەشداری شەڕی صفین-یان کردووە :
" و سبوا السبايا كثيرا من بنات احرار فارس .....فأدرك ابناءهن قتال صفين ...."

له بەشەکانی ئەم کتێبە ئاماژەمان بەوە کردووە، که له لوتکەیی بەرایی دامەزراندنی دەوڵەتی ساسانیدا، دەڤەری گەرمیان سیخناخ وپڕ کراوە به

دەسەڵاتی فارسی و پارسی (سەیری نووسینی سەر پەیکۆڵی سەردەمی شا نرسی بکە) هەروەها ڕوداوی (صفین)، یا ڕوداوی نێوان (علي و معاويە) لە ساڵی (٣٧) کۆچی، ڕوداوێکی تاڵە لە مێژووی ئیسلامیدا.

لە لایەکی تر، ئیمامی عومەر لەگەڵ بڵاوکردنەوەی ئیسلام بە شەڕ نەبووە، ئەمین زەکی دەنووسێت:... بەعزێك ئەڵێن، کە حەزرەتی عومەر ئەوەندە مەیلی پێشکەوتنی بۆ وڵاتی عەجەم نەبوو."

ئەمەش تەواو قسەی: (طبري و ئیبن ئەسیر و بلازري...)دووپاتدەکاتەوە، کە دەڵێن: خەلیفە عومەر گوتویەتی : خۆزیا لە نێوان ڕەشەخاکی عێراق و ئەقلیم جیبال، چیایەك لە ئاگر هەبوایە نە ئێمە بە وان گەیشت باین، نە ئەوان بە ئێمە."

کوردی ساسانی، لە شەڕێکی لابەلا و دەرەوەی خاکی خۆی، بەرگری لە دەسەڵاتی بەزیوی ساسانی کردووە، بۆیە دووچاری شەڕ بووە، (ئەمین زەکی) لە (ل٩٢) باسی شەڕەکە ئەوها دەکات: " لە بەینی ساڵی (١٨ و ٢٣) هیجریدا وە لە مودافەعەی (ئەهواز و فارس و دارابجرد)دا، کورد لەگەڵ ئێرانیەکانا موتەفیق بوو، وە بە تەبیعەت یارمەتی دان، لەبەر ئەمە لە تەرەف ئۆردووی ئیسلامەوە تەئدیب و تەجزیە کران و لە ماڵ و گیاندا زایعاتێکی زۆریان بوو."

نازانم چی لەو جۆرە کوردە بکرێ، کە لە دەرەوەی کوردستان شەڕ بکا و بەرگری لە ساسانی بکا، ئایا سزا بدرێ، یان خەڵات بکرێ؟؟!!

## یاخی بوونی کورد:

وەك گوتمان: دکتۆر (مجدی) لە بەرنامەکە بانگەشەی ئەوە دەکات، کە تەنیا لە سەردەمی (عومەر) دا (١٤) هەڵگەڕانەوەی کوردی هەبووە. زرار صدیق لە (ل١٠ هەتا ل٢٤) باسی گرتنی زۆربەی شارەکانی کوردی لە سەردەمی (عومەر) دەکات، بەڵام باسی یەك هەڵگەڕانەوەی کوردەکان ناکات، بەڵام لە (ل٢٤)دا دەنووسێت: دوای کوژرانی خەلیفە (عومەر)، خەڵکی ئازەربایجان پێگیریان بە سەر ڕێککەوتنامەکەی زەمانی (عومەر) نەدەکرد، لە دەسەڵات هەڵگەڕانەوە.."

ئەمین زەکی لە (ل٩٢) باسی دوو یاخیبوونی کورد دەکات، لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا، نەك عومەری کوڕی خەتاب، لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستاندا بەمجۆرە:

یەکەم: حەزرەتی (عیاز)، (حبیب بن مسلمة الفهری) لەگەڵ قومتێکدا لە کوردستانەوە ناردە سەر (مەلاتیە) و زەوتی کرد، بەڵام ئەم شارە لە پاش بەینێ دیسان لە دەستی ئیسلام چووە دەرەوە.

دووەم: دەرەوەی کوردستان: "لە ساڵی (٢٥)ی هیجریدا، وە لە زەمانی حاکمیەتی (عامل)، (ئەبوموسای ئەلئەشعەری) لە بەسرەدا، دوو دەفعە کورد لە ئەهواز و فارسدا عصیانی کردوە." مەحمود شاکر لە (ل١٧٥)ی بەرگی (٣-٤) ی (التاریخ الاسلامی) دەربارەی ئەهواز دەنووسێت: " احواز و هو من احد البیوتات فارس المشهور.."

هەروەها (ئیبن کەسیر) لە ژێر ناونیشانی: (غزوة الاکراد) دا باسی شەڕێکی کوردەکان لە نزیك (ئەسپەهان) دەکات، (ئیبن کەسیر) لە (ل٩٦)ی بەرگی (٧-٨) ی (البدایة و النهایة) لە بارەی کوردەکانی سوپای ساسانی لە دەرەوەی کوردستان دەنووسێت: "ان جماعة من الاکراد و التف الیهم طائفة من الفرس اجتمعوا فلقیهم ابو موسی بمکان من ارض ببروذ قریب من نهری تیري ، ثم سار عنهم ابو موسی الی اصبهان وقد استخلف علی حربهم الربیع بن زیاد بعد مقتل اخیه المهاجر بن زیاد ، فتسلم الحرب و حنق علیهم فهزم الله العدو و له الحمد و المنة..."

من چ لەو کوردە بکەم، کە لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان، بەرگری لە سوپای داگیرکەری ساسانی بکات؟؟! بۆی بگرێیم ؟!!

دوای خستنەڕووی ڕای هەردوو مێژوونووس: (شەرەفخان) و (ئەمین زەکی)، کە تەواو بە پێچەوانەی دکتۆر (مجدی) قسە دەکەن، شرۆڤەی هەندێ قسەی دی بەرنامەکە دەکەین.

بەشێك لەو بابەتانەی دکتۆر (مەجدی) دەیوروژێنێت :

## پرسی ئەشجەعی و کورد :

دکتۆر (مجدی) بە قسەی هەنگوینی دەڵێت: (طبری) دەڵێت: "١٤" یاخیبوونی کوردی تەنیا لە سەردەمی (عومەر) پەیدابووە "بێئەوەی ئاماژە تەنیا بە یەك هەڵگەڕانەوەی کوردی لە سەردەمی عومەر بکات!!"

بە چەواشەکارییەوە، ئاماژە بە شەڕی (ئەشجەعی و کورد) دەکات! جارێ ئەو کوردانەی ڕازی نەبوون نە موسڵمان بن، نە سەرانە بدەن، پێشتر موسڵمان نەبوون، تا هەڵگەڕێنەوە، بەڵکو کوردی ناو دەسەڵاتی ساسانی بوون، بەم بەڵگانەوە :

**دوو گێڕانەوە لە پرسی ئەشجەعی و کورد هەیە:**

**یەکەم: گێڕانەوەی: (طبری و ئیبن ئەسیر و ئیبن کەسیر و ئیبن خەلدون).**

ئەم گێڕانەوەیە هەمووی لە سەر گێڕانەوەی (طبری) دامەزراوە. ئەم گێڕانەوەش پێشەکی و پاشەکی هەیە، کە دژ بە نەیارانی ئیسلامن:

١- (طبری) لە (ل٥٦٦-٥٦٨) دا ڕووداوی (ئەشجەعی و کورد) بە دوو ڕوایەتی جیا دەگێڕێتەوە :

ا- " فقتلناهم فنصرنا الله عليهم، فقتلنا المقاتلة، و سبنا الذرية و جمعنا الرثة (المتاع).."

ب- "فلقينا عدونا من الاكراد ، فدعوناهم ، و جمعنا الرثة ..."لەم گێڕانەوەیە" و سبنا الذريه" نییە!

٢- گێڕانەوەی (ئیبن ئەسیر):

(ئیبن ئەسیر) لە (ل٤٤٥-٤٤٦) ی بەرگی دووی (الكامل فى التاريخ) ڕووداوەکە ئەوها کورتدەکاتەوە ".. فقاتلناهم فهزموهم و قتلوا المقاتله . و سبوا الذرية فقسمه بينهم، و رأي سلمه جوهرا في سفط..."

دەستەواژەی "سبوا ذراريهم" کە (طبری) و (ئیبن ئەسیر) و (ئیبن کەسیر) ئاماژەیان بۆ کردووە، بە هەڵە تەرجوومەی بۆ کراوە، بەوەی واتای: بە سەبایکردن دەگەیەنێت. حەیدەر عبدالله لە (ل٣٢٢-٣٢٣)ی فەرهەنگی (نما) دەربارەی: (سبي، السبي) دەنووسێت: "بەدیلی گرت، بەندکراوانی جەنگ." هەروەها لە (ل١٢٠) چاپی (المنجدی) کوردی دەربارەی "الذراري و الذريات" هاتووە: "زارۆڵە و وەچەی پیاو" کەواتە دەستەواژەکە بە واتای بە دیلگرتنی زارۆڵە و وەچەی (نەوە)ی پیاو دەگەیەنێت، نەك کچ و ژنی کوردی.

هەریەك لە طبری (ل٥٦٦-٥٦٨)، ئیبن ئەسیر (ل٤٤٥-٤٤٦)، ئیبن کەسیر (ل٩٦) تەنیا بە ئاماژەش لە باسی گرتنی بەندکراوانی جەنگ، باسی کچ و ئافرەت ناکەن، کەچی دکتۆر زرار صدیق لە (ل١٨)ی کتێبی (کورد و کوردستان لە رۆژگاری خیلافەتی ئیسلامیدا) لە وەرگێرانی قسەکەی: (طبری و ئیبن ئەسیر و ئیبن کەسیر) بە ئارەزوو و تەکەهوناتی خۆی دەنووسێت: "(سلمة الاشجعی)، کوردە شەرکەرەکانی کوشت و ژنان و کچانی دەسگیرکرد" لە پەراوێزیش ئاماژە بە کتێبەکەی (طبری) و (کامل في التاريخ) دەکات.

(طبری) لە (ل٥٦٦) دەنووسێت: "فقاتلناهم( نەك قتلناهم) فنصرنا الله عليهم، فقتلنا المقاتلة، و سبينا الذرية و جمعنا الرثة (المتاع)." شەرمان لەگەڵ کردن، خودا سەری خستین بە سەریانا، شەرێکی جوامێرانەمان کرد، زارۆڵە و نەوەمان لێ بەدیلگرتن و کەلوپەلمان لێ گرتن."

(ئیبن ئەسیر)یش لە (ل٤٤٦)ی بەرگی دووەم، ئاوا رووداوەکە دەگێرێتەوە: ".. فقاتلناهم فهزموهم و قتلوا المقاتلة. و سبوا الذرية فقسمه بينهم - شەرمان لەگەڵ کردن، شکستمان پێهێنان ..."

لە هەمووش سەیرتر، نە (طبری)، نە (ئیبن ئەسیر) و نە (ئیبن کەسیر) لە ناونیشانی رووداوەکە پاشکۆی "المشرکین" بەکارناهێنن، بەڵام دکتۆر زرار صدیق لەخۆیەوە دەنووسێت: " عدوا من الاكراد المشركين "!

٣- لە (ل٩٦)ی بەرگی (٧-٨)ی (البداية و النهاية)، (ابن كثير) هەر باسی " خبر سلمة بن قيس الاشجعي و الاكراد" ناکات، بەڵکو لە هەمان لاپەڕەدا، باسی ڕوداوێکی دەرەوەی وڵاتی کورد بە ناوی: "غزوة الاكراد" دەکات. (ئیبن کەسیر) وەك (طبری) باسی سێ داواکاریەکەی سوپای ئیسلام دەکات : (ئیسلامبوون، خراج، شەڕ) .

ئیبن کەسیریش هەمان چیرۆکی (طبری) بە کورتی دەگێڕێتەوە، کە ئەو کوردانەی پێیان گەیشتووە، هەڵبژاردەی سێیەمیان هەڵبژاردووە و شەڕیان کردووە و دۆڕاون و ... (الاشجعي) جەوهەرەیەکی بۆ (عومەر) ناردووە و ئەویش بە توندی ڕەدی کردۆتەوە ."

٤- (ئیبن خەلدون) لە (ل٥٦٧-٥٦٨)ی بەرگی دووەمی (تاريخ ابن خلدون) دەنووسێت: "فلقوا عدوا من الاكراد المشركين فدعوهم الى الاسلام او الجزية، فأبوا و قاتلهم..."

هەر یەك لە دکتۆر (مجدی) و دکتۆر زرار و یونس ڕاوی، باسی پێشەکی ڕوداوەکەی: (ئەشجەعی و کورد) ناکەن، کە خەلیفە عومەر بۆچی ئەشجەعی ناردووە و چی پێ وتووە! (طبری و ئیبن ئەسیر و ئیبن کەسیر) هۆکارەکە و قسەکەی عومەر بۆ ئەشجەعی تۆماردەکەن و دەنووسن: " ان امير المؤمنين كان اذا اجتمع اليه جيش من اهل الايمان امر عليهم رجلا العلم و الفقه - ئەمیری ئیمانداران هەر کە لە سوپایەکی ئیمانداران کۆدەبێتەوە، کەسێکی ئەهلی عیلم و فیقهـ ، لەگەڵ هەناردوون."

هەروەها لە کۆتایی ڕوداوەکە دەردەکەوێت، کە خەلیفە عومەر چەند تووڕە و پەست بووە، کە (ئەشجەعی) خشڵێکی گرانبەهای بۆ دەنێرێ: " ثب ثم يده في خاصرته ثم قال : لا اشبع الله اذا بطن عمر! - ڕاپەڕیە سەرپێ، دەستی خستە سەر کەمەری و گوتی: خودا،عومەر تێر نەکات، گەر قەڵەو بێت .طبری ل٥٦٧"

لە ئاکام دا خشڵەکەی تەواو ڕەدکردەوە ...کەواتە: لە سەرەتا و کۆتایی ڕوداوەکە دەردەکەوێت : پرۆسەی (فتوحات) هیچ پەیوەندی بە تاڵانی و

غەنیمەتەوە نییە، بەڵکو لە هەر سوپایەکی ئیسلامی، زانایەك و فەقیهێك ئامادەی هەبوو، تا کاروباری دینی بۆ موسڵمان و غەیرە - موسڵمان ڕوون بکاتەوە، تا (( فان قاتلكم فلا تغلوا و لا تغدروا و لا تمثلوا، و لا تقتلوا وليدا)). طبری (ل٥٦٦)، ئیبن ئەسیر (ل٤٤٦)!

سەیرکە، نەیارانی ئیسلام تەواو ڕوداوەکەیان پێچەوانەکردۆتەوە، (طبری) و (ئیبن ئەسیر) و (ئیبن کەسیر)، هیچ ئاماژەیان بە گرتنی "ژن و کچی کورد" نەکردووە!

**دووەم گێڕانەوە، گێڕانەوەی کوردی :**

**موحەممەد ئەمین زەکی و ئەشجەعی :**

(طبری) و (ئیبن ئەسیر) و (ئیبن کەسیر) باسی ئەشجەعی و کوردی ساسانیان کردووە، موحەممەد ئەمین لە (ل٩٢) بە شێوازێکی تر باسی (ئەشجەعی) و کوردی هاوپەیمان بەسوپای ساسانی دەکات، گوایە: شەڕی (ئەشجەعی) لەگەڵ ئەو کوردانە بوو، نەك کوردی تر، ئەوەتە لە (ل٣٢٩) ی (تاريخ الأمم الاسلامية) دەگوازێتەوە: " دەفعیەکی تریش هەر لە زەمانی حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه)دا بەعزێکیان وڵاتی (کرخا)ی مەرکەزییان (بەشی سایمارا و ماسابازان)داگیرکرد. لە سەر ئەمە حەزرەتی عومەر، (قيس بن سلمة الاشجعي) ناردە سەریان و تەئدیبی کردن."

**دوو مێژوونووسی کورد دوو وێنەی زۆر ناشیرینی هەندێ لە میرانی کورد تۆمار دەکەن :**

**وێنەی یەکەم: (ئیبن خەلەکان) و (وفيات الاعيان):**

ئیبن خەلەکان (١٢١١- ١٢٨٢)، بە شاهێدی زۆران، هەر مێژوونووس نەبووە، بەڵکو (قاضي القضاة)ت بووە، بۆ نموونە: حسێن شاکر لە (ل٣٠) ماستەرنامەکەی، (کورد لە وفيات الاعيان...)دەڵێت: ناوبراو بە: (شمس الدين) و (قاضي القضاة) بەناوبانگ بووە لە کتێبی: (وفيات الاعيان) دا ئاماژە بەکارێکی دڕندانەی ئەمیرێکی کورد دەکات بە ناوی: (ئیبن لەیسی کوردی):
"...الم تعلم ان احمد ابن الليث الكردي قتل ب(كرمان) سبعمائة انسان على دم واحد و افتض الاكراد مائتي بكر من اهل البيوتات و حملوا معهم نحو الفي امراة الى بلادهم..
واتە: نازانیت ئەحمەد ئیبن لەیسی کوردی لە (کرمان) (٧٠٠) مرۆڤی لەبری خوێنی زەلامێك کوشت، کوردەکان (٢٠٠) کچیان بێ بن کرد( کردە ژن)، هەروەها (٢٠٠٠) ئافرەتیان بۆ وڵاتی خۆیان بردووە."
کەواتە کێ کچ و ژنی کێی بردووە؟ گێڕانەوەکەی: (طبری و ئیبن ئەسیر و ئیبن کەسیر) یا گێڕانەوەکەی (ئیبن خەلەکان)؟؟!

**وێنەی دووەم: شەرەفخان و میرێکی کورد:**

شەرەفخانی بدلیسی لە (ل٤٤)ی چاپی کوردی (شەرەفنامە) و (ل١٠٨) چاپی عەرەبی شەرەفنامە، ئەم وێنە تەڵخە دەربارەی میرێکی کوردی بەناوی: (ئەحمەدی کوڕی مەروان)، کە ئاڵای سەربەخۆیی هەڵگرتبوو، " هەمیشە سێسەد و شێست و شەش کەنیزەی لوس و لەباری هەبوە .هەر شەوێك لە شەوگاری ساڵدا دەگەڵ یەکێکیان خەوتوە و هیچ کەنیزێك لە ساڵێکدا دوجار چاوی بە کرپاری خۆی نەکەوتوە."
ئەم قسانە بە ئاسانی هەرس ناکرێن، چونکە میرێك بانگەشەی سەربەخۆیی کرد بێ ،چۆن ئەوەندە کەنیزەکی دەبێ؟

لە ڕاستیدا ئەم سەربەخۆییە لۆکەڵی بووە، هەر خودی شەرەفخان لە (ل٤١-

٤٢) ی (شەرەفنامە) دەنووسێت: "خەلیفەی عەبباسی: (القادر باللە) نازناوی (نصرالدولة) بە میر ئەحمەد داوە.

" جەمیل ڕۆژبەیانی، وەرگێڕی عەرەبی (شەرەفنامە) لە پەراوێزی ئەم قسانە، نووسیویەتی: "هذه مبالغة مختلقه من اعدائه". بەڵام چەند موبالەغە و پێوەنان هەبێ لە پرسەکە، هیچ لە پرسی "کەنیزەکی لوس" ناگۆڕێت! چونکە خوێنەر دەپرسێ: ئەم کەنیزەکانە لە چ نەتەوەیەك بوونە؟

گەر کورد بن، سەربەخۆیی، چ واتایەك دەگەیەنێت؟

هەروەها گەر لە نەتەوەی تر بن، چ ئینسانیەك دەگەیەنن؟!

بینیتان: (طبری و ئیبن ئەسیر و ئیبن کەسیر) باسی هیچ کەنیزەك و نامووسی کورد ناکەن، بەڵام ئیبن خەلەکان و شەرەفخان، دوو ئارگیومێنتی خەتەرناك لە بارەی دەسەڵاتی دوو میرنشینی کورد تۆمار دەکەن.

**سەرنجی یەکەم: زاراوەی بەربەریەت - بەدەویەت:**

دکتۆر ڕەفیق وەك "پێشکەوتنخوازێکی چەپ" قسە لە سەر زاراوەی (بەدەویەت) دەکات و دەیبەستێتەوە بە کانگای دەرکەوتنی ئیسلام، کە کەڵکی شارستانێتی نییە .لەمەش زیاتر، هەردوو میللەتی: عەرەب و تورك بە (بەربەری) لە قەڵەمدەدات.

فاروق ڕەفیق، بۆ هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی بەستنەوەی - بەربەریەت بەبەداوەت ،یا بەستنەوەی بەربەریەت بە بیابانشینی، دوو نموونە لە کۆمەڵگای مۆدرنی خۆرئاوا دەهێنێتەوە، کە لێواولێون لە بەربەریەتی مۆدرن، وەك لە (ل٢٩٨) دا دەنووسێت: "خۆرئاوا بەدوو شێوە زاراوەی بەربەریەتە:

یەکەم: سەدەی بیستەم، سەدەی ترۆر و قاتوقڕی و جووقڕان و بە لێشاو کوشتنی مرۆڤە ....لە ڕێگەی دوو جەنگی گەورە و چەندان جەنگی ترەوە .

دووەم: خۆرئاوا، خاوەنی هۆڵەکۆستە، هۆڵەکۆست، کە منداڵێکی سروشتی مۆدێرنەتیە.... بەربەریەریزم دەگاتە لوتکە و لە هۆڵەکۆستدا خۆی بەیان دەکا.."

گەر لە وڵاتە ئیشتراکیەکانی بەرهەمی هزری دکتۆر ڕەفیق، قسە لە سەر بەربەریەت بکەین، بە تایبەتی لە تەمەنی حوکمڕانی ستالین (١٩٢٤-١٩٥٣) مرۆڤ شەرم لە مرۆڤبوون دەکات، بەڵام بەنجی مارکسیبوون، ئەو مرۆڤ کوشتنە، بە سەرکەوتنێکی ستراتیژیەتی ئایدیۆلۆژیای چەپی دەزانی، وەك: (ستالین و ماو و پۆل پۆت) لە حوکمڕانی خۆیان کردیان.

ئەو پێشکەوتن و پێشکەوتنخوازیەی چەپی ڕۆژهەڵات، کورد یەکێك لەوان مێگەڵانە شاباشی بۆ دەکرد، کەچی لە ئەوروپا "دوو بیریاری وەك: (نیچە) و (هایدگەر)، سەرسەختانە ئایدیای - پێشکەوتن - یان خستە ژێر پرسیارەوە و، بگرە ئایدیای - پێشکەوتن - ئەمجارە لە سەر دەستی ئەوان بوونە نیشانە هیچگەرایی."

دکتۆر ڕەفیق، ڕۆڵی شارستانیانەی کورد لە: (دەوڵەتی ئیسلامی و دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێرانی) دادەبڕێ، بەمەش ئەو بۆچوونە دەسەلمێنێ، کە دەڵێ: کورد کێوییە، هەروەها بۆ ئۆرینتالیستە تازەکان دەچەسپێنین، کە پێ لەسەر شاخاویبوونی کورد دادەگرن - (ل٣٠١).

بە کورتی: سەبارەت بە سەرنجی یەکەمی فاروق ڕەفیق، دەربارەی کتێبەکەی ڕەفیق صابر، " ئەو تەنیا قسە لە ڕەگەزپەرستی ناکات - کە هەڵگری مانیفێستەکەیەتی - بەڵکو یەك گورزی گەورەش لە ڕۆڵی شارستانیانەی کورد لە ناوچەکە دەدات- (ل٣٠٢).

## سەرنجی دووەم: پەیامی نهێنی کتێبەکەی (ڕەفیق).

دکتۆر کەمال مەزهەر لە کتێبی: (مێژوو)، ئیسپاتی ئەوە دەکات، کە دیاردەی خوێندنەواری کورد دەگەڕێتەوە بۆ موسڵمانبوونی کورد. " ئەو هەموو توێژەرەی پێ لە سەر ئەوە دادەگرن، کە کورد کیویڵکە و شاخاوی بووە، هۆکاری خۆی هەیە، چونکە لە (٥٤٩)ەوە، هەتا (١٦ك)، ئەسیری (ئەخمینی) و (سلوکی) و (ئەشکانی) و (ساسانی) بووە، بۆیە ژیانی شاخی هەڵبژاردووە و دوور کەوتۆتەوە لە مەدەنی بوون.

ئیبن ئەسیر و ئیبن خەلدون لە کتێبەکانیان: ( لە شوێنی تری ئەم کتێبە ئاماژە بە لاپەڕەکان کراوە) کورد بە: (کۆچەر و بەدەوی) لە قەڵەم دەدەن . وەك کەمال مەزهەر وتەنی: بە موسڵمانبوون شوناسێکی مەعریفیبوونی وەرگرت.

ڕەفیق صابر لە کتێبەکەیدا، بە نیازی هزری و سیاسی، دەیەوێت ئەو موسڵمانبوونەی لێبکاتەوە و جارێکی تر بیکاتەوە: (کۆیلەی شاخەکان) . فاروق ڕەفیق لە (ل٣٠١ و ٣٠٢) دەنووسێت : دابڕینی کورد لە شارستانیبوونی لای کاك ڕەفیق کۆتایی پرسەکان نییە، بەڵکو وەك ڕەگەزپەرستێکی کورد دەیەوێ کورد لە موسڵمانبوون داببڕێت، "چونکە هەر هەموو ئیمپراتۆریەتەکانی ناوچەکە تەعبیرکردنێك بوون لە ئیسلام، ئیسلامیش زهنیەتێکی نەگۆڕە.."

پەیامە نهێنیەکەی (ڕەفیق) لای (فارووق) ئاشکرا دەبێت، کە بریتیە لە: "مانیفێستی بوغزێك کە ڕووبەڕووی (١٤٠٠)ی ئەو ناوچەیە و میللەتەکانی و شارستانیەتەکانی دەکرێتەوە ..... دەربڕینی ئەو بوغزەش لە مەنفای کوردیدا نووسراوە ...."

ئەو بوغزەی (ڕەفیق) لە ئیسلام لەناو حیزبی شیوعیدا هیچ سەدای نەبوو، بەڵام خەریکە لە نێو بەرەی - هەندەران و - دابڕان - وەك حەکایەتێکی پێشکەوتوو گوێی لێ دەگیرێ، چونکە زۆر غەریبی (نیادرتالبوون) دەکەن، بۆیە بە تاسەوەن، بۆ ڕەوانکردنەوەی کورد بۆ شاخەکان!

## سەرنجی سێیەم: غیابی تەفسیرێکی کوردانە بۆ ئیسلام:

نەبوونی تەفسێرێکی کوردانە بۆ ئیسلام، هەر ملی ڕەفیق صابر ناگرێتەوە، بەڵکو بە پلە یەك، یەخەی ڕۆناکبیری دینداری کورد دەگرێتەوە . بیرۆکەی فتوا بە کات و شوێن دەگۆڕێت، ناڕاستەوخۆ دەرگاکردنەوە لە سەر هارمۆنیبوونی پرانسیپەکانی ئیسلام دەگەڵ زۆربەی پرسە باوەکانی کۆمەڵگا لۆکالیەکان.

من لەوەدا لەگەڵ (فاروق) ناکۆکم، کە (ڕەفیق صابر) هەڵی تەفسیری کوردانەی بۆ ئیسلام لەدەستدا - (ل٣٠٢)، چونکە (د. ڕەفیق) لە هەردوو کتێبی : (بەرەو مێژوو) - و - (ئیمپراتۆریای لم) دەڵێت : خودی ئیسلام

نامۆیە بە کورد .

دەپرسم: ئەو باکگراوەندە چەپییە، چۆن دەتوانێ تەفسیرێکی کوردانە بۆ ئیسلام بکات ؟!

پاش بە سادە و سەردەم بە سەرچووی وتەکانی مارکسیەکان، دەربارەی ئیسلام لەوانە: قسەکەی مارکس، فا٠روق ڕەفیق بوێرانە لە (ل٣٠٣) دەنووسێت: ((ڕێنسانسی کوردی ئەو کاتە بەرکەماڵدەبێت، کە کورد تەفسیری خۆی هەبێت بۆ ئیسلام )).

ئایا ئەو قسە بەسەرچوانەی (رەفیق) و هاوشێوەکانی دەکەن، تەفسیرە؟، یا (فاروق) وتەنی: ئایا ڕەتکردنەوەی ئیسلام و شارستانێتی ئیسلام بە بەرگ و پلاسەوە تەفسیرە؟

فاروق رەفیق بەم چەند دێڕە، کۆتایی بە قسەکردن لە سەر (ئیمپراتۆریای لم) دەهێنێت : "بەداخەوە بوغز-بوغزی رەفیق لە ئیسلام - دەبێتە ڕێگر و ئەم هەلە - هەلی دروستبوونی تەفسیری کوردانە بۆ ئیسلام - لە بەین دەچێ، بەمەش ئەم کتێبە، جگە لە تۆمارکردنی بوغز، هیچ بەهایەك بۆ خۆی ناهێڵێتەوە." (فاروق ٢٠٠٦،ل٣٠٤).

٣- خوێندنەوەی ئێمە بۆ کتێبی: (ئیمپراتۆریای لم):

لە دوای ئەو دوو خوێندنەوەیە، خوێندنەوەی: موحەممەد یوسف و فاروق ڕەفیق، کتێبەکەی (ڕەفیق صابر) لە هەر بانگەشەیەك و ئارگومێنتێك خالی دەبێتەوە، کەواتە: وەك سیپارەکەی (واقدی) لێدێت .

خوێندنەوەی ئێمە سنوودار دەبێت، تەنیا بۆ پرسی (فتوحات) دەبێت لە کتێبەکەی رەفیق صابر، نەك تێکستی قورئان.

**ئێمە لەم نووسینەدا تێبینیەکانمان دەکەینە دوو جۆر :**

یەکەم: تێبینیەکانمان دەربارەی زانیاری ژێدەر .

دووەم: تێبینیەکانمان دەربارەی زانیاری فتوحات.

## یەکەم: تێبینیەکانمان دەربارەی زانیاری ژێدەر:

لەم کتێبەی نووسەریش، ئایدیۆلۆژیای چەپی ئامادەگی هەیە، وەك لە بەرەو مێژوو ئامادەگی هەبوو . لە نووسینی ئەکادیمی، سەرچاوەی پەیوەست بە تایتل و بابەتەکە بەکاردەهێنرێن، نەك سەرچاوەی دوور لە پرسەکە، بۆیە دەکرێ بێژین: ئەو دوو نووسینەی (ڕەفیق سابیر)، هزری و ئایدیۆلۆژین، نەك ئەکادیمی !

لە (ل٦١-٦٦) لیستی سەرچاوە و پەراوێزەکان، زۆر زۆر کەم سەرچاوەکان دەگەڵ تایتلی بەشەکە یەکدەگرنەوە . لە زۆر پەراوێزدا شوانانە لێدەخورێ، نەك وەك ئەکادیمێستێك، بۆ نموونە:

١- لە پەڕاوێزی -٦- ئاماژە بە (د.عەلی وەردی) دەکات لە ژێرەوە( پەراوێز) قسەیەکی (هادی العلوی) دەربارەی چەمکی پێغەمبەرایەتی دەنووسێ، دەبێ شیوعیەك ڕای دەربارەی ئەو چەمکە چی بێت ؟؟!
ئەو بە چاوی دیکارتی تەماشای زاتی خواش دەکات، چونکە باوەڕەکەی لە سەر ماتریالیزم دامەزراوە، نەك غەیبیانیەت.

٢- پەراوێزی (٧)سەیرم پێدێت، کە دەڵێت: وشەی کوشتن (١٧٤) جار لە قورئان بەکار هاتووە!! لە تێگەیشتن لە ئایەتی (١٧)ی (ئەنفال) دەردەکەوێت. (رەفیق) دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێت: ئەی ئیمانداران! نە ئێوە بەڵکو خودا - کافرانی - کوشت!! لە بەرانبەر ئەم تێگەیشتنە سەقەتە، تەنیا ئاماژە بە (ل١٧٩) ی (خولاصەی تەفسیری نامی) دەکەم: "ئێوە هێزی ئەوەتان نەبوو بیانکوژن و بە سەریاندا زاڵ ببن، ئێوە کەم و کەم چەك و ئەوان زۆر و پڕ چەك بوون، بەڵام خودا یارمەتی دان ....تا کافرەکانی بەزاند و کوشتنی و ئێوەی سەرخست."

٣- لە پرسی کوشتنی جولەکەی (بەنی قورەیزە) ...ئاماژە بە (هادی العلوی) دەکات!!

٤- لە پەراوێزی (١٧) بە قسەکەی (ئیبن خەلدون) دەکات، کە عەرەب بەدەوینە، ئەدی (ئیبن خەلدون) چۆن باسی کورد دەکات؟ ئەدی نالێت: کوردیش بەدەوی توند و پەرگیرِ و دڕندەن؟

کەواتە: جیاوازی نێوان عەرەب و کورد چییە؟

ئەوەندە هەیە، عەرەب بەدەوی ترن! مرۆی چۆل نشین، کەیفی بە عیمرانیەت نایەت، نەك شارستانیەت !

کەواتە: (ئیبن خەلدون) قسە لە سەر کۆچەری و عیمرانیەت دەکات، نەك شکاندنەوەی عەرەب .

زیاتر لە (١٤٠٠)ساڵ پێش تۆ، قورئان دەفەرموێ:

﴿ ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا ﴾التوبة: ٩٧

واتە: دەشتەکییەکان، گەر بێ بڕوابن، یان دووڕوویی بکەن، ئەوا کوفرو نیفاقەکەیان لەخەڵکی شار سەخت ترە.

٥- لە پەراوێزی (٢٠)دا، ئاماژە بە باج و سزای ئیسلامی دەکەی ....لە کۆتایی دەڵێی: بڕوانە کتێبێکی سوێدی.

٦- لە پەراوێزی (٢٤) دا، زمانی کوردی لە سەردەمی بنەماڵەی ئەییوبی (١١٧١-١٢٤٩) نەیتوانی لە میسر وسوریا و موسڵ و باکووری ئەفریقیا زمانی خۆی بسەپێنێت....، چونکە زۆربەی کورد خەڵکێکی دواکەوتووی نەخوێندەوار و خێڵەکی و پریمیتیڤ - بەرایی - دڕندەبوون...".

ئەوە ڕات بووە دەربارەی کورد، کوردە بۆرەش تۆی هەڵبژارد نوێنەری بیت !!! لەو سەردەمدا - سەدەی (١٢ و ١٣) تازە، (دانتی) لە ئیتالیا داوای دەکرد (ئیتاڵی) لە تەنیشت (لاتینی) بێت.

ئینجیل تەرجەمەی ئینگلیزی و ئەڵمانی نەکرابوو دەتەوێ، نەتەوەیەکی لە ژمارە کەم بەرانبەر عەرەب و تورك و فارس زمانی خۆی لە باکووری ئەفریقیا بسەپێنێت! تۆ بۆ دێی نەقدی بنەماڵەی ئەییوبی دەکەی، ئەدی بۆ نەقدی شەرەفخانی بەدلیسی ناکەی، لە سەدەی (١٦) نزیکەی (٤) سەدە دوای ئەوان (شەرەفنامە)ی بە فارسی نووسی؟ تۆ نەك نەقدی ناکەی، بەڵکو لە (ل٧)ی کتێبەکەت: سڵاو لە شەرەفخانی بەدلیسی دەکەی!

دکتۆرەك ئەوەندەی ئیبن خەلەکانی سەدەی (١٣) کەمکردبوو بە تۆزی بن پێی شەرەفخانی چواند بوو، لێرەدا تەنها دوو تێبینی دەدەم :

أ- گەر ئیبن خەلەکان لە سەدەی (١٣)،(وفیات اعیان)ی بە عەرەبی نووسی بێت، شەرەفخان لە سەدەی (١٦)،(شەرەفنامەی) بە فارسی نووسیوە.

ب- لە (شەرەفنامە) ناوی زۆر میری کورد هاتووە، بنەچەی خۆی بردۆتەوە سەر عەرەب،کەچی (ئیبن خەلەکان) لە هەردوو کتێبەکەیدا، باسی رۆڵی سیاسی و شارستانی کورد دەکات - بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە ماستەرنامەی حسێن شاکر کە (٣٤٤) لاپەڕەیە لە بڵاوکراوەکانی دەزگای (نارین) (٢٠١٥)یە.

٧- لە پەراوێزی (٢٧)دا، خۆت گومان دەخەیە سەر کارەکتەری مەعریفی خۆت، براله! تۆ چەپی، چۆن دێی شرۆڤەی ئایەتی قورئان دەکەی؟!

ئەوە کارەساتی مێژوویی نییە، کە خاوەن شەهادەیەك (اولوأمر) تەنیا بە سەرکردەی سەربازی تێبگات؟

مامۆستا (مودەریس) لە (ل٨٧) دا دەربارەی تەفسیری ئایەتی (٥٩) ی (النساء) دەنووسێت: "ئەی ئەوانەی ئیمانتان هەیە! بە گوێی ئەمرەکانی خودا و پەیامی پێغەمبەر.... بکەن هەروەها بە گوێی ئەوانە بکەن، کە کاروباری موسڵمانان ئەبەن بەڕێوە. مەبەستی سەرکردەی موسڵمانانە، چ لە سەردەمی حەزرەتدا - صلی الله علیه وسلم .- و چ دوای ئەو خولەفای راشیدین و قازی و سەرکردەکانی سوپای ئیسلامیش ئەگرێتەوە ."

## دووەم:تێبینیەکانمان دەربارەی زانیاری فتوحات:

لێرەوە دێمەوە سەر ئەو لاپەڕانەی پەیوەستن بە بابەتی (فتوحات) لە کتێبەکەمەوە، کە تەنیا چەند لاپەڕێکن .

دکتۆر لە (ل٥٦)دا خێڵەکانی دوورگەی عەرەب، کێشە ناوخۆییەکانیان وەلا ناوە و بەرەو دەرەوەی بیابانی عەرەبی گواستۆتەوە.تاڵان بەشێکی ئامانجی ئەو پێکهێناوە، وەك دەنووسێت: ئیتر ئەم خێڵانە شەڕ و ناکۆکیی نێوخۆیان گۆڕیوە

بە شەڕ و ناکۆکی دژی گەلانی تر." ئەو شەڕ و ناکۆکیانە هەر لە خۆوە گۆڕاون؟ ئەو ماوەی (٢٣)ساڵ پێغەمبەرایەتی، گۆڕانێکی نەوعی لە بیرەوەری تاکی عەرەبی شار دروستبوو، هەموو کتێبەکانی (سیرە) جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە، کە یەکەم کاری لە بواری کۆمەڵایەتی پێغەمبەر، ئاشتکردنەوەی قەبیلەی (ئەوس و خەزرەج) بوو، پێغەمبەر (٢٧)غەزوەی تەمبێکردنی کردە سەر کۆچەری عەرەب، تا لە بەداوەت ڕزگاریان ببێت.

بەمجۆرە، لە دوای وەفاتی پێغەمبەر، قەبیلە بووە ئوممەیەکی ئیمانی نەك ئەتنیکی.

کەواتە ئەو لەشکرەی هاتە کوردستان هەڵگری پەیامی (ئوممە) بوو، نەك قەبیلە، بۆیە ئەوها تەبابوون .ئەو تەبابوونە ئیمانیە، بە قسەی چەندان نووسەری بیانی، ئەصڵی بردنەوەی جەنگ بوو.

هەر لە هەمان لاپەڕەدا، دکتۆر، شینو ڕۆڕۆ بۆ ڕوخاندنی هەردوو داگیرکەری (ساسانی) و (بێزەنتی) دەکات و دەنووسێت: پێکەوە بە شەڕ و پەلاماردان دەستیان بە سەر ناوەندە شارستانییەکاندا گرتووە و تاڵان و وێرانیان کردوون..."

یەکێ لە ئەدگارەکانی قسەی بن دیوار، قسەی بێ بەڵگەیی( ئارگومێنتییە).

سەرچاوەکانی وەك: (طبری و ئیبن ئەسیر و بلازری...) باس لەوە دەکەن، کە لە تەواوی کوردستانی بندەستی ساسانیدا، شەڕی قورس لە ( جەلەولا ) و ( نەهاوەند) کراوە، ئەویش ساسانی دەستپێشخەری جەنگ بوون، بەتایبەتی لە شەڕی (جەلەولا)دا (یەزگورد) خۆی لە (حلوان) سەرپەرشتی شەڕی دەکرد. لە نێو دەوڵەتی ساسانی جۆرە گەندەڵیەکی ماددی هەبوو، کە بنەماڵەی شا و فەرماندەکان دەستیان بە سەر قوتی خەڵك داگرتبوو، سامانی تەنیا (یەزگورد) لە (مەدائین) و (جەلەولا)، بەشی زۆربەی سوپای ئیسلامی دەکرد، ئەو موڵك و سامانەی (یەزگورد)، بەپێی سورەتی (ئەنفال) دابەشکرا .

لێرەدا لە دکتۆر دەپرسم: ئەو "ناوەندە شارستانیەی ساسانی" لە لوتکەی گەندەڵی دانەبوو، هەربۆیەش هەرەسی نەهێنا؟ لە کوردستانی بندەستی ڕۆمیش بە شاهێدی مێژوونووسەکانی بەری، هەموو بە سووکە شەڕ و صوڵح و ئاشتی

فەتح کران.

وەك دەق، قورئان و فەرمودە، تەواوی تالآن ڕەد دەکەنەوە، هەروەها خۆی لە لاپەڕەکانی پێشووی (ئیمپراتۆریای لم) دا ئاماژە بەوە دەکات، کە خێڵەکان هاتنە سەر حازری.

داوا لە دکتۆر دەکەم، تەنیا یەك نموونە بهێنێتەوە، کە سوپای ئیسلام وەك ئاشوورییەکان، یا وەك هەر دڕندەیەکی تر، خانووی کەسی سوتاندبێ و منداڵ و ژن و پیرەمێردی کوردی کوشت بێ؟؟

وێرانکردن و سوتماککردنی شوێن، تەنیا کاری شیوعییەکانی: (چین و ڕووسیا و هەنگاریا...) بوو، نەك لەشکری ئیسلام!

لە (ل٥٧) دەڵێت: فەوزی مەنسوور، لەو باوەڕەدایە، کە (عومەر) لە فتوحاتدا، پڕۆژەکەی ئەوە بووە، کە بەو داهاتەی بە هۆی موڵکانەی وڵاتانی فەتحکراوەوە بەدەست دەهێندرێت، کۆمەڵێکی عەرەبی ئیسلامی، لە دوورگەی عەرەبدا، دابمەزرێنێت، بێ ئەوەی لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئیداری و ئاینییەوە، دەستکاریی جەوهەری ڕێکخستنی ئەم وڵاتانە بکرێت . "

کێشەی ئەم برادەرە چەپانە ئەوەیە: تەنیا ئەو ژێدەرانە دەخوێننەوە، کە دژە ئیسلامن، هەتا ئەوەی پێشوەخت پلان و پیلانیان بۆ کردووە، بیننەدی !

(جزیە) و دەستکەوتی شەڕ، بەشێك نەبوونە لە ئامانجی فتوحات، ئەگەرنا، چۆن هەندێ قەبیلەی عەرەب، دوای وەفاتی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) ئامادە نەببون زەکات بە دەوڵەتی (ئەبوبەکر) بدەن، گەر بە قسەی (ڕەفیق) بوایە، دەبوو پاش ڕووخانی خیلافەتی عەبباسی لە موسڵمانبوون پەشیمان بونایە.

موحەممەد یوسف لە (ئەبی یوسف) و (بەلازری) دەگوازێتەوە، کە ئەو دەستکەوتەی شەڕ لە " موچەی کاربەدەستانی دەوڵەت لە: (سەرباز و فەرمانبەر و والیەکان و قازیەکان و زاناکان و پرۆسەی ئازادکردنی کۆیلە و ڕێ و بان و پرد و زەوی) خەرج کراوە - ل٢٤" ئەوانەش بۆ هەموو بەشەکانی قەڵەمڕەوی ئیسلام بووە.

تۆ و کاك (مەنسوور)، گەر جلوبەرگی (عومەر)تان بینیبایە، شەرمتان لە قسەکانی خۆتان دەکرد.

دکتۆر لە (ل٥٨)دا دەیەوێ لە سەرچاوەی نوێوە بە چەمکی (خەراج)مان ئاشنا بکات، بۆیە دەنووسێت: (سەمیر ئەمین)، ئەم شێوازە زاڵەی بەرهەمهێنان-ی ئابووری بە ئابووریی خەراج، یان شێوازی خەراج ناودەبات .

(محەممەد عابد جابری) ناوی شێوازی بەرهەمهێنانی پەلاماردان - الغزو - ی لێدەنێت." ئەو کتێبەی سەمیر ئەمین لە ساڵی (١٩٩٦) بڵاوکراوتەوە، (طبری) و (بلازری) و(ئەبی یوسف) بەچەندان سەدە پێش (سەمیر)، باسی خەراج و ئابووری خەراجیان کردووە، بەڵام (ڕەفیق) دوور و نزیك بەلای ئەو ژێدەرانە نەچووە.

هەروەها کەناوی (محەممەد عابد جابری) دەهێنێت، بەهیچ کلۆجێك ئاماژە بەناوی کتێبەکە ناکات، چونکە موحەممەد یوسف، باوەڕی وایە، کە دکتۆر رەفیق، ڕایەکانی (جابری) دزیوە و بە چەپی کردووە!

## چوارەم: کتێبی لاوەکی فتوحات:

زۆر کتێبی لاوەکی دەربارەی (فتوحات) نووسراون، یا تەنها بە ئاماژە باسی فتوحاتیان کردووە، لەوانە: کتێبی، " کورد و عەجەم"، کتێبێکی نەوشێروان مستەفایە(ل١٤-١٥) ... لەو هەموو کتێبە لاوەکیە، تەنها دوو کتێبمان هەڵبژاردووە، چونکە هەموو، هەمان چیرۆك دووبارە دەکەنەوە.

**ئەم دوو کتێبەش تەنیا لە چەند لاپەڕەیەکی کەمدا لە سەر پرۆسەی (فتوحات)، بە تایبەتی فەتحی ناوچە کوردییەکان دەکەن :**

### یەکەم: بەعەرەبکردنی کوردستان:

ئەم کتێبە لە نووسینی غەفور مەخموری-ە. لە ساڵی (٢٠٠٢) لە هەولێر بڵاوکراوەتەوە. عبداللە قرگەیی لە ساڵی (٢٠٠٦) تەرجەمەی عەرەبی کردووە.

ئەم کتێبە (٢٤٨) لاپەڕەیە، تەنیا لاپەڕە (١١-٣٣) ی پچڕ پچڕ باسی فەتحی ناوچە کوردییەکان دەکات .

لە (ل١١) لە ژێر ناونیشانی: (هاتنی عەرەب بۆ کوردستان)، شتێکی ڕەها دەڵێت: "زۆربەی زۆری سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە تا پێشهاتنی ئیسلام بۆ ناوچەکە (واتە کاتی فتوحاتی ئیسلامی)، عەرەب لە ناوچەکەدا بوونی نەبووە و، ڕووباری (فرات) سنووری نێوان کورد و عەرەب بووە، عەرەب لەو بەرەی (فرات)ەوە بوونیان نەبووە.."

جاریّ بەر لە هەموو شتێك، ئاماژەی بە هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی نەکردووە. لە پەراوێز، ئاماژەی بە کتێبێکی (جەزا تۆفیق) کردووە، کە لە بەینی ئەو و فتوحاتی ئیسلامی زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ هەیە. چەندان سەرچاوەی وەك: (طبری و ئیبن حەوقەل و کریستینسن و شەمسانی...) باسی پەیوەندی عەرەب بە پاشای ساسانی و بوونی عەرەب لە خاکی کورد، وەك: (ئامەد و جزیرە و نەصیبین و ماردین) دەکەن.

لە (ل١٧٧-١٧٨) ی کتێبی (جەزا تۆفیق) دەگوازێتەوە، کە "هەڵکشانی عەرەب بۆ سەر عێراق، لە سەردەمی فەتحی ئیسلامیدا لە سەدەی حەوتەمی زایینیدا گەورەترین ڕووداوە سەبارەت بە پێکهاتەی ڕەگەزی دانیشتوانی عیراق."

چەمکی (عێراق)، مەبەست لێی عێراقی ئێستایە، ئەو ناوچەیەش، ناوچەی دەسەڵاتی ساسانی بووە، لەگەڵ هەردوو بەشی عێراقی عەجەمی و ئەقلیم جیبال، هاتنی چەند خێزانێکی عەرەبی، زۆربەی ئەو ماڵباتانە لە نێو کۆمەڵگای کوردەواری تواونەتەوە و بوونەتە کورد.

پێش هاتنی ئیسلام، فارس و یۆنانی و ئەشکانی و ساسانی بۆ ماوەی (١٣٠٠) کوردستانیان داگیرکرد، بۆیە فارس و ئەشکانی لە ناوچەی عیراقی عەجەمی و ئەقلیم جیبال، زۆر پێش ئیسلام و دوای ئیسلام، لەو دوو شوێنە مانەوە - بڕوانە: (یەعقوبی ل٣٦٩)، نیشتمان، (ل٨٠)، ئەحمەد میرزا، (ل٣٥-٣٦) و (ل٧٥) .

ئەو فارس و ئەشکانیانە، داگیرکەر بوون، عەرەبەکانی دوای فتوحاتیش

لە نێو کۆمەڵگای کوردەواری توانەوە... جا بە هەموو لۆژیکێك، بوونی فارس لە هەردوو بەشی کوردستانی ساسانی، یا عەرەب لە عێراقی عەرەبی " گەورەترین ڕووداوە سەبارەت بە پێکهاتەی ڕەگەزی دانیشتوانی عیراق"؟

هەر لەو لاپەڕەیەدا، بەبێ هەبوونی هیچ سەرچاوەیەك، هەتا نوێکانیش دەنووسێت: "لە پێناو موسڵ ...کورد بۆ بەرگریکردن لە خۆی و خاکی، ڕووبەڕووی هێرشەکان وەستاوەتەوە، ( عمر بن جند)یش لەم هێرشانەدا کوژراوە و دوای ئەو، خالیدی کوڕی وەلید هێرشی هێناوە..."

موسڵ بە گوێرەی (ل٣٦٩)ی ئیبن ئەسیر و (ل١٩٩)ی بەلازری ساڵی (٢٠ك)، نەوەك (١٦ك) فەتح کراوە . ئیبن ئەسیر لە (ل٣٦٨-٣٦٩ )باس لەوە دەکات، کە قەڵای ڕۆژهەڵاتی پێدەوترێت: (نەینەوا)، هەرچی قەڵای ڕۆژئاوایە، (موسڵ)ە. (نەینەوا) بە خوڕتی و (موسڵ) بە صولح فەتحکرا.
طبری لە، ئیبن ئەسیر لە (ل٣٦٨) و بەلازری لە (ل١٩٩) باس لە فەرماندەی موسڵ دەکات، کە (عوتبە) بووە نەك (عمرو بن جند). زیاتر بەلازری لە (ل١٩٩)دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب، (عوتبە)ی لادا و (هەرسمە بن عەرفجە بارقی) داناوە."

ڕۆژبەیانی لە (ل٢٨-١٩)دا گرتنی موسڵ بە فەرماندەیی (عتبە بن فرقد) بووە، خالیدی کوڕی وەلیدیش نەگەیوەتە کوردستان.
تەنیا لە یەك لاپەڕەدا، ئەو هەموو هەڵە مێژووییە کراوە!!

لە (ل١٢) غەفور مەخموری، ئەحمەد شەریف (ل٢٦)، ڕەفیق سابیر، لە هەردوو کتێبی: (بەرەو مێژوو) و (ئیمپراتۆریای لم) وتەکەی (ئیبن خەلدون) دەهێننەوە.

وتەکەی (ئیبن خەلدون) بۆ جیاکردنەوەی کۆچەری و عیمرانیەت دەکات، هەروەها لە لاپەڕەی دی، باس لەوە دەکات، کە ئەو عەرەبەی وازی لە دین هێنا، بۆتە دڕندە.

**لە (ل ١٢)، بەبێ هەبوونی هیچ سەرچاوەیەك، سێ شتی زۆر سەیر دەڵێت :**

١- هاتنی سوپای عەرەب بۆ کوردستان و، تاڵانکردنی ماڵ و سامانی کورد و وێرانکردنی وڵاتەکەی، لێکەوتەوە.
٢- کورد لەو سەردەمەدا بە کۆمەڵێ ڕاپەرین و هێرش ڕابووە.
٣- ئیسلام لە ساڵی (١٨ك) گەیشتە کوردستان .

ئەو بەیتوبالۆرە، تەنیا لای ڕۆژهەڵاتناس و کوردەکانی دژی (فتوحات) هەیە، ئەگەرنا، چەندان کتێبی: (طبری و ئیبن ئەسیر و بەلازری) باس لەوە دەکەن، کە زۆربەی کوردستانی ڕۆمی و، بەشێك لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان (کوردستانی ساسانی ) بە صوڵح فەتحکراون، لەو شوێنانەی شەڕیش قەوماوە، ئەوە لە نێوان لەشکری ئیسلام و لەشکری ساسانی بووە، نەك کورد.

کورد لە ماوەی عومەری خەتاب (١٣-٢٤ ك)دا، هیچ ڕاپەڕین و هێرش دژی لەشکری ئیسلام ڕانەبووە - سەیری (طبری و ئیبن ئەسیر و بەلازری) بکە.

هەموو کتێبە مێژووییەکان و کتێبە کوردیەکانی وەك: (شوان عوسمان و ڕەحیم و زرار صدیق) کە هەموو دژ بە فتوحات نووسراون، بەڵام دەڵێن: ئیسلام لە ساڵی (١٦ك) گەیشتە کوردستان بە تایبەتی لە شەڕی (جەلەولا) !!

لاپەڕەکانی تر، تایبەتن بە دوای سەردەمی پێغەمبەر و هەر چوار خەلیفە.

## دووەم: ئەنفال لە ڕۆمانی کوردیدا.

(ئەنفال) لە ڕۆمانی کوردیدا، لە بنەڕەتدا دکتۆرانامەبوو، لە زانکۆی کۆیە تاوتوێکرا. لە ساڵی (٢٠١٠) وەك کتێب بڵاوکرایەوە. کتێبەکە (٢٠٠) لاپەڕەیە و لە (ل٢٣-٢٦) و لاپەرەی دی، باسی فتوحاتی ئیسلامی دەکات.

لەو سێ لاپەڕەدا بە چاوی - الشخصية المحمدية - باس لە مێژووی ئیسلام دەکات. ناوی دروستی کتێبەکە بریتیە لە: (كتاب الشخصية المحمدية او اللغز المقدس) نووسینی: (معروف الرصافی)، (٧٦٦) لاپەڕەیە. کتێبەکە

تەواو جێی گومانە، بۆ نموونە: (الرصافی) لە (١٩٤٥) مردووە، کەچی لە لیستی سەرچاوەکاندا، ساڵ لە هەموو سەرچاوەکاندا سڕایەتەوە، تەنیا دوو سەرچاوە نەبێت، یەکیان هی ساڵی (١٩٦٦) بە واتای (٢١) ساڵ دوای مردنی (ڕەصافی) چاپکراوە!

**دکتۆر ئەحمەد لە (ل ٢٣) بەپێی پەراوێزەکە دەیەوێ بە خوێنەر بڵێت، کە لە (ل٢٦٣) ی کتێبەکەی (الرصافی)م وەرگرتووە . بۆ نموونە:**

١- لای د.ئەحمەد شەریف، فتوحات لە ساڵی (١٦ك) بوو - کەچی لای (رصافی) (٦١ك) بووە.

٢- لای د. ئەحمەد، (عمر) بە گۆچەکانەکەی پەردەی لە سەر ڕووی کچەکانی (یەزگورد) هەڵدایەوە!!

لای (رصافی) : (أمر المنادي أن ينادى عليهن و ان يزيل نقابهن!!! واتە: بە خۆی نەیکردووە!

٣- لای د.ئەحمەد، (یەزگورد) دوو کچی دیلی موسڵمان بووە !

- لای (رصافی) سێ کچی دیلی موسڵمان بووە.

٤- لای د.ئەحمەد، (عەلی)، کچی یەکەمی بۆ (حوسێن) برد، هی دووەمیش پێشکەشی (محەممەدی کوڕی ئەبوبکری) کرد!

لای (رصافی)، یەکەمی بۆ (عبدالله ی کوڕی عمر) کڕی، دووەم، بۆ (محەممەدی کوڕی ئەبوبەکر)، سێیەم بۆ (حوسێنی کوڕی عەلی).

٥- لای د.ئەحمەد، ئێرانیەکان، (عەلی)یان خۆش بوێت و دوژمنی سەرسەختی عومەری کوڕی خەتاب بن.

لای (رصافی)، نەك لەو لاپەڕەیە، بەڵکو لە لاپەڕەی دوای ئەوەش، قسەی وا نیە!

ئەوە مانای ئەوە نییە، پەسندی قسەکەی (رصافی) بکەین، بەڵام ئەوە دکتۆر ئەحمەدە دەڵێت: ئەو زانیاریانەم لە (رصافی) وەرگرتووە، کەچی لە کتێبەکەی (رصافی) پێچەوانەی قسەکانی ئەو هاتووە!

لە (ل٢٤) زانیاریەك لە کتێبەکەی غەفور مەخموری دەگوازێتەوە، بێئەوەی ئاماژەی پێبکات، لە (ل٢٦)، کتێبەکەی خۆی ئیسپات دەکا، کە ئەو کتێبەی (غەفور)ی کردۆتە سەرچاوە! زانیاریەکەی مەخموری و د.ئەحمەد، لەبەردەم سەرچاوەی مێژوویی، خۆیان ڕاناگرن ! لە کاتی قسەکردن لە سەر کتێبەکەی: (مەخموری و ڕۆژبەیانی) وەڵامی ئەو زانیاریانەم داوەتەوە.

لە (ل٢٥) دەڵێت: " کورد دینەکەی خۆی (ز: زەردەشتیەت) لە دەست دا و دنیاشی لە دەست دا بە هۆی شالاوەکانی عەرەب...."،

من خودی خۆم، پشت ئەستوور بە ئایەتی قورئانی، لەوانەیە (زەردەشت) ئەو پێغەمبەرەی (قەوم )ە بێت، کە ئایەتەکانی قورئان ئاماژەی پێدەکەن، لەوانە: ئایەتی (٤)ی سورەتی (ئیبراهیم).

کورد لە سەردەمی فتوحات دا، (زەردەشتی، مەزدەکی، جولەکەیی، مەسیحی ) بوو. ئەو شوناسە چەند دینیە، زۆر زەق بوو، لەکوردستانی ساسانی، سەردەمانێك، کورد نەدەبوو بە ئاشکرا، (مەزدەکی ) و (جولەکەیی ) و (مەسیحی ) بن، گەر ئاشکرابان، تیرۆر دەکران، یا باش ئازار دەدران، تا بگەڕێنەوە سەر زەردەشتیەتی دەسەڵات، چونکە زەردەشتیەتی نوێ، ئایینی ڕەسمی ساسانی بوو. لە کوردستانی بن دەستی (ڕۆمی )دا، کورد، مەسیحی بوون، دەوڵەتی ڕۆمی بە ئاشکرا نەیدەهێشت، کورد زەردەشتی بێ!

سەبارەت بە داگیرکردنی وڵات و کەسێتی کورد، (١٣٠٠) ساڵ بوو داگیرکرا بوو، بۆیە لای (ئیبن ئەسیر)کورد، کۆچەری فارس بوون، جەمال ڕەشید لە کتێبی: (دراسات كردية في بلاد سوبارتو) ئاماژە بەو قسەیەی (ئیبن ئەسیر) دەکات .

کەواتە کورد بە هۆی ئیسلامەوە شوناسی پەیداکردەوە، وەرگێڕانی کتێبەکەی (ئەردەشێر) لای (بەلازری)، ئیسپاتی ئەوە دەکەن، کە ناوی ( کورد ) لەگەڵ گەیشتنی پەیامی ئیسلام دروست بوو. هەروەها کوردستانیش تەنیا لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامی بۆوە یەك پارچە!

کەواتە بە هاتنی ئیسلام دووبارە شوناسی پەیداکردەوە.

سەیرم بەوە دێت لە (ل٢٥) دا دەنووسێت: "هەر لەو سەردەمەدا هەرچی پەرستگا و قوتابخانە و پەرتووك و بەڵگەنامەی ئایینی و ئەدەبی و ڕۆشنبیری و کەلتووری کوردی هەبوو هەمووی سووتێنران.."

لە کردنی ئەو قسانە دا، دەقی (هورموزگان)ی دکتۆر سەعیدی کوردستانی (سنەیی)، دەکاتە پاڵپشت. ڕەوشی ئەو هەموو مەسیحیەی کورد و غەیرە کورد لە: (هەکاری،دیانە، ورمێ، ڕەها...) سەرلەبەری ئەو قسانە ڕەتدەکەنەوە.

لە لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا، ئاماژەم بە هەندێ دەق کردووە، کە جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە: ئیسلام، نەك کەنیسەی نەڕووخاندووە، بەڵکو کەنیسەی لە زۆر شوێن نۆژەن کردۆتەوە، ئەو کەنیسانەش پەرستگای مەسیحی کورد و غەیرە کورد بوونە.

دکتۆر لە (ل٢٦) غەدرێکی گەورە لە تاك و مێژووی کورد دەکات، دەنووسێت: دەقی (هورمزگان) لای هەندێ ڕۆشنبیر، جێگای گومانە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەگەڵ عەقڵ و لۆجیك دەگونجێ، بۆیە بە نموونە هێناومەتەوە." فتوحاتی ئیسلامی بە: (ئەنفالی یەکەم) دادەنێت.

سەبارەت بە بەشی یەکەمی بۆچوونەکە دەربارەی دەقی (هورمزگان)، ئەوەندە نا - لۆجیکییە، لەگەڵ زمانەوانی و ئیتیمۆلۆژی وشە تێکدەکاتەوە، چونکە وشەکانی دەقەکە، بە هیچ شێوەیەك دەگەڵ پرۆسەی گۆڕانی زمان تێکناکاتەوە، ئەو دەقە ساختەیە، هەر دەڵێی لە سەدەی (نۆزدە) و (بیست) نووسراوە، نەك سەدەی (حەوت)! نەلەگەڵ مێژووش تێکناکاتەوە، چونکە وشەی وەك: "شارەزور" ئەوسا هەر نەبو، بەڵکو "نیمڕاە" هەبووە، نە لەگەڵ (ئاهورامەزدا)ی زەردەشتی تێکدەکاتەوە.

دەپرسین: (ئاهورامەزدا)، چ خوایەکە، کە (ئاهورامزدا) بەزەیی بە هیچ کەسێکا نایەتەوە" کەچی "یەهوە"ی خوداوەندی جولەکە، لە سەر تاکی جولەکە کوشتنی غەیرە جولەکە بە حەلال دەزانێت!!!

**پێنجەم: کورد و کوردستان - زرار صدیق:**

پێگیرم بە مێژووی دەرچوونی کتێبەکان کرد، ئەگەرنا، دەبوو ئەم کتێبەی پرۆفیسۆر دکتۆر زرار، لە پێش دوو کتێبەکەی سەرەوە بوایە، چونکە کتێبەکەی ئەو، بە تەواوی لە سەر مێژووی فتوحاتی ئیسلامیە!

لە ساڵی (٢٠١٠) دا دکتۆر زرار صدیق، چاپی یەکەمی کتێبێکی بە ناوی: "کورد و کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا (١٦-٦٥٦ ك/٦٣٧-١٢٥٨ز)" بڵاوکردەوە.

ئەوەی پەیوەندی بە کتێبەکەی ئێمەوە هەیە (ل٩-٤٩) یە. دکتۆر زرار، هەر لە لاپەڕە بەراییەکاندا، وشەی (داگیرکردن) لە بریتی فەتحی ئیسلامی بەکاردەهێنێت. هەژار موکریانی لە (ل٢٨٤)ی فەرهەنگی (هەنبانەبۆرینە) دەربارەی "داگیرکردن " دەنووسێت: بە زۆر سەندن." پرۆسەی بە زۆر سەندن، وەك ئیسفەنج وایە، کە گوشاری لە سەر نەما، دێتەوە سەر سروشتی خۆی.

سیستەمی خیلافەی عەبباسی لە ساڵی (١٢٥٨) میلادی نەما. گەر (فتوحات) داگیرکردن بوایە، دەبوو کورد لەو ساڵەوە پشت لە ئیسلام بکات! ئەوە بووە (٢٠١٦) کورد لە ئیسلام جیانەبۆوە، لەو ڕوانگەوە، پرسی "داگیرکردن" لە فتوحاتی ئیسلامی تەواو هەڵدەوەشێتەوە

لە (ل٩)ی کتێبەکەدا، بەبێ ئاماژەکردن بە هیچ سەرچاوەیەك، یەکەم پەرەگرافی پڕ کێماسی کتێبەکەی دەستپێدەکات: کوردستان لە بەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا: ئەو دەمەی ئاینی ئیسلام دەرکەوت و پرۆسەی فەتحی ئیسلامی دەستیپێکرد، زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بەشێك بوو لە دەوڵەتی ساسانی و، ناوچە شاخەویەکانی کوردستان هەر لە لایەن دانیشتوانەکەیەوە بەڕێوە دەبرا، لە فەتحکردنی: (شارەزور و گەرمیان و هەولێر و قەڵاکانی ڕۆژهەڵاتی موصڵ) تەنها باسی بەرگریی کورد کراوە و ئاماژە بە سوپای ساسانی نەدراوە.

لە سەردەمی فتوحاتدا، وڵاتی پێنج ناوچەی جودا بوو، سێ بەشی عیراقی عەجەم و ئەقلیم جیبال و ئەقلیمی جەزیرە، لە دەست دەوڵەتی ساسانی دابوو،

هەرچی زۆربەی باکوور و ڕۆژئاوا یە، لە دەست ڕۆم دابوو.

لێرەدا دەپرسم: لە ڕووی جیۆگرافیەوە، زۆربەی وڵاتی کورد لە ژێر دەستی ڕۆم دابوو، یا ساسانی؟

هیچ ژێدەرێکی متمانەپێکراو ئاماژەش بەوە ناکات، کە ئەو ناوچە شاخاویانە بە دەست کورد بەڕێوەبردرا بێت، تەنیا کوردی ڕەوەند و کۆچەر نەبێت، ئەوانیش وڵاتیان دیار نییە . نازانم گەر جەردەوانی باکوور و بەسیجی ڕۆژهەڵات و جاشی باشوور ناوچەکانیان بەڕێوە ببەن، خۆیان سەربەخۆن؟؟!

سەیرم بەوە دێت! دکتۆر زرار قسەی وا دەکات، گوایە: کورد بەرگری لە شارەزور و گەرمیان ...کردبێ و سوپای ساسانی لەو شوێنانە نەبووبێت!

دکتۆرا تۆ چاك دەزانی، وڵاتی کورد لە (٥٤٩ پ.م) لە لایەن: (فارس و یۆنانی و ئەشکانی) داگیرکراوە، نازانم چ سەرچاوەیەك باس لەوە دەکات: کورد بەرگری لەو شارانە: (جەلەولا و شارەبان ....گەرمیان)کردووە؟، بابزانین سێ سەرچاوەی وەك: (طبری و ئیبن کەسیر، مەحموود شاکر) چۆن باسی شارەکانی گەرمیان دەکەن؟

طبری لە (ل٤٣٢)ی بەرگی (٣) : ((ان الاعاجم لما انتهوا بعد الهرب من المدائن الى جلولاء، و افترقت الطرق باهل اذربايجان و الباب و باهل الجبال و فارس....))

(ابن كثير) لە (ل٥٢) ی (البداية و النهاية) دەنووسێت : ((و جم غفير من الفرس .... (ل٥٣) كان الذي اصاب كل فارس يوم جلولاء نظير ما حصل له يوم المدائن...))

مەحموود شاکر لە (ل١٧٣) بەرگی (٣-٤) دەنووسێت: "فر يزدجر من المدائن، و سار باتجاه حلوان، و التف حوله اثناء سيرة كثير من الفرس... و قد قتلوا من الفرس الكثير...

هەر لە هەمان لاپەڕە دەنووسێ: ((لە سەردەمی دووهەم خەلیفەی ڕاشدی ....سنووری نیمچە دورگەی عەرەبیان بەزاند..". (بەلازری) و زۆر سەرچاوەی

تر ئاماژە بەوە دەکەن، کە هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا، سوپای ئیسلام تەیارکراوە بۆ دەرەوەی نیمچە دورگەی عەرەب، بۆ وەڵامدانەوەی هەڕەشەکانی ڕۆم، هەروەها لە سەردەمی خەلیفە ئەبوبەکر شەڕی یەکەمی (یەرموك) و (ئەجنادەین) کراوە..سەیری بەرگی (٣)، (ل ٢١٨) طبری بکە .

لە هەمان لاپەڕە دا دەنووسێت: " لە تەوەرەی عیراقەوە گەیشتنە کوردستان." تەماشای (ل٢٦٣-٢٦٤) ی (طبری) بکە. سوپاکەی ئەبوبەکر ، پاشان عومەر، لە دوو سەرەوە لە هەمان کاتدا شەڕی سوپای ساسانی و ڕۆمیان دەکرد، هەر لە سەردەمی خەلیفە عومەر، نزیکەی تەواوی ڕۆژئاوا و باکووری کوردستانیان ڕزگار کرد .

دکتۆر زرار هەر لە پەڕەگرافی خوارتر، خۆی قسەکانی خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە و دەنووسێت: "زانیاری بەردەست دەربارەی پرۆسەی فەتحکردنی شار و دەڤەرە کوردنشینەکان ناتەواوە ، لە چەند کورتە هەواڵێك تێپەڕ ناکات ...".

گەر زانیاریەکان ئەوها ناتەواون، ئەدی لە کوێت زانی، تەنیا کورد، نەك ساسانی بەرگری لە شەهرەزور و هەولێر...کردووە؟؟!

لە کۆتایی (ل٩) و سەرەتای (ل١٠) دەڵێت: (المدائنی) لە (٢٢٥) ی کۆچی مردووە، بەلازریش لە (٢٧٩) ی کۆچی مردووە، واتە (٥٤) ساڵ دوای (المدائنی) مردووە، چۆن، (بەلازری) شاگردی (المدائنی) بووە؟

هەژار موکریانی لە (ل٤٦٥) دا دەڵێت: "شاگرد: بەردەستی وەستا." بەڵام ماجد مەردۆخی لە (ل٨٥٦) فەرهەنگی (فارسی - کوردی) دەنووسێت: "شاگرد :قوتابی، بەردەست، کرێکاری نێو دکان."

زۆربەی سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن: (بلازری) لە سەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچی لە دایك بووە، ئەوسا (مەدائنی) تەمەنی زیاتر لە (٦٥) ساڵ بووە، بە واتای: کە (مەدائنی) لە تەمەنی (٩٠) ساڵی مردووە، (بەلازری) تەمەنی (٢٥) ساڵێك بووە، ئەو تەمەنە بۆ (بەلازری) تەمەنی هەڕەتی لاوی - ە، نەك شاگردیی؟؟!

لە کۆتایی لاپەڕە (١٠) و سەرەتای (١١) دەنووسێت : لە شەڕەکانی (قادسیە) و (المدائن) و کوژرانی (ڕۆستەم)ی سەرلەشکریان لە ساڵی (١٦)ی کۆچی، شکستی هێنا، پاشماوەی لەشکری ساسانی پاشەکشێیکرد و، بۆ پشودان و خۆڕێکخستنەوە لە شارەدێی (جەلەولا) گیرسایەوە .

**هەژار موکریانی لە (ل٩٩) دوو واتای سەرەکی بۆ وشەی پاشماوە دەنووسێت:**

١- بەرماوە ...
٢- زیندوی کەس و کار مردو.

لە (ل٣٦٦)ی فەرهەنگی (مامۆستا)، شەوکەت مەلا ئیسماعیل دەربارەی واتای: پاشەکشەکردن - دەنووسێت: بەزیین، شکستی هێنان، هەڵهاتن، تێشکان، ڕەڤین."

**لێرەدا دەپرسین: کەسانی زیندوی کار مردوی بەزیو، چۆن دەتوانن بەرگری بکەن؟**

سەیرم بەوە دێت! شارۆچکەیەکی لا چەپ لە پایتەختی ئیمپراتۆریەك، زیاتر شتی تێدا بێت . شاری (مەدائین)، یا (تەیسەفۆن) پایتەختی ساسانی بوو، دەکرێ لە شارەدێیەکی وەك: (جەلەولا) شتی کەمتر تێدابی، گەر بزانین (مەدائین) شارێکی فارس نشین بوو کەچی (جەلەولا) شارەدێیەکی کوردنشین بوو؟؟

د.زرار بە نیازی خۆی، (جەلەولا) گەورە دەکا و مەدائین بچووك دەکات !!!

دکتۆر زرار لە (ل١٢) دەنووسێت: " لە گرتنی (جەلەولا) موسڵمانە عەرەبەکان، سامانی تالانکراوی وا زۆروزەبەندیان چنگ نەکەوتبوو، کە بەهای بە دەیان ملیۆن دینار خەملێنراوە ....".

جارێ بەر لە هەموو شتێك، دەستکەوتی جەنگ، بە تالان هەژمار ناکرێت، شەوکەت مەلا ئیسماعیل لە (ل٥١٦) دەربارەی وشەی - تالان کردن - دەنووسێت : ((فەرهوودکردن، ماڵی خەڵك بە خورتی بردن" هەروەها هەژار موکریانی دەربارەی وشەکە دەڵێت :((پووڕ، پوپر، چەپاو، تاڵو بە فارسی: غارت)).

مەحمود شاکر لە (ل١٧٣) ی (ب.٣-٤) دەربارەی دەستکەوتی جەنگی (مەدائین)ی پایتەخت دەنووسێت: "و ارسل سعد السرايا تتعقب الفارين فحصلت هذه السرايا على غنائم كثيرة لم يستطع الفارون حملها فتركوها و اكثرها من ثياب كسرى و لباسه و قد خمس سعد الغنائم، وبعث بها الى المدينة مع بشيربن الخصاصية و فيها بساط كسرى، و تاجه، و سواريه، فلما رأها عمر، رضي الله عنه، قال: إن قوما أدوا هذا لأمناء ....

پێنج یەکی دەستکەوتی (مەدائین) بەرماڵ و لباس و تاج و بازنەی کیسرا بوو، ئەدی چوار لە پێنجی دەستکەوتەکە چەند بووە؟

کەواتە: لە (مەدائین) کۆکرایەوە، کە لە هی (جەلەولا) زیاتر بوو، هەروەها مەحمود شاکر لە (ل١٧٥) دەڵێت : دەستکەوتی جەنگی (جەلەولا) لە دەستکەوتی (مەدائین) کەمتر نەبوو . "هەروەها ئەوەی دەستکەوتووە دەستکەوتی جەنگ بووە، نەك ماڵی خەڵك..

هەروەها کریستینسن لە (ل٦٢٥)ی چاپی کوردی دەربارەی سامانی (یەزگورد) دەنووسێت: "سەوەتە و قەرتاڵەی سەر بە مۆری پڕ لە خشڵ و شت و مەکی زێڕ و زیو، جل و بەرگ، جەواهێرات، چەك وچۆڵ، گیاوگۆڵ و ئالآت و زەردەچێوە و تامە چێشت و عەتری بۆنخۆش.... عومەر تانجەکەی کیسرای لە کابە هەڵواسی.... دەڵێن هەر کەسەی (١٢٠٠٠)درەمی وەبەر کەوتووە."

نازانم جەنابی دکتۆر نۆ هەزار زیاترە، یا دوازدە هەزار ؟؟؟؟

دکتۆر لە (ل١٢) دراوی( دینار ) بۆ موڵك و سامانی ساسانی بەکاردەهێنێت، کەچی ( دینار) دراوێکی بێزەنتی بوو، هەرچی دراوی دەوڵەتی ساسانی بوو، "درهەم" بوو، نەك دینار!!!

لە پرسی فرۆشتنی ( یوسف پێغەمبەر دا) قورئان وشەی درهەم بەکاردەهێنێت. کاتێ ئەسکەندەر مەکدۆنی لە ساڵی (٣٣١ پ. م) حوکمی دارای ئەخمینی ڕوخاند، دوور نییە "دراخمای یۆنانی - درهەمی فارسی" بۆ ئێران گواستبێتەوە، هەروەها لە سەردەمی پێغەمبەر و ئەبوبەکر مامەڵە بە (درهەمی

ساسانی ) دەکرا، هەتا سەردەمی دروشمی یەکخواپەرستی بۆ دراوەکە زیاد کرد.
لە ساڵی (٧٩ك) عەبدولمەلیك مەروان، دراوی عەرەبی دەرکردو، لە وێنەی بیزەنتی و ساسانی دابڕی، بەمەش بزاڤی ئیسلام ـی لە ( عەرەب ) بچووککردەوە!!! .

جیۆگرافیای ناوچە بەشێکە لە شوناسی ناوچەکە. دکتۆر زرار لە (ل١٣) دەنووسێت: "بە درێژایی شەش ساڵ (١٦-٢٢ك\٦٣٧-٦٤٣ ) عەرەبە موسڵمانەکان نەیانتوانی شارەزور بگرن."

(مینۆرسکی ) باوەڕی وابووە، کە (شارەزوور) لە سەردەمی ساسانیەکاندا بەناوی (رنیم شەز ڕای) - نیمڕاه" - نیوەی ڕێگەی نێوان تەیسەفۆن و ئاتەشگای شیز" بووە.

ئەو ڕایە، زۆرێکیتر جەختیان لەسەر کردۆتەوە. هەر لەو کتێبەدا لاپەڕە(١٢٩) (مینۆرسکی ) دەنووسێ: (شارەزوور) لەمێژووی کەلیسای (نەستروپە)کاندا بە بەشێکی دێرمی (Diorese)، یان گەرمای (Badjarmak) ناو نراوە. هەروەها لەسەر چاوە ئاشوریەکاندا ناوی شاری:(دور ئاشور) هاتووە، هەندێ دەڵێن: ئەو شارە ئاشورییە، گۆڕانی بەسەر داهاتووە و بووە بە (شارەزوور)!

کەمال نوری مەعروف لە لاپەڕە(٢٤٧)ی کتێبی" هەندێك شوێنەواری دێرین بەر لە مێژووی کوردستان" دەنووسێ: ناوی شارەزوور، یان شارەهرەزور، کە بەسەر دەشتەکە دا وتراوە، لەوە دەچێت بۆ دوای فەرمانڕەوایەتی ساسانیەکان بگەڕێتەوە، بەڵگەش بۆ ئەمە، هەتا سەردەمی ساسانیەکان،بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان ئەو ناوە نەبیستراوە یان لە ناو ڕووداوەکاندا نەهاتووە، بەڵکو هەر بە (نیم ئەزرا) - نیوەی ڕێگا ناسراوە".

ئەو دوو سێ سەرچاوەیە، قسە لە سەر ئەوە دەکەن، کە ئەوسا شوێنێك نەبووە بەناوی شارەزوور! ئەوەی هەبووە (نیمڕاه) بووە، ئەویش دەشتی هەبووە، نەك "قەلا قایمەکانی شارەزور".

لەلایەکی تریش، بە قسەی (مینۆرسکی )، (نیمراه) لە نێوان (تەیسەفۆن - مەدائین) و ئاتەشگای (شیز) بووە، بەناز عەدۆ (٢٠١١) لە

(ل٢٨) ماستەرنامەکەی لە (یاقوت حەمەوی) دەگوازێتەوە، کە (شارەزور) کەوتۆتە باکووری ڕۆژئاوای (دینەوەر) و چەند قەبیلەیەکی کوردی لێیە، لەوانە: (جەلالی و باسیان)."

چ لۆژیکێك قەبووڵی ئەوە دەکات، نەهاوەندی فارس لە (٢١) ی کۆچی ڕزگار کرابێ، کەچی (نیمراە) لە (٢٢ك) ڕزگاربکرێ ؟ بۆ (نیمراە) خاکی کورد نەبوو؟ زۆر لە پێش نەهاوەند نەبوو؟؟؟

لە کۆتایی لاپەڕە (١٣)، قسەیەکی پڕ پارادۆکس تۆمار دەکات. وشەی "زاڵ" و "مایەپووچ"ی دوو وشەی هۆ و ئەنجامی نیین لە هیچ زمانێکدا. شەوکەت لە (ل١٢٧٥) دەربارەی وشەی زاڵ و زاڵبوون دەنووسێت: سەرکەوتوو (بە سەر مەبەستدا، یان بە سەر دوژمندا... سەرکەوتن بە سەر کاری سەختدا، زۆر سەندن بەسەر کەسێکدا." هەروەها لە (ل١٥٨٤) دەربارەی وشەی مایەپووچ دەنووسێت: مافنگی - مفلیس . هەژار موکریانی لە (ل٨٠٠) دەربارەی وشەی مایەپووچ: دەڵێت: مایەبووت، دەربارەی مایە بووت-یش دەنووسێت : مافنگی لە سەودادا، نابووت." وێڕای ئەوەش، لەو دەقەی خوارەوە وشەی - سەرپاك - زۆر پڕ تەماوی بەکاردەهێنێت، موکریانی لە (ل٤٣٤) دەربارەی وشەکە دەنووسێت : تێکڕا، هەموو، گش ."

لای دکتۆر زرار، ئەو وشانە هیچیان لە کۆنتێستی زمانەوانی و جیوگرافی بەکار نایەن، ئەوەتە لە بارەی هەردوو وشەی: "زاڵ - مایەپووچ" وەك هۆ و ئەنجامی سروشتی دەبینێت، کەچی ئەو دوو وشەیە دژ بەیەکن، چونکە زاڵ واتای بردنەوە و سەرکەوتن دەدات، کەچی وشەی - مایەپووچ - واتای بێ بەرهەمبوون و نابووتبوون دەدات .

هەمان نارێکی واتایی لە وشەی "سەرپاکی" دەخاتەڕوو، کە پێچەوانەی دیتنی فەرهەنگنووسی وەك هەژار موکریانی و شەوکەت مە ئیسماعیل .... ئەو ناکۆکیە زمانەوانی و مێژووییە، گوایە لە (ل٣٢٨) ی (بلازری) دا هەیە، وەك لە (ل١٣) دەنووسێت: "ئەویش بە یاوەری سەرکردەیەکی تر، توانی بەسەر (داقوق) و (خانیجار - خورماتوو) و سەرپاکی دەڤەری گەرمیان، تا سنوری

شارەزور زاڵبێت، وا دیارە ئەم هەوڵەش مایەپووچ بوو و، گرتنی یەکجارەکی گەرمیان دواکەوت، تا دەوروبەری ساڵی (٢٠ك)."

ئایا (بەلازری) بەو تەماوییە باسی دۆخەکە دەکات ؟

لە پەرەگرافی کۆتایی لاپەڕە (١٤) هەردوو ئەدگاری بزاڤی رۆژهەڵاتناسی دووبارە دەکاتەوە، کە پاڵنەری فتوحات: فاکتەری ئابووری و فراوانخوازی بووە. کاتێ (مەدائین) ڕزگارکرا، زۆر لە ماهیەتی فتوحات بۆ خەڵکەکان تەواو دەرکەتن، کە تەواو دوور لە هەردوو فاکتەری ئابووری و فراوانخوازی عەسکەری بوون. دکتۆر عبدالله مصطفى لە (أمجاد الأكراد) و مەحمود شاکر دەڵێن: (سەلمان فارسی) بووە والی (مەدائین)، (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)، کە چووە کۆشکی سپی (یەزگورد)، ئایەتی (٢٥-٢٩)ی سورەتی (الدخان)ی خوێندەوە، کە باسی خۆشگوزەرانی تاغووتەکان دەکات و دوایێ دەبێتە موڵکی قەومی تر . هەر لەو کۆشکەدا نوێژی هەینی کرد - ( مەحمود، ل١٧٣).

**کەواتە هاوکێشەی:**

١- مەدائینی فارسی ... سەلمان فارسی .
٢- کۆشکی یەزگورد... مزگەوتی موسڵمان.

تەواو هەردوو فاکتەری ئابووری و فراوانخوازی بەتاڵ دەکەنەوە . دکتۆر زرار لە (ل١٤) دا دەنووسێت: "سەرکەوتنە مەزنەکەی جەلەولا و ئەو دەستکەوتە لە ژمارەنەهاتووەی بەدوایداهات، پاڵی بە عەرەبەکانەوە نا، لە هێرش و پەلاماردان ساردنەبنەوە و تالانی و سامانی گەورەتر کۆبکەنەوە ...." .

لە کۆتایی (ل١٤) و سەرەتای (١٥) قسەیەکی (بەلازری) بە نیوەچڵی بڵاودەکاتەوە: " گوایە (عومەر) جەختی لە سەر سیاسەتی تالانی و فراوانخوازی دەکرد بە جۆرێك پەیمانی بە (جریر بن عبدالله) دابوو چارەکی داهاتەکانی ڕەشەخاکی عیراق و جەلەولا بۆ خۆی ببات" گوایە: ئەم دەقە لە (ل٢٦٧-٢٦٨) ی (بەلازری) وەرگیراوە !!

**لێرەدا دکتۆر زرار تووشی سێ هەڵە بووە:**

١- لە هەردوو لاپەڕەی (٢٦٧-٢٦٨) ناوی: (جەریر و جەلەولا) هەر نەهاتووە !

٢- ئیسلام گەورەترە لە عومەر،، عومەر ئەو بەڵێنەی بە (جەریر) دا وەك هاندانی جەنگ، بەڵام موسڵمانان بەو بەڵێنەی (عومەر) ڕازی نەبوون، ئەویش لە بەڵێنەکەی خۆی پەشیمانبۆوە . ئەو هەڵویستە قەبوڵکارییەی سەرۆکی وڵات، تەنها لە (عومەر) دەوەشێتەوە .

٣- کە لە (ل١٤) دەنووسێ "خەلیفە عومەریش جەختی لە سەر ئەم سیاسەتە دەکرد و ڕەزامەندی نیشاندابوو.." تەواو پێچەوانەی قسەی (جەمیل ڕۆژبەیانی)یە لە(ل٥٢-٥٩)ی (مێژووی حەسنەویهی و عەیازی) .

ماmۆستا حەسەن مەحموود لە (ل٣٧)ی (فەتحی ناوچە کوردییەکان) پێچەوانەی قسەکەت تۆماردەکات: (جەریر) نامەی مژدەی - گرتنی جەلەولا - حەلوان - بۆ خەلیفە (عمر) نارد، داوای لێکرد ڕێ بدات بە سوپای ئیسلام لە سەر وڵاتگیری - فتوحات - بڕوات، بەڵام (عمر) ڕازی نەبوو، لە وەڵامی نامەکەدا نووسی: حەزم دەکرد لە نێوانی ڕەشە خاکی عیراق - السواد - و هەرێمی چیا، واتە: کوردستان، شورەیەکی ئەستوور ببوایە - یان شورەیەك لە ئاگر -، نە ئەوان ڕێیان ببوایە بەرەو لای ئێمە بێن، نە ئێمە ڕێمان ببوایە بەرەو لایئەوان بڕۆین ."

## نەهاوەند شەڕێکی گەورەی کورت خایەن :

(نەهاوەند) بۆ موسڵمانبوونی کورد، گرینگی لە (جەلەولا) کەمتر نەبوو، (جەلەولا) دەستپێکی عیراقی کوردی بوو، (نەهاوەند)یش نزیکە کۆتا خاڵی ئەقلیمی جیبال بوو، کە بە شەڕ بگیرێت. (جەلەولا) دەروازەی هاتنە ناوی عیراقی کورد بوو، (نەهاوەند)یش دوا قەڵای سەختی ساسانیەکان بوو . ئەوەی یەکەم بە "واقعة جەلولا" لای مێژوو نووسان وەك (طبری و بەلازری...)

ناسراو بوو، ئەویدیش بە (فتح الفتوح) ناسراو بوو .

بە ڕاستی ئەوەی (ل٨٢).. (کتێبی مێژووی طبری - ب.٣) و (ئیبن ئەسیر - ب.٢) و "رسائل الفاروق" و (ل٣٩)ی کتێبی (فەتحی ناوچە کوردییەکان بخوێنێتەوە، دەبینی خەلیفە (عومەر) لەگەڵ پێشڕەوی بۆ هەرێمی جیبال و هەرێمی فارس نەبووە، بۆیە لە نامەکانی بۆ فەرماندەی بەرەکانی شەڕ دەیوت: لو أن بيننا و بين فارس جبلا من نار..... وددت ان بين السواد و بين الجبال سدا...".

لە جیوگرافیای عیراقی عەجەم و ئەقلیم جیبال و ئەقلیم فارس، هەندێ شار لە لایەن مێژوونووس و جیوگرافیناسانەوە تێکەڵ یەك دەکرێن. د.میرزا لە (ل٤٦-٤٧)ی ماستەرنامەکەیدا دەنووسێت: (نەهاوەند) وەك (بروجرد) بەشێك بووە لە (ماە بەسرا) هەروەها لە (لیسترنگ) دەگوازێتەوە، کە (٤٠) میل دوور بووە لە (هەمەدان).

" نەقشەبەندی لە (ل١٧)ی ماستەرنامەکەیدا دەڵێت : (نەهاوەند) هێندە لاواز بوو، هەتا (کەرمەنشاە) شوێنی گرتەوە "بەناز عەدۆ لە (ل٢٦-٢٧)ی ماستەرنامەکەی دا دەڵێت: بە گوێرەی (بولدانیەکان)، کورد ڕەگەزێك بوو لە ناوەوە و دەرەوەی نەهاوەند...".

ئیبن حەوقەل، کە لە (ل٣٠٨) باسی هەندێ شاری ناوداری هەرێمی چیاکان دەکات، لەوانە: (هەمەدان و نەهاوەند). " کەلسومە لە (ل٢٣)ی ماستەرنامەکەی لە (یاقوت) و (قەزوینی) دەگوازێتەوە، کە شاری (نەهاوەند) زۆر کۆن بووە، دەوترێت: (نوح) پێغەمبەر - سەلامی خوای لێبێت - شارەکەی بینا کردووە و خەڵك وتویانە: (نوح) - اوند - شارەکەی (نوح) بۆتە نەهاوەند"

قودامە بن جعفر (١٩٧٩) لە (ل٧٩) دەڵێت: شاری (نەهاوەند)، نزیکەی (١٢٠کم) لە شاری (کەرمەن شاە) دوور بووە ." ڕایەکەی (قودامە) لەگەڵ جیوگرافیای ئەقلیم جیبال تێکدەکاتەوە، بە واتای: (نەهاوەند) شارێکی دووری کوردی نزیك بە فارس بووە. مەحمود شاکر لە (ل٧٤) ی بەرگی (٣-٤)

نەخشەیەك بڵاودەكاتەوە، كە تەنیا هەمەدان لە سەرووی نەهاوەندە . گرتنی نەهاوەند بووە دەروازە بۆ گرتنی وڵاتی فارس.

(كریستینسن) لە (ل٦٢٥-٦٢٦) دەنووسێت: (یەزگرد) پاشا دوایین هەوڵەكانی خۆی دا و داوای لە هەموو هەرێم و مەڵبەندەكانی وڵاتەوە كرد، لەشكری بۆ بێ .." مەحمود شاكر لە (ل١٧٨) ژمارەی سەربازی ساسانی و موسڵمانەكان دەخاتەڕوو: موسڵمانان لە (٣٠)هەزار زیاتر نەبوون، هەرچی فارسەكان بوون (١٥٠) هەزار بوون ." ئەو دوو ژمارەیە ناهاوسەنگە، چاوەڕێدەكرا بە سەركەوتنی ساسانی كۆتایی بێت، بەڵام (كریستینسن) لە (ل٦٢٦) دەنووسێت : كاتێك لە (٦٤٢) ساسانیەكان لە (نەهاوەند) بەرەو ڕووی عەرەبان بۆوە ....سوپای ئێرانی شكستی تێكەوت، (پرووزان) ی فەرماندەی سوپایەكە كوژرا ." مەحمود شاكر لە (ل١٧٨-١٧٩) دەڵێت : شەڕەكە تەنیا چوارشەممە و پێنجشەممەی خایەند، كە زیاتر لە (١٠٠) هەزار فارس كوژرا ."

د. زرار لە (ل١٥) قسەیەكی پێچەوانەی (كریستینسن) و مەحمود شاكر دەڵێت: "پاش شەڕ و كوشتارێكی دەستەویەخەی خوێناوی لە گوندێكی نزیك نەهاوەند....."

گوندی نزیك شار بەرگەی (١٨٠)هەزار ناكات، ڕووبەری گوندی ئاوا نزیك لە شار، شوێنی (١٠٠) هەزار لاشە نابێتەوە، بۆیە منیش لەگەڵ (كریستینسن) دام، كە هەردوو هێز لە شار تووشی شەڕی گەرم بوون، چونكە چۆن فەرماندەی ساسانی كوژراوە، ئەوهاش فەرماندەی موسڵمانەكان، (نوعمانی كوڕی مقرن) كوژراوە.

هەروەها موسڵمانەكان لەو گوندە نزیكەی (نەهاوەند)، سەركەوتنی یەكلاكەرەوەیان بە دەست نەهێناوە، وەك تۆ لە هەمان لاپەڕە دەڵێی، بەڵكو پاش تاكتیكی جەنگ، ساسانیەكان ناچار كراون لە قەڵاكانیان دوور كەونەوە.

لە (ل١٦) دەڵێی: پاش شەڕی (نەهاوەند)، ساسانیەكان هەرگیز نەیانتوانی بۆ جارێكی تر بەر سینگی عەرەبەكان بگرن، دەروازەی وڵات بە ڕوویاندا

والابوو. "

باشە كاك دكتۆر! تۆ پەسەندی ئەوە دەكەی، كە لە نێوان هەر سێ ساڵی: (١٩، ٢٠، ٢١)ی كۆچی وەك (كریستینسن) پەسەندی ساڵی (٢١ك) بۆ شەڕی (نەهاوەند) بكەی...؟ ئەدی چۆن لە (ل١٣) دەڵێی: عەرەبەكان نەشیان توانی، هەتا ساڵی (٢٢ك) شارەزور بگرن ؟؟؟

لێرەوە (د.زرار)، لە هێڵی پێشوەچوونی لەشكری ئیسلامی دوور دەكەوێتەوە، هەروەها دێتە سەرباسێك، كە هیچ پەیوەندی بە كوردستانەوە نییە.

دكتۆر لە لاپەرە (١٧-١٨) سەرباسێك تەرخان دەكات بە ناوی: "فەتحی خۆزستان - الاهواز! ئەهواز بەشێكە لە كوردستان؟) د.میرزا (١٩٩٥) ماستەر نامەكەی: (غربي اقليم الجبال)، كەلسومە جەمیل (٢٠٠٣) ماستەرنامەكەی بە ناوی: (وڵاتی كوردان لە سەردەمی ساسانی)، بەناز ئیسماعیل عدۆ (٢٠١١) ماستەرنامەكەی بە ناوی: (اهل الذمة في بلاد الكرد.....)هیچیان ئاماژەیان بە (ئەهواز) نەكردووە.

دكتۆر، پرۆفیسۆرە لە مێژووی ئیسلامی و كتێبەكەی بە ناوی: (كورد و كوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا)، لە توێژینەوەی ئەكادیمیدا، دەكرێ تایتل - ناونیشان شتێك بێ، ناوەڕۆك شتێكی تر ؟؟

لە (ل١٨) دا ڕووداوێك دەگێڕێتەوە، گوایە: لە (طبری) و (ئیبن ئەسیری جزیری) وەریگرتووە. بابزانین گێڕانەوەی (د.زرار) وەك گێڕانەوەی (طبری) و (ئیبن ئەسیرە)؟

گێڕانەوەی د. زرار: "هەر لەمیانەی پێشڕەوی و پەلهاویشتی عەرەبە فاتحەكان، (سلمه قيس الاشجعي) بە فرمانی ڕاستەوخۆی خەلیفە (عمر) و بەمەبەستی جیهاد لە ساڵی (٢٣ك / ٦٤٤ ز). هاتە كوردستان و لە شوێنێك تووشی دوژمنە كوردەكان (عدوا من الاكراد المشركين) هات بە پێی ڕاسپاردەی خەلیفە، (سەلمە) داوای لێكردن ببنە موسڵمان، یا سەرانە بدەن، كوردەكان هەردوو پێشنیارەكەیان ڕەتكردەوە، ئەمجا بە گوێرەی ئاخافتنی هەواڵزانانی موسڵمان (سەلمە الاشجعي) كوردە شەڕكەرەكانی كوشت و ژنان و كچانی

دەسگیرکرد و، هەرچی ماڵ و کەلوپەلیان هەبوو بەدەستکەوتی گرت، لە نێو کەلوپەلی تالانکراو دا، خشلێکی دەگمەن و ناوازە و بەهاداری دۆزیەوە و، وەك دیاریەکی گرانبەها لەگەڵ مزگێنی سەرکەوتن بە نێردەیەك دا بۆ خەلیفە (عمر)ی نارد، وەلێ کاتێك پارچەی کەسك و زەرد و سوری خشڵەکەی بینی، کە بەهای هەر یەکێکیان بیست هەزار درهەم بوو، ڕاپەرییە سەر پێ، دەستی خستە سەرکەمەری و وتی: دیارە خودا هێشتا زگی عومەری تێرنەکردووە.

دکتۆر زرار، هەردوو گێڕانەوەی: (طبری) و (ئیبن ئەسیر) تێکبردۆتەوە، هەتا گێڕانەوەیەکی کە خۆی دەیەوێت، دارشتووە: لەو گێڕانەوەیەدا چەندان هەڵەی کردووە، لەوانە:

١- (سەلمة الأشجعی) زانا و فەقیهـ نەك چەکدار، (طبری - ل٥٦٦)، (ئیبن ئەسیر - ل٤٤٥).

٢- لە هەردوو دەقدا نووسراوە : گەر دوژمنی خۆتان بینی.

٣- گەر موسڵمان بوو، وەك ئێوە دەبی.

٤- گەر موسڵمانبوونی قەبوڵ نەکرد، داوای (جزیە) بکەن.

٥- سەفت: سەرکەوتن نییە، بەڵکو ئامانی هەڵگری کەلوپەلی ژنانە، یا سەبەتەی هەڵگری مێوەجاتە.

٦- عومەر بەردە گرانبەهاکەی گەڕاندەوە بۆ (سەلمە)، ئەویش فرۆشتی و بەسەر خەڵکی دابەشی کرد.....

لەمەوە دیسان دەردەکەوێت، کە (عومەر)ی خەلیفە، مەبەستی دەستکەوتی جەنگ نەبووە، بەڵکو ویستویەتی خەڵك بەبێ شەڕ موسڵمان ببن.

**کتێبی (طبری) بەمجۆرە باسی دوو هێڵی (فتوحات) دەکات:**

١- مەدائین - جەلەولا - خانەقین - حەلوان - نەهاوەند - هەمەدان - (ل٤٢٨-٥٣٥) بەرگی سێیەم.

٢- مەدائین - جەلەولا - تکریت - ماسبەتان - قرقیسیا - موصڵ - جزیرە.... (ل٤٢٥-٤٤٤).

بەلازری: هێڵی یەکەم - مەدائین - جەلولا - خانەقین - حلوان - نەهاوەند - دینەوەر - ماسبزان - روباری جانقزف - هەمەدان -... (ل١٥٩-١٨٧).

دکتۆر زرار، جیا لە (طبری) و (ئیبن ئەسیر) و (بلازری) و.... مەحمود شاکر (ل١٧) و (ل١٨)و چارەگی (ل١٩) تایبەت دەکات بە گرتنی ئەحواز! (ل١٩-٢٠) باسی: ( داسن و هەکاری و هەولێر) وەك یەکەی کارگێڕی هەرێمی (جزیره) دەکات."

یەکێ، کە کتێبەکەی دکتۆر زرار بخوێنێتەوە، گومانێکی وای لا دروست دەبێت ،کە سەبارەت بە: ( عیراقی عەجەمی و ئەقلیم جیبال)، فتوحاتی ئیسلامی لە (جەلەولا) دەستیپێکردووە، لە (داسن) و (هەولێر) کۆتایی پێهاتووە!

لە بەشی فتوحاتی ناوچە کوردییەکان، باسی هەر چوار هێڵی فتوحاتم کردووە.

## شەشەم: ماستەرەکان!

دوو ماستەری تایبەت بە (فتوحاتی ئیسلامی) نووسراون، ئەو دوو ماستەرەش دەچنە چوارچێوەی ڕەخنە لە فتوحاتی ئیسلامی. ماستەرنامەی یەکەم بە ناوی: (کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد) بوو، کە لە ٢٠٠٢\٥\١٤ لە زانکۆی سلێمانی تاوتوێکرا. بەندە بەناوی: (هیوا سەلام) بە کتێبێك لە (٢٠٠٣) بەناوی: (کورد لە نێوان بەئیسلام کردن و ئیسلام بوون دا) وەڵامی دایەوە.

مامۆستا فازل قەرەداغیش بە کتێبێك بەناوی: (بە ئیسلامکردنی کورد ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟) وەڵامی دایەوە. ئەو دوو کتێبە، لە لایەن (نوسینگەی تەفسیر) و (پرۆژەی تیشك) چاپی دووەمیان بە جیاکرانەوە.

لەم کتێبەدا، چیتر لە سەر ئەو ماستەرنامەیەی (شوان عوسمان) نادوێم !

ماستەرنامەی دووەم، بەشێکی گرینگ لەم کتێبە پێکدەهێنێت .

**ماستەرنامەی، (بەعەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان)،**

ئەم ماستەرنامەیە، میتۆدێکی گرتۆتەبەر، جیا لە میکانیزمی ماستەرنامەکەی شوان عوسمان. فازل قەرەداغی لە کتێبی: (بە ئیسلامکردنی کورد: ماستەرنامە یان هەڵەنامە دا) لە (ل٦٠-تا ١٠٨)پەنجا و سێ سەرچاوە دەهێنێتەوە، شوان نیبینوون یا پێچەوانەکەی بەیانکردووە، یا تەواو گۆڕیویەتی.
(ڕەحیم) وەك (شوان)ی نەکردووە، هاتووە لە سەرەتا بە پاڵپشتی هەندێ سەرچاوەی شیعە مەزهەب و ڕۆژهەڵاتناسی و کوردی سیکیولەر، باسی لە زاراوە و ڕەوشەکانی (فتوحات) کردووە !
لە ماستەرنامەی: "بە عەرەبکردنی ..." زانیاری لە هەندێ سەرچاوە وەرگیراوە، وتەیەکی ڕاستیان تێدا بی، (دە)ی هەڵەشیان تێدایە. ئەو سەرچاوانەی جێی گومانن قسە لە سەر مێژووی ئیسلامیش دەکەن، لەوانە:
١- جۆرجی زێدان - (تأريخ تمدن الاسلام).
٢- مەسعودی - (مروج الذهب).
٣- یەعقوبی (تأريخ اليعقوبي).
٤- ئەحمەد ئەمین .
٥- تەها حوسێین.

سەبارەت بە سەرچاوە کوردییەکان، لە (١٧) سەرچاوەدا، تەنیا دوو سەرچاوەیان بە ویژدانەوە باسی ئیسلام دەکەن، تەواو پێم سەیرە، کە ماستەرنامەی: (کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد)، دوو کتێبی ڕەخنەئامێزی لە سەر نووسراوە، کە هەر یەکەیان دووجار چاپکراونەتەوە، ئەو، بەسەرچاوە وەرگیراوە کەچی دوو کتێبەکەی تر، کە دەچنە خانەی ڕەخنەی ڕەخنەوە، بە سەرچاوە وەرنەگیراون!

**زۆربەی کتێبە کوردییەکان، جوینەوەی قسەی :**
١- جۆرجی زێدان - تأريخ تمدن الاسلام.
٢- مەسعودی - مروج الذهب.

٣- یەعقوبی تأریخ الیعقوبی.
٤- ئەحمەد ئەمین.
٥- تەها حوسێین ...و ئیترە.

بۆیە زۆربەی قسەی ئەو نووسەرانە، بەهای ئەکادیمی پووشکەیەکیان نییە، دەربارەی مێژووی ئیسلامی، چونکە لە گواستنەوەی ڕەوشی ڕووداوەکاندا ئەمین نیین، جا بۆ ئەوەی مامۆستا (ڕەحیم) بە دەردی (فوئاد مەجید) نەچێ، دەبوو کتێبەکەی (ئیکرام کەریم)ی لە سەر (فوئاد مەجید) خوێندبایەوە، چونکە لە (٣٩٣) لاپەڕەدا وێڕای ئەوەی ڕەخنە لە (فوئاد) دەگرێت و دەریدەخات لە زۆر شوێن لە گواستنەوەدا ئەمین نییە.

بەر لەوەی لاپەڕە بە لاپەڕە لە سەر بەشی تایبەت بەم کتێبەم، لە ماستەرەکەی ڕەحیم تاوتوێ بکەم، پوختەیەك دەربارەی بە هەردوو زاراوەی "تەعریبی دەق" و "بەعەرەبکردنی هزر و ناو و جیوگرافیا"وە قسە بکەم.

## چەمکی تەعریبی دەق:

چەمکی تەعریب، دوو واتا هەڵدەگرێت: واتایەك پۆزەتیڤی، واتایەك نێگەتیڤی. واتا پۆزەتیڤیەکە بریتیە لە: گواستنەوە و تەرجەمەکردنی دەقێك لە زمانی سەرچاوە ( کوردی، فارسی، تورکی ...) بۆ زمانی ئامانج ( زمانی عەرەبی ).

ئەم پرۆسەیە بۆ ئاشناکردنی خوێنەری عەرەبە بە کەلتووری: (کوردی، تورکی، فارسی...)،خوێنەری عەرەب هەر لە ڕێگای ئەو تەعریبەوە ئاشنابوو بە کەلتووری: (یۆنانی، ڕۆمانی، هیندۆسی، مارکسیزم....)، چونکە کەلتووری ئەو نەتەوانە، هەموو لە دەرەوەی هاوسێبوونی عەرەب بوون. ئەو جۆرە تەعریبە، تەعریبی دەقە، نەك تەعریبی نەتەوە و جیۆگرافیا.

واتای نێگەتیڤی تەعریب، بریتیە لە: بەعەرەبکردن، بە واتای سڕینەوەی ئەویتر، نەك گواستنەوەی کەلتووری ئەویتر بۆ زمانی عەرەبی.

لە ماستەرنامەکەی (حمید عبدالله) (٢٠٠٨) لە (ل٣٣-٣٤) دەربارەی تەعریب، وێنەیەکی تەواو نێگەتیڤ هەیە، چونکە ماستەرنامەکە لە سەر خودی کەرکوکە، کە ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە (١٩٢٧)ەوە هەتا (٢٠٠٣) خەریکی هەڵتەکاندنی هەموو شتێکی غەیرە عەرەبی بوو. لە (ل٣٣) پێناسەی زمانەوانی تەعریب لە (المنجد) دەهێنێت: "تەعریب بریتیە لە: بە عەرەب کردنی شتێکی نا عەرەبی، وەك: تەعریب کردنی ئیدارە، یا خوێندن.." ئەو پێناسەیە، زیاتر نزیکە لە ڕەوشی: (مەغریب و تونس و جەزائیر)، کە ناسیۆنالیستی عەرەب خەریکی گەڕاندنەوەی کەلتوور و زمانی عەرەبیە بۆ ئەو شوێنانە، نەك کەرکوك!

دکتۆر خەلیل ئیسماعیل، باسی جۆرە بەعەرەبکردنێکردندا دەکات وەك بەعەرەبکردنی نەتەوەیەك، بەعەرەبکردنی ناوی کورد و بەمەزهەبکردنی مەزهەب، بۆیە لای ئەو، تەعریب پەیوەستکراوە بە تەعریبی کەرکوك و دەوروبەری، وەك دەنووسێت: "تەعریب بریتیە لە جێنشینکردنی خەڵکی عەرەب لە شێوەی تاك و کۆمەڵ، لە ناوچەی کوردستان، لە ڕێگای دۆزینەوەی نشینگا بۆیان، هەروەها بە مانای گۆڕینی ناوی شار و دێ و گەڕەك و دامەزراوە فەرمی و نا فەرمییەکان، بۆ ناوی عەرەبی دێت، ئەمەش بە مەبەستی ڕاستیە نەتەوەییەکان بۆ بەرژەوەندی خەڵکی عەرەب دێت)).هەروەها دکتۆر حەمید لە (شاخەوان شۆڕش) دەگوازێتەوە، کە (تەعریب)، واتە: لە ڕەگ هەڵتەکاندنی نەتەوەیەك، یا ڕەگەزێکی نەویستراو لە ناوچەیەکی دیاری کراودا، کە کورد و جێنشینکردنی خەڵکی سەر بە ڕەگەزی عەرەبی لە شوێنی ئەواندا، یان هەوڵ دان بۆ گۆڕینی کەلتوور و سیما و ناسنامەی ئەو ڕەگەزە بۆ سەر عەرەبی و توانەوەیان لە بۆتەی عەرەبدا."

لە پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامیدا، واتای نێگەتیڤی تەعریب، بە هیچ جۆرێك لەگەڵ پرانسیپەکانی ئیسلام ناگونجێت، بەڵام واتای پۆزەتیڤی تەعریب، هەم بۆ ئاشنابوونی عەرەب بووە بە خاك و کەلتووری ناعەرەب، هەم گەیاندنی پرانسیپەکانی ئیسلام بە نەتەوەی غەیرە عەرەب، ئەمەش کرۆکی ئیسلام و تەعریبی زمانەوانی تەعریب بوو.

بەعەرەبکردنی ناسیۆنالیزمی عەرەبی، تەواو جودایە لە بەئیسلامیکردن و تەعریبکردن. ئەوەی یەکەم، بە هەموو جۆرێك توانەوەی ڕەگەزی عەرەبی لە نێو بوتقەی کوردی ڕەتدەکاتەوە، بەڵام هەرچی پرۆسەی بە ئیسلامیکردنە، ئەو توانەوەیە تەواو قەبووڵ دەکات.

ئەوەتە (عەبدولقادر بن رستم بابانی) لە (ل٣٩)ی (سیر الاکراد) دەنووسێت: ((ئەو هەزاران موسڵمانە عەرەبەی لە سەردەمی فتوحات لە کوردستان نیشتەجێکران، لە نێو کورد توانەوە و بوونە کورد."

گەر ئیسلام بەعەرەبکردن بێت، دەبێ ئەو خێزانە عەرەبانە کوردیان بکردبایە بە عەرەب نەك لە کۆمەڵگای کوردی بتوێنەوە.

لە ڕوانگەی زمانەوانی نوێوە، وەرگرتنی وشە لە زمانێکی ترەوە، دیاردەیەکی زمانەوانی ڕۆنانی وشەیە، هەروەها پەتیبوونی زمان، واتای دووربوونی نەتەوە لە شارستانی دێت.

کورد چەندەها وشەی وەك: (حەج و زەکات و مزگەوت و قیبلە...) لەم دینە نوێیە وەرگرت و لێکسیۆنی فەرهەنگی کوردی پێ دەوڵەمەند کرد. دەوڵەمەندترین زمان لە ڕووی وشەوە، زمانی ئینگلیزیە، نیوەی وشەکانی لە زمانی تر وەرگرتووە.

## چەمکی بە کوردیکردن!

چۆن چەمکی تەعریبی پۆزەتیڤ، بەشێك لە پرۆسەی ڕۆنانی وشەی عەرەبی پێکدەهێنێت، هەروەها تەعریب بە تامی بەعەرەبیکردن (تەعریبی نێگەتیڤی) لە ستراتیژیەتی ناسیۆنالیستی عەرەبی هەیە !

ئەوەی لە کوردیش هەیە، تەنیا لە پرۆسەی ڕۆناندا، وەرگرتنی وشەیە. هاوکێشەیەکی زمانەوانی هەیە، کە گوزارشت لە سەربەخۆیی زمانەکان دەکات، کەواتە: گۆڕینی قاڵبی وشەی بیانی، دیاردەیەکی زمانەوانیە.

لەو ڕوانگەوە دەشێ بێژین :

وشەی عەرەبی +گۆڕینی دەنگی =وشەی کوردی .

ژمارەیەك وشەی: عەرەبی، فارسی، تورکی، بە گۆڕینی دەنگیی، بوونەتە وشەی کوردی، ئەو وشە کوردیانە لە پرۆسەی وەرگرتنەوە دروست بوون. ڕاستە ئەو وشانە لە پرۆسەیەکی فۆنەتیکی و مۆرفۆلۆژی دروست دەبن، بەڵام زۆربە واتای سیمانتیکی هەردوو زمان: (ز. سەرچاوە، ز.ئامانج) دەپارێزن.

بۆ نموونە : زمانی کوردی، پڕیەتی لە وشە قەردکراوانەکاندا، لەوانە:

- وەخت لە وەقتی عەرەبی وەرگیراوە.
- ئیزن لە ( اذن ) عەرەبی وەرگیراوە.
- قوتابی لە کتابی عوسمانلی وەرگیراوە.
- مزگەوت لە مسجدی عەرەبی وەرگیراوە.

..........هتد.

هەروەها بە حوکمی هاوسێی و داگیرکاری (١٣٠٠) ساڵەی (فارس) و (ئەشکانی) بۆ کورد، هەزاران وشەی کوردی و فارسی هاوبەش هەن( بڕوانە کتێبی بەندە ئەفسانە و ئایدیۆلۆژیا ...) .

جۆرێکی تر لە بەکوردیکردن هەیە، کە تەواو دوورە لە پرانسیپی زمانەوانی، چونکە هەندێ سیکیولەری کورد، خاوەنی ئەو باکگراوەندە زمانەوانییە نیین، کە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی، دوو زمانی لەیەك جودان، بە گۆڕینی سەرە و بۆرە و، کەسرەیەك لە زمانی عەرەبی، کارەساتێکی زمانەوانی دروست دەبێت، بەواتای: وشە تەواو پێچەوانەوە دەبێتەوە، بۆ نموونە: وشەی ایاك-ی عەرەبی بە دانانی کەسرە لە ژێر (ا)"هەر تۆ" دەگەیەنێت، هەروەها گەر سەرە لە سەر (ا) دابنێین، دەبێتە "قەت تۆ نا" ئەمەش بە پێچەوانەی باوەڕی ئیسلام-ە.

زۆربەی کوردە سیکیولەرەکان، بە هۆی تەواو شارەزانەبوونیان لە چەمکە ئیسلامیەکان، وشەکان بە هەڵە گۆ دەکەن، نازانن وشەی عەرەبی بە گۆڕینی (فەتحە) بە (زەمە)، زۆر واتای دەگۆڕدرێت.

بۆ نموونە: (فوئاد مەجید) لە کتێبی "کۆمەڵگا لە سایەی خەلافەتدا"

وشەی ( خیلافەت) بە خەلافەت دەنووسێت.

ئیکرام کەریم (٢٠٠٧) لە (ل٧)ی کتێبی: (دەوڵەتی خیلافەت) لە وەڵامی فوئاد مەجیددا دەڵێت : "فوئاد کەوتۆتە هەڵەیەکی زمانەوانی زەقەوە، ئەڵێت "خەلافەت" کە لە زمانی عەرەبیدا وشەی (خەلافەت) یانی (حەماقەت و گێلی ) نەك "نیابەت و ئیمارەت"، بەڵام خیلافەت، یانی: ئیمارەت و نوێنەرایەتی کردنی خەڵك و ڕابەرایەتی کردنیان ."
جەلیل کاکە وەیسی، وەرگێڕی کتێبەکەی (ئارشاك پۆلادیان) - کورد لە سەدەی (٧ تا ١٠) - لە زۆربەی شوێنەکان وشەی خەلافەت - ی وەك فوئاد مەجید بەکارهێناوە، هەروەها ماستەرنامەکەی (ڕەحیم)، هەمان هەڵەی (میسری ) و (کاکەوەیس) دووبارە دەکاتەوە !

## قۆناغەکانی تەعریب ؟

ناسیۆنالیستی سیکیولەری کوردی، دەیەوێ مێژوویێکی شێواندراو بۆ چەمکی (بەعەرەبکردن) دروست بکات. بەعەرەبکردنی زمان و دروستکردنی شوناسی دوورەگی زمانەوانی، بگەڕێنێتەوە بۆ خودی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی.
ئەوەتە دکتۆر جەمال نەبەزی ناسراو بە: (پێغەمبەری تیۆری ناسیۆنالیستی کوردی )، بانگەشەی ئەوە دەکات، کە پێغەمبەر موحەممەد - سڵاوی خوای لێبێت - بەعەرەب بوونی لە دایك و باوکەوە گواستەوە بۆ بەعەرەبی ئاخاوتن.

د.نەبەز (١٩٩٧)لە لاپەڕە (١٦)ی کتێبە دووجار تەرجەمەکراوی بۆ کوردیدا (الکرد و اخوانهم المستضعفین) ئاخاوتنێك دەهێنێتەوە، دەیەوێ بە وەرگری کوردی بڵێت: نەتەوەپەسەندی و پرۆسەی بەعەرەبکردن، لە زەمانی پێغەمبەر دەستی پێکردووە و ئەو قسەیەشی بۆیەکردووە، تا وەك خۆی دەڵێت: "موحەممەد یاوەرە عەرەبەکانی لە سەر ڕابهێنێت ...(ل١٦)" ئاخاوتنەکە بەم جۆرەیە :

"یا ایها الناس، ان الرب واحد، و الاب واحد، و لیست

العربيه لاحدكم بأب و لا أم، و انما هي اللسان ...فمن تكلم بالعربية فهو عربي ."

نەبەز (١٩٨٤) لە (ل ١٩ و ٢٠) کتێبی: (بیری نەتەوەیی کورد... ئەو "فەرموودەیەی" پێشتر باس کردووە .(نەبەز) باوەڕی وایە: موحەممەد گۆڕانکاری لە تاریفی بەعەرەبکردن کردووە و لە هۆزەوە بۆ ئاخاوتن - قسەکردنی هێناوە، وەك لە (ل١٩) دەنووسێت: "موحەممەد ویستویەتی تاریفێکی نوێ بۆ عەرەب بدۆزێتەوە، کە بە سودی ئاینەکەی بێت، ئەوەش ئەوەیە: "هەرکەس بە زمانی عەرەبی قسەی کرد، ئەوە عەرەبە".

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، وەك کوردێك گیانم بە قوربانی بێت، هەموو هەوڵی ئەوە بووە، کە عەرەبایەتی لە زەین و زاکیرەی موسڵمان دەربهێنێت، لە سەر چ بنیاتێك کۆمەڵگا بەرەو عەرەبی دەبات؟

ئەو دیتنە، زادەی قەومیەتی عەرەبیە، نەك ئیسلام. خوێندنەوەی (نەبەز) یش، زادەی قوتابخانەی بیری نەتەوەیی کاژیکە.

پێغەمبەری ئیسلام، شەو و ڕۆژ کاری بۆ ئەوە دەکرد، کە موسڵمانەکان لەستەمی چینکاری دەسەڵاتی عەرەبی ڕزگار بکات.

**سەرەڕای ئەم شرۆڤەیە، ئەو دیتنەی (نەبەز) چەند هەڵەیەکی لە خۆگرتووە :**

شوناسی نەتەوەیی لە نێو هاوەڵەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) تەنیا عەرەب نەبوون، بەڵکو (صهیب) ڕۆمی و (سەلمان) فارسی و (گاوان) کوردی هەبوو، خۆشت لە سەرەوەی (ل ١٩) کتێبی: (بیری نەتەوەیی کوردی)، وەك دەنوسی: "هێندێك سەحابەکانی پەیامبەر عەرەب نەبوون وا نێویان براوە" کەواتە قسەکەی (نەبەز) پڕە لە پەرادۆکسی، هەروەها دوورە لە ڕاستیەوە!

سەرچاوەی ئەو قسەیەی سەرەوە، لاپەڕە (١٥)ی کتێبی (علی حسن خربوتلی)ە بە ناوی: (القومیة العربیة من الفجر الی الظهر). لە بواری فەرمووودەناسیدا، دەبێ ئاماژە بەوە بکرێ، کە (بوخاری، موسلم، نسائی ...) ڕیوایەتی کردووە، هەروەها بۆ ئەوەی بزانین فەرموودەکە دروستە، یان لاوازە،

دەبێ بزانین لە زنجیرەی ڕاویەکاندا، پسان هەیە، یان نە؟

جا (نەبەز) لە بریتی ئەوەی ئاماژە بە یەکێك لەو شەش ڕاویە بکات، ئاماژە بە (خەربوتی) دەکات !!

ئەو قسەیە هی (خەربوت)یە، نەك فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، (ئەلبانی) لە: (زنجیرەی فەرموودە لاواز و هەڵبەستراوەکاندا) ژمارە (٩٢٥)ی داوەتێ و ئیبن عساکر بە زۆر لاوازی(ضعيف جدا) دەزانێت زۆر لاوازیش بەهیچ شێوەیەك کاری پێ ناکرێت.

کەواتە: بانگەشەکردن بۆ عەرەبایەتی و تەعریب، دوورە لە کەسایەتی پێغەمبەر، هەروەها ئیسلام دوور دوورە لە نەتەوایەتی ڕەگەزپەرستی.

لەلاپەڕە (١٩)ی کتێبی: (بیری نەتەوەیی کوردی)، موحەممەد بە داهێنەری گۆڕینی بیری عەرەبی دادەنێت، بەوەی بیرۆکەیەکی دۆزیتەوە، کە هەرکەسێك قسەی بەعەرەبی کرد، ئەوە عەرەبە، کەچی دوای (سێزدە) ساڵ، دێ لە لاپەڕە (١٧)ی کتێبی: (المستضعفون الكورد و اخوانهم المسلمون) دا، خۆی دان بەوەدەنێت، کە پێغەمبەر دوور بووە لە ڕەگەز پەسەندی: "لەڕاستیدا پەیامبەر محەممەد دژ بەخۆ زۆر زانینی ڕەگەز پەرستانەو نەتەوایەتی بووە....".

وەك بینیمان، جەمال نەبەز لە (ل١٦) ی کتێبی: (المستضعفون...) وتەیەکی ناسیۆنالیستەکانی عەرەب دەهێنێتەوە، گوایە: فەرموودەیە، لەو ڕوانگەوە پرۆسەی بەعەرەبکردن دەگەڕێنێتەوە سەردەمی پێغەمبەر، ئەمە چ جۆرە دکتۆربوونێکە!! ئەو دکتۆرە، بێئەوەی یەکێك لە کتێبەکانی فەرموودەناسی و گێڕەوەکان دیاری بکات، دەڵێت: سەیری کتێبی (خەربوتی) بکە، کە دوور و نزیك پەیوەندی بە فەرموودەوە نییە، بەڵکو لە سەر فەرموودە شێواندن دامەزراوە!!

# بەعەرەبکردن
# لە سەردەمی
# خەلیفەکانی ڕاشدین دا

(شوان عوسمان) و (ڕەحیم)، دەرك بەوە ناكەن، كە ڕستەیەك گوتاری ماستەرنامەكەیان هەڵدەوەشێنێتەوە. جۆری وەرگرتن و قرتاندن و ڕیزكردنی سەرچاوەكان، بڕیار لە سەر هەڵوەشاندنەوەی ماستەرنامەكەی دەدەن.

چەمكی بەعەرەبكردن، كرۆكی ماستەرنامەكەی (ڕەحیم) پێكدەهێنێت. نازانم بەعەرەبكردن، چ واتایەكی دەبێت، كە مامۆستا (ڕەحیم) لە (ل ٧٣) ی ماستەرنامەكەیدا ڕاستیەكی حاشا هەڵنەگر تۆمار دەكات و دەنووسێت: " لە سەردەمی خەلیفەكانی ڕاشیدیندا پشت بە دین دەبەسترا، بەڵام (معاویە) پشتی بە دەمارگیری و ڕەگەزایەتی و شمشێر دەبەست."

لێرەوە ڕێگا خۆش دەبێ بۆ ئەوەی قسە لە سەر بەعەرەبكردن لە سەردەمی خەلیفەكانی ڕاشیدیندا بكەین، ئەوان پشتیان بە دین (ئیسلام) دەبەست... جا لێرە دوو پرسیاری ناكۆك بە یەكتر دروست دەبێت، لە نیوە ڕستەی دووەم، كە بەڕستەی پارستە ناو دەبرێت، وەڵامی پرسیاری یەكەمی تێدایە، كە گوتاری نیوەی ماستەرنامەكە هەڵدەوەشێنێتەوە، بە واتای: لە سەردەمی خەلیفەكانی ڕاشیدین (دەمارگیری)، (ڕەگەزایەتی)، (شمشێر) حزووریان نەبوو. پرسیاری دووەمیش ئەوە دەگەیەنێت، كە لە دینی خەلیفەكانی ڕاشیدیندا (دەمارگیری)، (ڕەگەزایەتی)، (شمشێر) نییە ... ئەدی بیرۆكەی بەعەرەبكردن لە كوێ هات؟؟

## هەڵسەنگاندنی زمانەوانی ماستەرنامەی بە عەرەبکردن:

ماستەرنامەکە قسە لە سەر شتێکی ترسناك دەکات، ئەویش پرۆسەی بەعەرەبکردنە. بەعەرەبکردن داپۆشینی بەرگێکی نەتەوەپەسەندی عەرەبیە بە سەر ئیسلامدا. ڕەوتی ناسیۆنالیزمی تیۆری کوردی، لەمێژە کار لە سەر ئەوە دەکات، کە ئیسلام بە بەشێك لە توراسی عەرەبی ببینێت . ئەوەتە جەمال نەبەز، بە قەوڵی لایەنگرانی پێغەمبەری ناسیۆنالیستی کوردییە، دیماگۆژیەتێك بەکاردەهێنێت: لەبەرانبەر ناوی پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم) بەکاردەهێنێت، بەڵام لە دوو کتێبدا (گەر زیاتر نەبێ) دەڵێت: بەعەرەبکردن لە سەردەمی پێغەمبەرەوە قالبێکی تری وەرگرت.

لە پرسی نەتەوەسازی و زماندا، دوو خوێندنەوە هەن: خوێندنەوەیەك لە سەر (لێکسیکۆن - لێکسیم) دامەزراوە، ئەویتریش لە سەر (کۆنتێکست - سیاق) دامەزراوە، هەتا واتای تێکست زوڵاڵ دەبێت.

خوێندنەوەی زمانەوانی کار لەسەر خوێندنەوەی سیمانتیکی دەق و خوێندنەوەی پراگماتیکی دەکات، لە خوێندنەوەی یەکەمدا تێکست حزووری هەیە، لە خوێندنەوەی دووەمیش: کۆنتێکست حزووری هەیە.

پێکەوە گرێدانی ئەو دوو خوێندنەوە یەك بە یەکتر، سوودێکی فرە خاسی هەیە لە زانستی تێکستناسی دا، چونکە زۆر جار کۆنتێکستی زمانەوانی و نا زمانەوانی، وەك شوێن و جیۆگرافیا، ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ لە زەڵاڵکردنی واتای لێکسیکۆن، یا تەواوی دەق.

لە لایەکی تر، جۆرە ڕەخنەیەك هەیە لە ڕەخنەی ئەدەبی، بە ناوی: (ڕەخنەی نوێ کار لە سەر میتۆدێك دەکات)، کە بریتیە لە: دابڕینی دەق لە: (ناوی دەقنووس) و (تایتڵ) و (بەروار).

ئێستا بابزانین لەو شوێنەی ماستەرەکەدا زانیارێکی گوماناوی هەڵدەگرێت لەو سەرچاوانەی سەرەوە، یا سەرچاوەی ڕۆژهەڵاتناسی و سەرچاوە دژە -

ئیسلامیەکان، وەرنەگیراوە ؟ یان کە دەقە وەرگیراوەکە بە پێوەری قورئانی دروست و تەندروستە ؟ یا ئەو دەقە ئەو دەقە ئەدەبیەیە، گوزارشت لە جیهانبینی ئیسلام دەکات ؟

لە ڕوانگەی ئەو هەموو پێوەرەوە، خوێندنەوەیەکی زمانەوانی بۆ ماستەرنامەکەی (رەحیم ئەحمەد ) دەکەین.

بەر لەوەی خوێندنەوەیەکی زمانەوانی بۆ ماستەرنامەکە بکەین، بە گرینگی دەزانین، باسی زمان لە قورئان بکەین (کە لە بەشی سێیەمی کتێبێکی توێژەر (سەلام) دەرهێنراوە )تا بزانین خوێندنەوەکەی (ڕەحیم) لە سەر دەقی قورئان و دیتنی بۆ نەتەوە دامەزراوە؟ یا تەنیا هەستێکی نەتەوەیی پاڵپشتی بەعەرەبکردنە، کە تەنیا لە زهنیەتی بەرپەرچی کوردی دروستبووە؟

# پرسی زمانی عەرەبی لە قورئاندا
# لە نێوان
# زمانی دەقی ئیلاهی و
# زمانی نەتەوەدا

## دەروازەی بەش:

زمانەوانی ئایینی، دەقی ئیلاهی، پێویستی بە ئامادەگی زمانێکی ئیلاهی هەیە. دەقی وەك: (زەبور و صحف و تەورات و ئینجیل)لە بنەڕەتدا دەقی ئیلاهی بوونە، بۆیە بەزمانێکی ئیلاهی نووسراون و بە گێڕانەوەیەکی ئیلاهی دەقی دەقەکە بە مرۆڤ گەیشتووە.

ئەو فۆرمۆلەبوونە ئیلاهیە، هەتا دابەزینی قورئان پەیوەندی کەلامی ئاسمان و زەمینیان بۆ گواستوینەتەوە.

بۆ نموونە: لە دەقی قورئاندا، دەقی وا هەیە، خوای بەرز و مەزن، عادات و تەقالیدی کەلتووری جوولەکەمان بۆ دەگوازێتەوە، وەك نەزرەکەی دایکی مریەم، کە داینابوو خودا کوڕێکی پێ ببەخشێ، تا ئەویش بیکاتە خزمەتکاری پەرستگا، بەڵام کە زگەکەی دانا، وتی: ﴿ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ﴾ ئەمە گێڕانەوەی ئیلاهیە، نەك بڕیاری ئیلاهی.

بڕیاری ئیلاهی، پێچەوانەی داب و کەلتووری جولەکەیە، بۆیە ئەو (مریەم)ەی، کە دایکی لە بوونی دەترسا، خودا کردیە یەکێ لە ئافرەتە لە خواترسەکان، کە شایەنی

ئەوەبێت هەم خزمەتکاری پەرستگابێت، هەم دایکی پێغەمبەرێکی ئولوعەزم، دایکی عیسا! لە لایەکی دیکە، خودا سنووری (جێندەر) و بانگەشەی (فێمینیزم) دەشکێنێ بەوەی (مێ)، لەگەڵ (نێر) لە چاکە و زینا و دزی... و جیاوازی بایۆلۆژی سێکسیان لە سزا و پاداشتی ئیلاهی، نەك مرۆیی، جیایان ناکاتەوە: چەندەها ئایەت لەم بارەیەوە هەن وەك: (السارق و السارقة)، (الزانية والزاني) ، (المؤمنين و المؤمنات).....

وێڕای ئەو (گێڕانەوە ئیلاهیانە) و ئەو (بڕیارە ئیلاهیانە)، دیاردەیەك هەیە بە ناوی: (زمانی ئیلاهی) شرۆڤەی زمانی نەتەوەیەکی دیارکراوی بۆ دەکرێت. دوا دەقی ئیلاهی، کە قورئانە، گرینگیەکی تایبەتی بە (زمان) و (زمانی قورئان) داوە. لەو زمانە ئیلاهیەدا، بە تایبەتی لە دوا دەقیزمانی قورئانی پیرۆز دا (٢٥) جار، بە واتای جیا ئاماژەی بە زمان کردووە.
لە لایەکی دی (١١) جار ئاماژەی بە زمانی قورئان کردووە: لێرەدادەپرسین: مەبەست لەو ئاماژەکردنەزمانی نەتەوەیە،کە بە ناوی عەرەب، یا زمانی خودی قورئانە؟

ئەم بەشە هەوڵدەدات بە بەڵگەی قورئانی، وەڵامی ئەم پرسیارەی کەلتووری کوردی وغەیرە کوردی بداتەوە.

## تێگەیشتنی کورد لە بارەی زمانەوە:

هەرچەندە کورد وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ، لە دوای کودەتای کۆرش (٥٤٩) پێش میلاد لە سەر خاکی خۆی حوکمی خۆی نەکردووە، بۆیە زۆر کەم ڕێککەوتووە، تەواو ئاشنا بێت بە هەژموونی زمان لە کۆمەڵگا و حوکمڕانیدا.
ئەوەتە شەرەفخانی بدلیسی (١٥٤٣-١٦٠٤) لە سەدەی (شازدە) و نزیك (حەڤدە)ی میلادیەوە "شەرەفنامە، یا مێژووی میرانی کوردی" بە فارسی نووسیوە، نەك بە کوردی، لەو ڕوانگەوە (ابن صلاح شارەزوری) (٥٧٧-٦٤٣)ی کۆچی و (ئیبن خەلەکان) (٦٠٨-٦٨١) ی کۆچی و (ئیبن ئەسیری جەزیری) (٥٥٥-٦٣٠) کۆچی و (مستۆفی) (١١٦٩-١٢٣٩)... لە دادگای

نەتەوەدا تەبریر دەردەچن، چونکە بابەتی کتێبەکانیان ئیسلامی بووە، بۆ هەموو نەتەوەکانی نێو دەوڵەتی ئیسلامی نووسراون، کەچی کتێبەکەی (شەرەفخان) بە شێکە لە کەلتوری کوردی، دەبوایە بە زمانی کوردی بوایە!

(مەلای جزیری) و (مەلا ئەحمەدی خانی) وەك دوو مەلای ڕۆشنبیر، خوڵقێنەری نەك هەر دیاردەی بە کوردی نووسین بوون، بەڵکو لە پێشەوەی ئەو ئەنتیجیلسیایەی(متەنەوری) کوردی بوون کە کۆششیان دەکرد، کە بە (زمانی کوردی) و (شیعری کوردی) شوناسی کوردی لە نێو کەلتووری ئیسلامیدا، وەك: (عەرەب و فارس و تورك) بەدەرکەوێت.

کورد لە ئەدەبی خۆیدا، زمانی کوردی لە حاڵەتی کۆمەڵایەتی و دینی کورت کردبۆوە، هەتا دەرکەوتنی: (جزیری) و (خانی).. ڕەهەندی نەتەوەیی زمانی فەرامۆش کردبۆوە.

شاعیرێکی وەك پیرەمێرد (١٨٦٧-١٩٥٠) دەربارەی ڕەهەندی کۆمەڵایەتی زمان لە دێرە شیعرێکی پەندئامێزدا دەڵێت: "زمان بەڵای سەرە" زێوەری شاعیر (١٨٧٥- ١٩٤٨)، کە هاودەمی پیرەمێردە دەربارەی ئەو ڕەهەندەی زمان لە شیعرێکی پەندئامێز دەڵێت: "زبان بوەستێ سەر ڕەحەتە".
لێرەدا دەردەکەوێ، کەنوسەری کورد، هەتا سەدەی (هەژدە) و (نۆزدە)، هەر لەو ڕوانگەوە تەماشای (زمان - زبان)ی کردووە. ڕەهەندی نەتەوەی زمانی فەرامۆش کردووە. زمان هەڵگری چەند ئەدگارێکە، نەك تەنیا هەر کۆمەڵایەتی!

قورئان، کتێبی مەنهەج ئیلاهی ،بەر لە (١٤٣٨) زیاتر قسەی لە سەر ڕەهەندە جیاوازەکانی زمان کردووە، بەڵام ئەفسووس، هەتا دەرکەوتنی مەلای وەك: (جزیری و خانی و نالی...) ڕۆناکبیری کورد پرسی (زمان)ی قەتیس کردبوو لە پەیوەندی سەلامەتی(سەر) لە دنیا و ئاخیرەتدا، نەك نەتەوە، کەچی نەتەوەی دی لە فارس و تورك ....بە زمانی نەتەوە قسەیان لە سەر ئیسلام کردووە.

## دەقەکانی قورئان لەبارەی زمانەوە:

ژمارەی ئایەتەکانی قورئان لە بارەی وشەی زمانەوە، یەکسانە بە ژمارەی پێغەمبەرە ناوهاتووەکانی نێو قورئانەوە. جگە لە ئادەم و خاتەم، پێغەمبەرەکانی نێوان ئەو دوو زاتە، پێغەمبەری (قەوم)ی تایبەت بوونە. بە پێی قورئان، تەنیا (٢٥) پێغەمبەر ناویان هاتووەو (٢٥) جاریش ناوی زمان هاتووە. بەرلەوەی ئاماژە بە دەقەکانی نێو قورئان بکەین لە بارەی (زمان)ەوە، گرینگە ئاماژە بەوە بکەین، ئاخۆ ئەوەی ئەو وشەیەی باس لە زمان دەکات، وشەی "لسان"-ە یاخود "لغة" یە؟

ناسیۆنالیستی عەرەبی چۆن تەئویلێکی (ئەتنیکی - سیاسی) بۆ وشەی قەوم کرد و بەرگی (ناسیۆن - نەیشن) لەبەرکرد، هەتا دەلالەت لە سیاسیبوونی نەتەوە بکات، نەك ئەتنیکی و هۆزی. عەرەب بوونی بە زاری پێغەمبەرەوە (کە بەرییە لەو دیتنە - تەماشای کتێبی دوالیزمی نەتەوەیی نوسەر بکە) بەستەوە بە ئاخاوتنی تاکەوە، نەك دایك و باوکەوە بە هەمان شێوەش زمان-ی لە (لسان)ەوە گواستەوە بۆ لغة (دیتنی ناسیۆنالیستی بۆ زمان)، ئەگەرنا وشەی (لغة) لە قورئاندا هەرگیز بەوناوە نەهاتووە، بەڵکو بە واتای پڕوپوچی، زۆربلێی... هاتووە.

کەواتە لە قورئاندا ئەو وشەیەی گوزارشت لە زمان دەکات، وشەی (لسان)ە، نەك (لغة)یە، بۆیە دەبینین: وشەی: (لسان) (٢٥) جار هاتووە، بەڵام بە هیچ جۆرێك ئاماژە بە وشەی (لغة)ەوە بە واتای ناسیۆنالیستی نەکراوە. ئەو وشەیەی (لسان)یش بە چەند مانەیەکی جیاواز هاتووە:

١- لە زماندا، زبان بریتیە لە پارچە گۆشتێکی لاکێشەیی جولاوەی ناو دەم - زار کە لە کوردیدا پێیدەگوترێ:"زبان"، کە سێ ئەرکی جیاواز دەگێڕێت: تامکردن، قوتدان، هەروەها گۆکردن.

لە شەرعدا دەگوترێ: "زبان بەڵای سەرە، چەندی بیگری هێندە سەلامەت و ئارام تر دەبی"، چونکە بەشێکی زۆری گوناهـ بە زبان و دەرهاویشتەکانی

دەکرێت، کەواتە: غەزالی وتەنی، زبان لە سنوری خۆی دەرچێت، چەند ئافاتێك بە دوای خۆی دەهێنێت. کورد لە مێژوو و کەلتووری خۆیدا، زۆر کاری لە سەر ئەو مانا و ڕەهەندەی زبان کردووە.

٢- زمانی قەوم، یان زمانی خەڵکی هاودەڤەر - زمانی بەرەباب:

(لسان)ی قەوم نێوەندی، پەیوەندی کەلامی بوو لە نێوان (٢٣) پێغەمبەری قورئان. خودی قورئانیش لە سورەتی ئیبراهیم، ئەو بۆچوونە پشت ڕاستدەکاتەوە، ئەوەتە خودای کاربەجێ لەو دەقە دەفەرموێت:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٤ ﴾

٣- زمانی دەقی ئیلاهی:

ئەم زمانە زمانێکی بێ گرێیە و بەدەرە لە هەموو هەڵە و کێماسیەکی زمانەوانی، وەك زمانی قورئان.

٤- نەتەوەی سیاسی نەك ئەتنیکی:

لە ڕووی نەتەوەشەوە، زبان ئەرکێکی تری هەیە، بە جۆرێك بارگاوی کراوە بە سیاسەتەوە، ئەو شرۆڤەیش بەدەرەلە ڕونکردنەوەی ئەو دەقی ئاسمانی، کە هەر (٢٣) پێغەمبەرەکە پەیامەکانیان بە زمانی (قەوم)یان بووە، وەك قورئانیش دەفەرموێ: هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێت، بە زبانی قەومەکەیبووە".

ناسیۆنالیستی عەرەبی پرسی "بەستنەوەی پەیامی ئیلاهی بە زمانی قەومەوە" وا ئاوەژوو کردۆتەوە،هەتاپرۆسەی دروستکردنی "شوناسی نەتەوەیی" مۆرکێکی ئیلاهی پێببەخشێت!

ئەو دیتنەی کۆتایی لە سەر دیتنێکی ناسیۆنالیستی، نەك ئیلاهی دروستبووە، چونکە ئەو دیتنە بەرەو ڕەگەز پەرستی دەچێت، ڕەگەزپەرستیش دیاردەیەکی بۆگەنە لە ئیسلامدا. هەروەها لەم دیتنەدا، نەتەوەی سەردەستە و بندەستە لە

ئوممەی ئیسلامی دروست دەبێت. ئەوەتە عەرەب زیاتر لە (٢٠) دەوڵەتی هەیە، کەچی (تەنیا یەك دوو دەوڵەتی کوردی) بە پەرت کردنی ئوممەی ئیسلامی دەزانێت!!

## ماناکانی (لسان) لە قورئاندا:

**لە قورئاندا ئاماژە بە چەند مانەیەکی جیاوازی (لسان) کراوە:**

١- زبان (زمانی ناو دەم و گەیاندنی زانیاری).
٢- زمانی قەوم - بەرەباب.
٣- زمانی یادی خواکردن بە مۆنۆلۆگی و دایەلۆگی.

ئیمامی عەلی،بێجگە لە مانای زمانی قەوم (سێ) مانای دی زمان دەخاتەڕوو: زمانی زانست (بۆ جیاکردنەوەی حەلال و حەرام)، زبان - زمانی بەخشین، زمانی یەکخواپەرستی، هەرچی دی (سۆسێر)ە،کە لە ڕوانگەی زماننناسیەوە توێکاریەوە سێ مانای دی زمان جیا دەکاتەوە:

Language
Langue (مەعنەوی)
Parole (بەرجەستە)

لە دیدی دی، (سۆسێرە)وە لە ڕێگای پارۆلەوە دەتوانین لە لانگ بگەین.

**بە مانای زبان و یاد و زمانی نەتەوە، ٢٥ جارناوی ئەو (لسان)زمانە لە قورئاندا هاتووە، وەك :**

١- ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾ سورة المائدة.

٢- ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن

يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٤﴾ ﴾ سورة إبراهيم.

٣- ﴿ وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّهُمۡ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٞۗ لِّسَانُ ٱلَّذِي يُلۡحِدُونَ
إِلَيۡهِ أَعۡجَمِيّٞ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيّٞ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾ سورة النحل.

٤- ﴿ وَوَهَبۡنَا لَهُم مِّن رَّحۡمَتِنَا وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ صِدۡقٍ عَلِيّٗا ﴿٥٠﴾ ﴾ سورة مريم.

٥- ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلۡمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوۡمٗا لُّدّٗا ﴿٩٧﴾ ﴾
سورة مريم.

٦- ﴿ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ ﴾ سورة طه.

٧- ﴿ وَيَضِيقُ صَدۡرِي وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي فَأَرۡسِلۡ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ سورة الشعراء.

٨- ﴿ وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾ سورة الشعراء.

٩- ﴿ بِلِسَانٍ عَرَبِيّٖ مُّبِينٖ ﴿١٩٥﴾ ﴾ سورة الشعراء.

١٠- ﴿ وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا فَأَرۡسِلۡهُ مَعِيَ رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓۖ إِنِّيٓ
أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ ﴾ سورة القصص.

١١- ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ سورة الدخان.

١٢- ﴿ وَمِن قَبۡلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامٗا وَرَحۡمَةٗۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٞ مُّصَدِّقٞ لِّسَانًا عَرَبِيّٗا
لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٢﴾ ﴾ سورة الأحقاف.

١٣- ﴿ لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ ﴾ سورة القيامة.

١٤- ﴿ وَلِسَانٗا وَشَفَتَيۡنِ ﴿٩﴾ ﴾ سورة البلد.

١٥- ﴿ أَشِحَّةً عَلَيۡكُمۡۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلۡخَوۡفُ رَأَيۡتَهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ تَدُورُ أَعۡيُنُهُمۡ كَٱلَّذِي
يُغۡشَىٰ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلۡخَوۡفُ سَلَقُوكُم بِأَلۡسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى

ٱلۡخَيۡرِۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يُؤۡمِنُواْ فَأَحۡبَطَ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿١٩﴾ ﴾
سورة الأحزاب.

١٦- ﴿وَإِنَّ مِنۡهُمۡ لَفَرِيقٗا يَلۡوُۥنَ أَلۡسِنَتَهُم بِٱلۡكِتَٰبِ لِتَحۡسَبُوهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ
وَمَا هُوَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ
وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾ سورة آل عمران.

١٧- ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا
وَٱسۡمَعۡ غَيۡرَ مُسۡمَعٖ وَرَٰعِنَا لَيَّۢا بِأَلۡسِنَتِهِمۡ وَطَعۡنٗا فِي ٱلدِّينِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ قَالُواْ سَمِعۡنَا
وَأَطَعۡنَا وَٱسۡمَعۡ وَٱنظُرۡنَا لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَقۡوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ
إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٤٦﴾ ﴾ سورة النساء.

١٨- ﴿ وَيَجۡعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكۡرَهُونَۚ وَتَصِفُ أَلۡسِنَتُهُمُ ٱلۡكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ
ٱلۡحُسۡنَىٰۖ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفۡرَطُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ سورة النحل.

١٩- ﴿يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ سورة النور.

٢٠- ﴿ سَيَقُولُ لَكَ ٱلۡمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ شَغَلَتۡنَآ أَمۡوَٰلُنَا وَأَهۡلُونَا فَٱسۡتَغۡفِرۡ
لَنَاۚ يَقُولُونَ بِأَلۡسِنَتِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ
أَرَادَ بِكُمۡ ضَرًّا أَوۡ أَرَادَ بِكُمۡ نَفۡعَۢاۚ بَلۡ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرَۢا ﴿١١﴾ ﴾ سورة الفتح.

٢١- ﴿إِن يَثۡقَفُوكُمۡ يَكُونُواْ لَكُمۡ أَعۡدَآءٗ وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ
لَوۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٢﴾ ﴾ سورة الممتحنة.

٢٢- ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ
إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾ سورة الروم.

٢٣- ﴿إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا

وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ سورة النور........

(زبان) کەنالی گەیاندنە لە نێو تاکەکاندا، کەواتە: ئەو سیستەمەی پەیوەندیکردن بێ مەترسی کۆمەڵایەتی و دینی نییە، چونکە لە لایەك لە نێو نێوەندی جڤاکدا ئامادەگی هەیە، لە لایەکیش بەرهەمی زهنی مۆنۆلۆگیە، بۆیە شێخ موحەممەد عەبدولجەبار لە لاپەرە (٦٩) کتێبی: (النطق والصمت) دەنووسێت: "زمان سێ خەواتری هەیە:

١- زانست.
٢- تأویل.
٣- جێگۆرکێ.

ئەو سێیەش تەرجومانی خۆیان هەیە، عەقل تەرجومانی زانستیە، دەروون تەرجومانی (تأویل)ە، هەرچی سروشت - (میزاج)ە تەرجومانی جێگۆرکێیە."

## زمانی قورئان لە نێوان دەق و نەتەوەدا:

زمانی عەرەبی وەك زمانی ئاخاوتن، زمانی نەتەوەیەکە، کە بە زار و ئاکسەنتی جیاواز دەدوێن. ئەوەی بە هەڵە پێیدەوترێت زمانی ستاندەر دایەلێکتێکی پیشەسازیە، دەرهاوێشتەی شاری عەرەبیە، هەتا لە پەروەردەدا وەك زمانی خوێندن و کتاب تەواو دەرناکەوێ، بۆیە وەك دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی لە کتێبی: (نحو نحو قرآني) جەختی لە سەر دەکات، کە عەرەبی سیکیولەری ناو پەروەردە، دەیەوێت زمانی قورئان لە دادگای زمانی عەرەبی دابنێت، تا پەیڕەوی عەرەبی عەرەب بکات، نەك بە پێچەوانەوە! کەچی زمانی عەرەبی دەبێ چاو لە قورئان بکات، لەم ڕووەوە دکتۆر عوسمان، قسەیەکی (ئیسرائیل ولنسون) دەهێنێتەوە، کە وتویەتی: "دەبێت زمانی عەرەبی چاو لەزمانی قورئان بکات و شوێنی یاسا زمانەوانیەکانی ئەو بکەوێت، نەك قورئان بکرێتە شوێنکەوتەی زمانی عەرەبی".

هەروەها سیکیولەری عەرەب، لە زۆر کاتدا شیعری عەرەبی دەکاتە سەرچاوە، نەك زمانی قورئان، بۆیە دەبینین: ڕۆژنامە و گۆڤارە عەرەبیەکان،

جمەیان دێت لە هەڵەی ڕێزمانی و تەرادفی.

ئەو مەرگەساتە ڕێزمانی و زمانیە، زیاتر لە لای خوێندەوار دەرکی پێدەکرێت، چونکە دیاردەکە تایبەتە بە زمانی نووسین، نەك ئاخاوتن. لەم ڕوانگەوە دەتوانین بێژین: لای ئەو عەڕەبە زمانی نەتەوە، زمانی ئاخاوتن یەکن . ناسیونالیستەکانی جیهانی عەڕەبی، مامەڵە لەگەڵ زمانی قورئان وەك خودی قورئان لە نێو دەستوردا مامەڵە دەکەن. چۆن قورئان لە دەستوری حوکمڕانی عەرەبیدا، سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکان، زمانی قورئانیش وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی ڕێزمانی عەڕەبی حسێبی بۆ دەکرێت.

هەرچی زمانی قورئانە، زمانێکی ئیلاهیە، نەك پیشەسازی (لە لای نوخبە دروستکراو) هەروەها زمانی نەتەوەیەك نییە، بە ناوی عەڕەب. ئەو (عەڕەبیەی) (یازدە) جار لە قورئاندا هاتووە، مەبەستی خودا، شوناسی زمانی دەقی قورئانە، نەك نەتەوەی عەڕەب.

دکتۆر جەمال نەبەزی زەردەشتیناس (١٩٨٤) لە لاپەڕە (١٨-١٩)ی (بیری نەتەوەیی کوردی...)دان بەوە دەنێت: "لە قورئاندا (١١) جار وشەی "عربی" بەکارهێنراوە، بەڵام هەمووی هەروەك پێناسە (attribute) یەك بۆ زمان' بە تایبەتی زمانی قورئان ."

هەرچی لسان القوم (زمانی قەوم، زمانی بەرەباب، نەك زمانی نەیشن) وشەی (قەوم)ی نێو قورئان، وشەیەکی ئەتنکیە هەرچی وشەی (nation) ی ئینگلیزیە، دەرهاوێشتەی شۆڕشی پیشەسازی ئینگلیزی، هەروەها شۆڕشی فەرەنسیە، بۆیە دەتوانین بێژین، لەو دەمەوە (نەیشن) واتای سیاسی وەرگرت.

لەوبارەیەوە (نەبەز) دەنوسێت: "وشەی (عربی) لە قورئاندا وەك پێناسەی گەلێکی تایبەتی، یا نەتەوەیەکی تایبەتی بە هیچ جۆرێك بەکارنەهێنراوە." ئەو (یازدە) ئایەتەی خوارەوە، هەموو قسە لە سەر زمانی دەقی قورئان دەکەن، نەك زمانی نەتەوەیەك بە ناوی: عەڕەب!

ناسیۆنالیستی عەڕەبی، بانگەشەی ئەوەی بە زاری پێغەمبەرەوە دەکات، کە عەڕەبیبوون پەیوەستە بە ئاخاوتنەوە، نەك دایك و باوك، هەروەها بانگەشەی

ئەوەیان دەکرد، کە زمانی نێو گۆڕ و، هەتا بەهەشتیش بە زمانی عەرەبیە.

هەژار موکریانی لە پەرچەکردارێك بەرانبەر ئەو دیتنە شۆڤینیەی ناسیۆنالیستی عەرەبی دەڵێت:

بە کوردی دەدەم وەڵامی قەبرم

زمانی عەرەبی قورئان، زمانی نەتەوەی عەرەب نییە، بەڵکو زمانی دەقێکی ئیلاهیە، هەروەها سەبارەت بە زمانی بەهەشتیش، لەمێژە (جوولەکە) و (ئەڵمانی) و (سویدی) و (تورکی) و(کوردی ئێزیدی... بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە زمانی: (عیبری، ئەلمانی، سویدی، تورکی، کوردی ئیزیدی)، زمانی بەهەشتە، کۆمەڵگەی زمانەوانی فەرەنسی ئەوە چەند سەدەیە وەڵامی ئەو خورافاتانەی داوەتەوە. لەوەش گرینگتر، پێغەمبەری ئازیز هەر لە سەدەی حەوتەمی میلادیەوە، وەڵامی ئەو بیرۆکە شۆڤینیەی داوەتەوە بە فەرموودەی: "مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَوْمَ القِيَامَةِ إِلَّا وسَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ، لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ (متفق عليه)."واتە: لە ڕۆژی قیامەت، هەریەکێك لە ئێوە،ئیلا خوای پەروەردگاری قسەی لەگەڵدا دەکات،کە وەرگێڕ لەنێوانیاندا نیە.

هەروەها وەك قورئان پێمان دەڵێت: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾ ئەو لە خۆیەوە قسە ناکات، بەڵکو هەرچی دەیڵێت، سروشی خودایە.

**ئایەتەکان لە بارەی عەرەبی زمانی قورئان:**

١- ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢﴾ ﴾ (يوسف: ٢)

"ئایەتەکانی ئەم قورئانە ئێمە بە عەرەبی ناردومانەتە خوارەوە، تاکو ئێوە تێبگەن."

٢- ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا ۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا وَاقٍ ﴿٣٧﴾ ﴾ (الرعد: ٣٧)

"هەروەها ئێمە ئەم فەرمانەی خۆمان بە عەرەبی بۆ تۆ هەنارد، پاش ئەم فەرمانە و زانستە بە دوای هەوەسی ئەوان بکەوی، ئیتر نەخودا یارتە نە

بەرگری کاریشتە"

٣- ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾ (النحل: ١٠٣)

"ئێمە دەزانین ئەوان دەڵێن: بنیادەمێ فێری دەکا، ئەو زبانەی ئەوان نیازیانە ئەعجەمیە، کەچی زمانی ئەم قورئانە عەرەبیەکی ڕەوانە".

٤- ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾ ﴾ (طه: ١١٣)

"هەروەها هەر بەم تەرزەش قورئانمان بە عەرەبی بۆ دابەزاندووین، زۆر ترسمان تێ ئاخنیوە، تاکو پارێزی سنووری خودا بکەن، یا خۆیان وەبیربێنێتەوە".

٥- ﴿ بِلِسَانٍ عَرَبِىٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ ﴾ (الشعراء: ١٩٥)

بە زبانێکی عەرەبی ڕەوان و ئاسان.

٦- ﴿ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِى عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ (الزمر: ٢٨)

"قورئانێکی عەرەبی بێ گرێ و کۆڵە، تا خۆ دوور بگرن لە خراپە".

٧- ﴿ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ﴾ (فصلت: ٣)

"ئەم قورئانە کتێبێکە، کە ئایەت - نیشانەکانی وا شرۆڤە و لێدراونەتەوە بە زمانی عەرەبی بۆ ئەو قەومانەی دەزانن بخوێننەوە".

٨- ﴿ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ۖ ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ ﴾ (فصلت: ٤٤)

"گەر قورئانمان بە زمانی ئەعەجەمی بناردایە.دەیانبێژی چۆن نیشانەکانی تەواو شی نەکراینەوە. ئەرێ ئەم قورئانە عەرەبیە و نیشانەکانی

ئەعەجەمین؟....."

٩- ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۚ فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ ﴾ (الشورى: ٧)

"هەروەها قورئانێکی عەرەبیمان بۆ ڕەوانەکردی، تاکو خەڵکی مەککە و خەڵکی دەوروبەری لە ڕۆژی کۆبوونەوە بترسێنی..."

١٠- ﴿ إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٣﴾ ﴾ (الزخرف: ٣).

"ئەم قورئانەمان کردە عەرەبی، بەشکو عەقڵی خۆیان بەگەڕ بێخن"

١١- ﴿ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾ ﴾ (الأحقاف: ١٢).

"پێش قورئان، کیتابی موسا ڕابەر و بەزەیی بەخشین بوو، ئەم کتێبە بە زمانی عەرەبییە بۆ ترساندنی ئەوانەی ستەم دەکەن، هەروەها مژدەیە بۆ پیاوچاکان".

ئەو هەموو یازدە ئایەتە، قسە لە سەر زمانی دەق دەکەن، نەك نەتەوەیەکی دیارکراو، هەروەها ئایەتەکانی بۆ هەموو گرۆهی مرۆیی، ئەوانەی ستەم دەکەن، ئەوانە پیاوچاکن، ئەوانەی خوێندەوارن، ئەوانەی مەککەین، هەروەها ئەوانە لە دەرەوەی مەککە دەژین....

لە لایەکی دی، بۆ ئیسپاتکردنی زمانی قورئان، زمانی دەقی ئیلاهیە و کە هیچ کێماسی و کەلێنی سیمانتیکی و گرامەری هەڵناگرێت، نەك زمانی نەتەوەیەك حزوری زمانی خوێندنەوە لە نێوان زمانی دەق و زمانی نەتەوەیە.

خوێندنەوەی قورئان هەڵگری پرۆسەی تەجویدە، هەتا بەهای هەر پیتێکی قورئان بدەی، کەچی ڕۆمانی عەرەبی، درامای عەرەبی، هەتا شیعری عەرەبی خاوەن ئەو ئەدگارەی تەجوید نییە، هەروەها لە پەروەردە و زمانی ڕۆژانە، ئەو ئەدگارە قورئانیە غائیبە.

دکتۆر عوسمان محمد (٢٠١١)، (ل ٤٧) لە کتێبی (اشكالية الترادف) و ئەندازیار عوسمان (٢٠١٤) لە لاپەڕە (٩) و (١٠) ی کتێبی (فراوانی مانا

لە قورئانا) دەنووسێت: "لێکۆڵەران دەڵێن: لە قورئاندا هەموو پیتێك ئەوەندە بە دیقەت بەکارهاتووە، تەنانەت تاقە پیتێك زیادە نییە، بۆیە ئەگەر پیتەکانی سورەتی (نوح) بژمێرین، دەبینین: (٩٥٠) پیتە، کە دەکاتە تەمەنی مانەوەی، یا تەمەنی حەزرەتی (نوح) سەلامی خوای لێبێت."

لە لایەکی دی، وشەکانی قورئان هەڵگری چەند بەڵێنێکی کردمین، چونکە خاوەنی ئەو بەڵێنانە، زاتی خودا، کە توانای موتڵەقی هەیە، دەتوانێ بە شتێك بڵێ: ببە دەبێ. هیچ دەقێکی دی مرۆ کردە ئەو توانا ئیلاهیەی نییە.

هەر ئەندازیار عوسمان لە لاپەرە (١٠-١٥)ی هەمان کتێبی سەرەوەدا ئاماژە بۆ دیاردەی پۆلیسیمی- فرەواتایی وشەی قورئان دەکات، لەو بارەیەوە دەنووسێت: " کۆمەڵێ لە فوقەها و ئسوڵیەکان لە نێوانیاندا: ئیمام مالیك و ئیمام شافیعی رایان لە سەر ئەوەیە: ئەگەر ئایەتێك زیاتر لە یەك مانای دا بە دەستەوە و دژایەتی نەبوو لە نێوانیاندا و، بەڵگەیەك نەبوو، کە بە لایەکدا ساغی بکاتەوە، ئەوا ماناکان دەکرێ هەموویان مەبەست بن، کە ئەمەش جۆرێکە لە رەوانبێژی...". ئەم دیاردە سیمانتیکی و ریتۆریکیە، هێڵی یەکلاکەرەوەن، کە وشەیەك هەڵگری ئەو هەموو واتایە بێت.

دکتۆر عوسمان محمد غریب لە کتێبی: (اشکالیه الترادف في القرآن الکریم) دا باس لە هەژموونی وشەی هاوواتایی لە قورئان دەکات. دیاردەی هاوواتا، ناسنامەیەکی تایبەت بە قورئان دەدات، کە لە ئاخاوتنی عەرەبی بەو شێوەیە نییە، چونکە وشەی قورئان بە ئەندازەیەك داندراون، جیاوازن لە هەر زمانێك. جیاوازی ئەندازەیی دەقی ئیلاهی، رەمەکی دەقی مرۆکردە لە بواری پەیوەندیە واتاییەکان، هەموو توێژەرێکی زمانی مەندەهۆش کردووە..

لە دیدارێکی تایبەت لەگەڵ دکتۆر عوسماندا لە شەوی (٢٨)ی ئابی (٢٠١٤)دا باسی لە چەندەها حاڵەتی بیژۆك لە زماندا وەك (زوجة) لە زمانی عەرەبیدا، غایبوونی لە زمانی قورئانیدا، هەروەها حاڵەتی هاودەنگی قورئانی لە نێوان هەردوو وشەی (امرأة) و (امرأت) بە مانای جیاواز، کەچی ئەو جیاوازیە لە زمانی عەرەبی نییە."

لە لایەکی تر ئەدگارێکی تر، کە زمانی دەقی ئیلاهی لە زمانی نەتەوەیەکی دیارکراو جیادەکاتەوە، بوونی تەجویدە - جوان خوێندنەوەیە لە دەقی ئیلاهیدا، غایب بوونی ئەو حاڵەتەیە لە زمانی نەتەوەی عەرەبیدا.

تەجوید لە لاپەڕە (٦)ی کتێبی: "فێربوونی زانستی تەجوید" لە ڕووی زمانەوانی و زاراوەوە پێناسەی تەجوید کراوە، کەواتە (تەجوید) لە زمانەوانیەوە بریتیە لە: "جوان کردن و چاك کردن" لە ڕووی زاراوەش بریتیە لەو "زانستەی کە ئەو ئەحکام و بنچینانە ڕوون دەکاتەوە، کە پێویستە (لە کرداری تەجویددا) دەستیان پێوەبگیرێ و جێبە جێ بکرێن لە کاتی خوێندنەوەی قورئان بەو شێوەی، کە موسڵمانان لە پێغەمبەریان وەرگرتووە."

لە کرداری جوان خوێندنەوەی قورئاندا، شوێنی دروستبوونی دەنگەکان (place of articulation) و شێوازی دەنگەکان (manner of articulation) هەروەها تەواو شارەزا و چەکدارکرابین بە ئۆرگانەکانی ئاخاوتن (organs of speech) وەك زمان، بۆشایی دەم و قورگ، گەروو، لێوەکان، بۆشایی لووت و دەنگدار و کپی دەنگەکان.

ئەو هەمووە بەشداری دەکات لە ڕەوشی پیتەکانی وشەکانی قورئان، هەروەها لە کرداری خوێندنەوەی تەجویددا، جگە لە ناسنامەی پیتەکە، کۆنتێکستی پیتەکە (شوێنی هاتنی پیتەکە) ڕەچاو بکرێت، هەتا بۆ نموونە: مەد (درێژکردنەوەی پیتی هەمزە و واو و یا) دروستبێت.

لە زمانی عەرەبی، دەقی عەرەبی مرۆکردەدا وەك: شیعر، ڕۆمان، دراما.. شاردنەوە، ئاشکراکردن، شەددە- دوو پیت کردن، شلی - خاوی لە گۆکردن، بەرز و نزم کردنەوەی پیتەکان...فیکە لە گۆکردن - سس، قەلقەلە، لادان.. نییە، کەچی هەموو پێکهاتەکانی تەجوید لە زمانی قورئاندا مەرجی کیفایەن.

## دەرئەنجامی بەشی زمان لە قورئاندا:

زمان لە قورئانی پیرۆزدا زۆر گرینگە، چونکە هەڵگری شوناسی جیاکەرەوەی نەتەوەیەکە لە نەتەوەیەکی تر، هەروەها دەلالەت لە گەورەیی خودا دەکات: چۆن زبان (پارچە گۆشتێکی ناو دەم) شوناسێکی ئەتنیکی هەڵدەگرێ؟ ئایا چۆن

ئەو مەخلوقە لە ناو کۆمەڵگادا بە جڤاکی و نەتەوەیی دەکرێ؟ زمانی دەقی ئایەتەکانی قورئان تەواو زمانی سیکیولەری نوخبەوی عەرەبی لە لایەك و لە لایەکی دی کوردی دادەخەن، چونکە ئایەتەکان پێیان دەڵێت، کە زمانی قورئان زمانی دەقی ئیلاهیە، نەك زمانی نەتەوە. ئەو زمانەی قورئان هەڵگری چەند ئەدگارێکی زمانەوانی و جوان خوێندنەوەیە، کە لە زمانی ئاخاوتنی عەرەب وەك نەتەوە غائیبە.

لایەکی دی، توێژینەوەکە بەیانکردنی ئەو ڕاستیە بوو، کە (عربی) ناو قورئان شوناسی زمانی قورئانە، نەك نەتەوەیەکی تایبەتی وەك عەرەب، هەر ئەمەش وایکردووە کەسی غەیرە عەرەب وەك: کورد و فارس و پاکستانی... زۆر بە ئاسانی زمانی قورئان فێربن، درەنگ ئاخاوتنی عەرەب، وەك نەتەوەیەك فێربن.

ئێمە وەك توێژەر قسە لە سەر دەق دەکەین، هەقمانە بپرسین: لە کام ئایەت خوای گەورە پەسەندی نەتەوەی عەرەب لە سەر نەتەوەی تر دەکات ؟

کەواتە: بەعەرەبکردن، یانی چی ؟

ئێستا هەقی ئەوەیە بە پێوەری قورئان وەك دەقێکی کەلامی و (سیرە) وەك قورئانێکی کردەیی ماستەرنامەکە، شەن و کەو بکەین .

لە (ل٧)ی ماستەرنامەکەدا دەردەکەوێت: پرۆسەی بەعەرەبکردن ماوەی حوکمڕانیەتی هەر چوار خەلیفەی ڕاشیدی گرتۆتەوە وەك لە دێری یەکەم دەنووسێت "بابەتی (بەعەرەبکردن لە هەرێمە کوردنشینەکاندا (١٦-٢٣٢) ی کۆچی )، لێرەدا تەنیا ئاماژە بە قسەیەکی خاوەن ماستەرنامەکە لە (ل٧) دەکەم : " لە توێژینەوەکەماندا پشتمان بەستووە بە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی مێژوویی لە سەر بنەمای لێکدانەوەی دەرئەنجام، ئەویش لە ڕێگای خوێندنەوەی ئەو سەرچاوە ڕەسەنانەی کە تایبەتن بە سەردەمی ئیسلامی....!

نزیکترین سەرچاوەی فتوحاتی ئیسلامی، بۆ نموونە: طبری لەماوەی (٢٢٤-٣١٠) کۆچی ژیاوە، ئیبن ئەسیری جەزیری لە (٦٣٠)ی کۆچی مردووە، (ابن کثیر) لە (٧٧٤)ی کۆچی مردووە، ئەو سەرچاوە ڕەسەنانە چەند ساڵ دوورن لە مێژووی ڕوداوەکانی (١٦)ی کۆچی ؟؟؟ میتۆدی زانستی

لە کوێیە ؟

لە (ل١٣)دا بۆ پێناسەی چەمکی بەعەڕەبکردن، هانا تەنیا بۆ کتێبێکی د.خلیل ئیسماعیل نووسراو لە (٢٠٠٣) دەبات، دەپرسم: بۆ پێناسەکردنی تەعریب(عەرەبایەتی) تەنیا هانا بۆ کتێبێك دەبات، کە ناونیشانەکەی قسە لە سەر سیاسەتی بەعەرەبکردن و کۆچ پێکردن لە هەرێمی کوردستان دەبات ! ئایا تەنیا هەرێم تووشی بەعەڕەبکردن بوو ؟ یان ئەو بەعەرەبکردنە لە سەردەمی (سایکس — بیکۆ) و (لۆزان) قەوما؟؟

هەر لە (ل١٣) دا، کە دەکاتە یەکەم لاپەڕەی ماستەرنامەکەدا بەشێك لەو ئەنجامەی پلانی بۆ داناوە، گەیشتۆتێ وەك دەنووسێت: "شاڵاوەکانی فتوحاتی ئیسلامی، کە لە سەردەمی خەلیفە (عمر)دا ئەنجام دران، لەگەڵ خۆیاندا هۆزە عەرەبەکانیان بەرەو ناوچەکانی جیهانی کۆن گواستەوە، چونکە لەو کاتەدا زیاتر رەگەزی عەرەب ئەرکی بەڕێوەبردن و کارگێڕی و سەربازییان لەدەست دابوو."

نووسەر هەر لە پێشدا بڕیاری ئەوەیداوە، کە فتوحاتی ئیسلامی بریتیە لە: شاڵاوبردن، وشەی شاڵاویش لە (ل٤٦٥) فەرهەنگی (هەنبانەبۆرینە) بە پەلامار پێناسە دەکات .

دکتۆر قەزازیش لە (٣٧١)ی فەرهەنگی (شارەزوور)، وشەکە بە هێرش، بە تایبەتی هێرشی سەگ و گورگ و پەلامار دادەنێت ." ئەوە لە ڕووی وشەوە، لە ڕووی مێژووش، ئەوەی شارەزای (١٦)ی کۆچی بێت، دەزانێت موسڵمانی عەرەب، تەنیا بە (١٦) ساڵ هێندە بە هێز ببوون، توانیبوویان، کە شەڕی دوو ئیمپراتۆریەتی ساسانی و ڕۆمی بکەن ...بە ڕاستی ڕستەی "لەو کاتەدا زیاتر رەگەزی عەرەب ئەرکی بەڕێوەبردن و کارگێڕی و سەربازییان لەدەست دابوو." زیاتر لە خەیاڵ و ئەندێشە دەچێت، نەك گواستنەوەی فاکتی مێژووی سەردەمەکە .

لام سەیرە! وتەیەك دەهێنێتەوە، هەر خۆیشی وەڵامی خۆی دەداتەوە.
ڕستەی: دەبوایە پێش هەڵکەوتنیان لە ڕووی زمانەوانییەوە ببوونایە بە عەرەب. ئەو وتەیە هەمان وتەی (جەمال نەبەز) نییە، گوایە: پێغەمبەر پێناسەیەکی

دی بۆ بەعەرەبکردن دۆزیتەوە، نەك لە ڕووی بایۆلۆژیەوە، بەڵکو ئاخاوتنەوە، لەقەبی شورەتی کوردی، شەهرەزووری، ئیبن خەلەکان، دینەوەری ...وەڵامی دروستی ئەو بۆچوونە سەقەتە دەداتەوە .

لە (ل١٤) دا لە پەرەگرافی سەرەوە ئاماژە بەوە دەکات، کە جەنگاوەرەکانی موسڵمانان لە کاتی جەنگدا خێزانەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد. لێرەدا هەڵەیەکی پڕ سەیر و سەمەرە هەیە . کاك ڕەحیم لە پەراوێز دەنووسێ، کە ئەم زانیارییە لە (ل ٢٧٦-٣٢٤)ی کتێبەکەی (بەلازری) وەرگیراوە.

یەکەمجار لاپەڕە (٢٧٦) باسی ئەم بابەتە ناکات، (ل٣٢٤) یش هەر بوونی نییە، چونکە کتێبەکەی (بەلازری) تەنها (٢٨٦) لاپەڕەیە!!!

ئەو عەرەبەی ئەوسا، بۆ ئەقلیم جیبال و ئەقلیم فارس هاتبوو، بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام بوو ...نازانم ئەو (٤-٥) هەزارەی دکتۆر(عبدالله مصطفی) باسی دەکات، چۆن لە پرانسیپەکانی ئیسلامی دەگەیشتن، گەر ئەو عەرەبانە وشە سادەکانی ئیسلامیان بۆ کورد و فارس ڕوون نەکردبایەوە؟ ...

لە کاکی ئەکادیمی دەپرسم: ئەو عەرەبانە بە زمانی جەستە و زمانی چاو و زمانی ئاماژە پرانسیپەکانی ئیسلامیان بۆ کورد و فارسەکان ڕوونکردبایەوە؟؟ خۆت وەڵامی خۆت بدەوە ! هەروەها گەر ئەو عەرەبانە هاوسەری خۆیان لەگەڵ خۆیان نەبردبا، دەبوو کچی کورد بێنن، ئەوساش دەتوت : بەعەرەبکردن لە ڕێگای هاوسەرگیرییەوە ؟

لە (ل١٤)دا دەنووسێت : "زمانی عەرەبی، زمانی زانایانی ئەو سەردەمە بوو لە سەرجەم بوارەکاندا ." ئایا زمانی لاتینی لە دوای گرتنی (یۆنان) بە هەر چوار شێوەیەوە، کە بریتین لە :

١- زمانی لاتینی کلاسیکی .
٢- زمانی لاتینی ڤولگار .
٣- زمانی لاتینی مەسیحی .
٤- زمانی لاتینی ڕێنیسانسی .

ئایا لاتینی لە تەواوی ئەورووپا زمانی ئایین و ئەدەب و سیاسەت و کەنیسە نەبوو؟ کورد خۆی کەمتەرخەم بوو بەرانبەر نەتەوە و زمانەکەی، ئەگینا قورئان

زۆر بە ڕاشکاوی باسی زمانی نەتەوە و نەتەوەی جیای کردووە. لە سەرێکیشەوە کورد ناهەقی نەبوو، چونکە (١٣٠٠) ساڵ دیلی (فارس) و (ئەشکانی) بوو !

لێرەدا دەپرسم: گەیاندنی قورئان بە کورد، دەچێتە خانەی بە عەرەبکردنی زانستی ؟ براله! ئەخمینی و ساسانی، هەموو کەلتووری کوردی دزی بوو، نازانم کورد چی مابوو، تا عەرەب بەعەرەبی بکات !

لە (ل١٥) دا کورد خۆی هۆکاری بە عەرەب بوونی خۆی بووە، شەرەفخانی بدلیسی لە (شەرەفنامە) باسی کۆمەڵێك میر دەکات، کە ڕەگەزی خۆیان دەبەنەوە سەر عەرەبی سەحابە، بەڵام دەربارەی ڕایەکەی (مەسعودی) هیچ ناڵێم، چونکە شیعەیەکی توندڕەوە و، چەندی پێی کرابێ، مێژووی ئیسلامی گۆڕیوە .

نازانم کاکی ئەکادیمی، چۆن لە هۆزە هەڵگەڕاوەکان گەیشتووە ؟ ئەوانە زۆربە، دوای وەفاتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە (١١) ی کۆچی و سەردەمی حوکمڕانی ئەبوبەکری صدیق هەڵگەڕانەوە، نازانم چۆن لە سەردەمی عومەرەوە بەشداری فتوحاتیان کردووە. ئەوە دیتنەکەی (بلیخانۆف) نییە، کە تێڕوانینێکی ماددی بۆ مێژوو هەیە . کاك (ڕەحیم) بە پیتبوونی ناوچە فەتحکراوەکان و غەنیمە، دەکاتە بیانوویێك بۆ فتوحاتی ئیسلامی.

لە کاك (ڕەحیم) دەپرسم: چەند دیل لە مێژووی ڕاشدین کوژراون؟ تەنیا ئەوانە نەبێت، کە تاوانباری جەنگن؟ دیل و تاوانباری جەنگ دوو شتی لەیەك جودان.

(ل١٦) لە (جۆرجی زێدان) و (حوسێن عەزیز) دەگوازێتەوە، بۆیە هیچ قسە لە بارەی (جۆرجی زێدان ناکەم . شتێکی خەیاڵی لە (د.حوسێن) دەگوازێتەوە: "لەبەرئەوە کاتێك ئایینە ئاسمانییەکان داهاتوون، زمانی ئایین کارێکی زۆری لە زمانی نەتەوەییەکان کردووە ."

ئەوەی ئەلف بای زمانی ئایینەکان بزانێت، قسەی ئاوا ناگوازێتەوە، دەزانی بۆ؟

کۆرش کاتێ (میدیا)ی داگیر کرد، زمانی (ئاڤێستا)ی هەروەك خۆی هێشتەوە. لەمە زیاتر، پێشتر هەموو ئایینەکان، تەنیا بە زمانی قەومی بوو،

هەروەها تەنیا بۆ یەك نەتەوە بوو، جا زمانی ئایین و زمانی نەتەوە، یەك زمان بوو!!!

## دووڕەگ لە کۆمەڵگا..؟

جەمال نەبەز (١٩٨٤)،(ل٣٢ و ١٩٩٧ ...)لە کتێبی دی، قسە لە سەر (هەجین - دووڕەگ) دەکات، (ڕەحیم) لە (ل١٧) دا ئاماژە بە هەبوونی (هەجین) دەکا لەپاش فتوحاتدا . هەر کاك (ڕەحیم) لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا دەگوازێتەوە، کە دایکی یەکێك لە خەلیفەکانی ئەمەوی، کورد بوو . جەنابت چۆن لە کەنیزەك گەیشتوویی؟ با بزانین فەرهەنگە کوردیەکان چۆن باس لە کەنیزەك دەکەن .

شێخ موحەممەدی خاڵ لە (ل٣٨٥)ی چاپی ئاراس دەربارەی (سینۆنیم) ی کەنیزەك دەنووسێت: کارەکەر، گیو موکریانی لە (ل٧٥٧)ی فەرهەنگی کوردستان دەنووسێت: کەنیزەك یانی: کەنیز، کارەکەر،کلفەت، قەرەواش، هەروەها هەژار موکریانی لە (ل٦٧١)ی (هەنبانە بۆرینە) دا دەربارەی کەنیزەك دەنووسێت : کەنیز قەرەواش، خدامە، ژنی بە پارەکڕدراو."

جا کەنیزەکێك ببێتە هاوسەری خەلیفە و دایکی خەلیفە، دەبێ چ پایەکی هەبوو بێت ؟ ئەی وەك (داعش) ئەم دەست و ئەو دەستی پێبکرێت؟

لە لایەکی دی، کەنیزەکی وا هەبووە، چەندان پیاوی مەعریفەدار، نەك تەنیا نێر لە بن دەستیان خوێندووە، وەك (عبدالمقصود) (٢٠١١)، (ل٩٨) ئەلموقری دەگوازێتەوە، کە کەنیزەی "موتریف" لە (مەولا)ی خۆی، زانستی

ڕێزمانی عەرەبی- نەحو - فیقهی ئیسلامی فێر بوو ..... تاکو بوو بە زانایێکی بەناوبانگ لە عروزی شیعردا، دواتر ناوی بە العروضية - عەروزناس دەرکرد، کۆمەڵێك زانا هەردوو کتێبی پڕ بایەخی: (الكامل)ی (موبەڕید) و (النوادر)ی (قالی) یان لە لا خوێندووە."

کەواتە: کەنیزەك، تەنیا لە زهنی هەندێك دا، مەدلولی خراپی هەیە، ئەگینا لە کۆمەڵگا بۆتە دایکی خەلیفە، هەروەها لە بواری مەعریفەش، بۆتە زانا و چەندان زانای پیاو، لایان خوێندووە.

## بەعەرەبکردنی شاری کوردی :

سەیرم بەم ناونیشانە دێت! یەکێ نەزانێت، ئەو شار و گوندی کوردی، هەموو ناوی کوردی هەبووە، موسڵمانە بەرابیەکان هاتوون هەموویان بەعەرەبکردووە !

پاش کودەتای (کۆرش) لە سەر ئەستیاگی دوا پاشای میدیا، کوردستان، هەتا ئاشنابوونی بە ئیسلام، لە ژێر دەستی داگیرکەری وەك: (ئەخمینی و ئەسکەندەر و خەلیفەکانی و ئەشکانی و ساسانی) دابووە، بۆیە زۆربەی شار و دێهاتەکانی بە ناوی خۆی نەبووە .

کاك ڕەحیم لە (ل١٧-١٨) و (٩١-١٠٨) قسە لە سەر بەعەرەبکردنی شار و دێهاتی کوردی دەکات .

جیاوازی زمانی عەرەبی لەگەڵ زمانی کوردی، پرسێك نییە پەیوەندی بە خۆ سەپاندن هەبێت، چونکە هەندێك دەنگ لە زمانی کوردی هەیە وەك: | پ، چ، ژ، ڤ، گ، ڵ، ڕ | لە زمانی عەرەبی نییە، بە هەمان شێوەش چەند دەنگێك لە زمانی عەرەبی هەیە وەك: | ض، ظ، ذ ...| ث | لە زمانی کوردی نییە.

چۆن گۆڕینی ئەو وشە کوردیانەی بەو دەنگانەی سەرەوە دەستپێدەکەن، بەعەرەبیکردنی وشەی کوردییە، بە هەمان شێوەش، کورد هەرسێ دەنگی: (ض، ظ، ذ) دەکاتە (ز)، وەك: (زەمیر)، (زاڵم)، (ئازار) ( مانگی سێ) کە

هەموو لە (ضمیر، ظالم، اذار) ی عەرەبی وەرگیراون، ئەوەش کورداندنی وشەی عەرەبیە!

وەك گوتم، پرسەکە پەیوەندی بەوەرگرتنی وشەوە هەیە، نەك سەپاندنی ڕەگەزی! لە لایەکی تر، چۆن هەندێ وشە تەکنەلۆژیای سەردەم لە وڵاتە بەکارهێنەرەکان، نەك بەرهەمهێنەرەکان، هەر ناوی خۆیان هەیە وەك: (تەلەفزیۆن، سی دی، ئەنتەرنێت، ئای تی، ... هەروەها سی ڤی، ڤیپ..) ناوی زانستەکان وەك: (ماتماتیك، کیمستری، فیزیا، بایۆلۆژی)، کەسیش ئەو وشانە بە داگیرکاری مەعریفی، یا ئامێری لە قەڵەم نادات، بەڵام ئەوی داگیرکاری کەلتوورییە، ئێستا عەرەبی ئاوارە چەندان هوتێل و موتێل بە ناوی: (بغداد، نجوم بغداد، عشتار، ...) بە ڕەزامەندی حکومەتی کوردی لە باشووری کوردستان دەکات، ئەگەرنا زمانی ئینگلیزی پڕیەتی لە وشەی بیانی، بە جۆرێك لەوانەیە ئەو وشە بیانیانە بە قەد وشەی خۆی بێت.

لە (ل١٧) و (٩٣) باسی قەبیلەی (بەکر) و (موزەڕ) دەکەی ...هاتنی ئەوانە،چ پەیوەندی بە فتوحاتی ئیسلامیەوە وەیە ؟؟؟ دکتۆر (صالح العلی) لە (ل١٣٣)ی کتێبی: (محاضرات في تأريخ العرب) دەڵێت: ((هەردوو قەبیلەی: (موزەر و رەبیعە) لە قەبیلەکانی باکوورن، کە ناسراون بە عەدنانی، هەروەها دەڵێت: قەبیلەی (موزەر) گەورەترە لە (بەکر)، چونکە ئەوان (٧) بەرەباب بوون، کەچی بەکر تەنیا دوو ."

(هینری فیلد) لە (ل٢٥)ی (جنوب کوردستان) باسی هۆکاری هاتنی کۆچەری عەرەب بۆ کوردستان، لەیەك نزیکی سنوور و پاوان بوو بۆ بەخێوکردنی مێگەڵ.

کەلسومە جەمیل لە (ل ١٠٥) لە (ل ٥٤)ی (ئیستەخری) دەگوازێتەوە: ((بالجزيرة مفاوز - اطراف الصحراء - يسكنها قبائل من ربيعة و مضر أهل خيل و غنم و إبل عندهم أقل)).

برا! دەزانی (یاقوت الحموی) و ئازاد دێرکی، چ دەڵێن ؟؟ هاتنی ئەو قەبیلە عەرەبیانە لە پێش ئیسلام بووە ؟؟؟؟ لەوەش زیاتر هەر شەڕێك قەوما بێت، لە

نێوان ئەو (بەدوا)نە و دەسەڵاتی ساسانی بووە !!

لە (ل٢٩)ی (ئیبن حوقل) دەگوازیەوە، کە عەرەب هاتوونە بۆ (جەزیرە) و (دیار بەکر)، بەڵام باسی (ل٢٣٦) ی (ئیبن حوقل) و (٢٢٧)ی (یاقوت حەمەوی) ناکەی، کە قەبائیلی کوردی چوونەتە پاوانی عەرەبی و پاوانی فارسی. ئەو پاوانی یەکترکردنە بۆ لەوەڕاندن بووە، نەك هەژموونکاری، ئەگەرنا، ئازاد دێرك، (ل١٤): (جەزیرە) لە مێژوودا، گۆڕەپانی هەڵمەتەکانی یۆنانی و ڕۆمانی بووە، هەروەها موسڵمانان بۆ فەتحکردنی، دژواریەکی زۆریان بینیوە .

کورتەی قسان، دەربارەی ناولێنانی (ئامەد) بە (دیار بەکر)، دوور و نزیك، هیچ پەیوەندی بە فتوحاتی ئیسلامیەوە نییە، بەڵکو تەنیا بۆ شێواندنی مێژوو قسەی لە سەر دەکرێت .

لە (ل٩٣ -٩٤) باس لە هەردوو ناوی: (ئەسەد ئاباد) و (کسمادران) دەکات، (ئەسەد ئاباد) پێشتر ناوی: (شێراوە) بێت یان نا، چ پەیوەندی بە فتوحاتەوەیە؟ هەروەها ناوی: (کسمادران)، چ پەیوەندی بە ناوی کوردیەوەیە؟؟ ناونانی چیایەك بە (سن سمیرە) بۆ ماوەیەکی کاتی، ئەوە چ تەعریبێکە ؟

کاك (ڕەحیم) ناڵێ: ئەو چیایە پێشتر، چ ناوێکی کوردی هەبوو ؟؟ ئەو ناوە، مەدح بوو، یا وەسفی ددانی (سەمیرە) بوو، فەرموو، (یاقوت حەمەوی) چ دەڵێت: "سن سميرة بكسر أوله وتشديد النون وسميرة بلفظ التصغير قال ابن السكيت في تفسير قول كثير على كل خنذيذ الضحى متمطر وخيفانة قد هذب الجرى آلها وخيل بعانات فسن سميرة لئلا يرد الذائدون نهالها قال ابن حبيب عانات بطريق الرقة و سن سميرة جبل من وراء قرميسين يسرة عن طريق الماضي إلى خراسان قالوا مرت جيوش المسلمين تريد نهاوند بالجبل الطويل المشرف على الجبال فقال قائل كأنه سن سميرة وسميرة امرأة من المهاجرات من بني معاوية بن كعب بن ثعلبة بن سعد بن ضبة كانت لها سن مشرفة على أسنانها فسمي ذلك الجبل بسنها ..."

گەر ئەوسا (ئالیپ)ی لە دەست دابێ، بوو بێتە کەرمینشانی ئەخمینی؟ جا ببێتە (قرمسین کەرمنشاه) چ لە مەسەلەکە دەگۆڕێ؟ جا گەر شار (کرمیشان) بێ، دەبێ چیایەکە، چ ناوێکی کوردی هەڵگرتبێت ؟؟

ئەو ناوانە هیچی کوردی نین، هەتا وشەی (کرمنشاه) ؟ عوبەید سەخابی (٢٠١٣) لە (ل١٥١) لە داکیوۆمێنتەکانی: (ئاشووری و عیلامی و هێخامەنیێ) شدا بە ناوی: (ئالیپی)، (ئالێبی) نێوی هاتووە.

لە زەمانی ئەخمینیەکانیش: (کامبادن، کارمیسین و کارمیشین و کرمینشان)، لە زەمانی فەتحی ئیسلامیش: (قرمیسین)، بەڵام بە حوکمی ئەوەی کوردی (کەرمنشاه) زۆربە شیعەن، دوور بووە لە ناوی کوردی . گەر شاری (کنجه)، یا (گەنجە) بۆ (جنزه) (فەتحە لەسەر ج ) بەعەرەبکردن بێت، ئەوا وشەی: ( وخت - وقت) و (قوتابی - کتابی ) (ئیزن - اذن ) بە کوردیکراون، هەوادارانی پەتیزم دەبێت لە فەرهەنگی کوردی فڕێیبدەن !!

گۆڕینی وشەی (بردعه) و (داراب کرد) هیچ پەیوەندی بە پرۆسەی بەعەرەبکردن نییە، جاریێ هەردوو وشە کوردی نیین، هەروەها گۆڕانکاریەکە گۆڕانکاری زمانییە، نەك گۆڕین بە نیەتی بەعەرەبکردن .

گۆڕینی ناوی شاری (نەهاوەند) بۆ (ماه البصرة) چ جۆرە بە عەرەبکردنێکی لە خۆ گرتووە، کە وشەی ( ماه ) خۆی فارسی بێت؟ لە لایەکی تر (ماه بەصرا) هەر تەنیا (نەهاوەند) ناگرێتەوە، بەڵکو (نەهاوەند) و (بروجرد) و (قم) .

"سورخابیێ (٢٠١٣) لە (ل٢٤١) و (٢٤٤): (بروجێرد) شارێکە لە شارەکانی پارێزگای (لورستان)، هەرێمەکە زۆر نزیك بوو لە دەسەڵاتی ساسانی، دوای هێرشی عەرەبەکان لە سەردەمی ئیسلامەتیدا بە چەند ناوێك ناسرا: (جیبال، لوڕی بچوك، پێشکووە و لوڕستان).

لە (ل٩٧) دا دەنووسێت : " کوهستان بۆ بلاد الجب" چ پەیوەندی بەعەرەبکردنی ناوی کوردیە وەیە، ئیێ خۆ (کوهستان) وشەیەکی فارسیە. ماجید مەردۆخی لە (ل١١٢٤) ی فەرهەنگی (فارسی - کردی) دەڵێت: (کوهستان) وشەیەکی فارسیە بە نێوی: (کوێستان، کێوات، زۆزان، کۆسار ...)دێت."

چاوەڕێم دەکرد لە (ل٩٨) باسی ئیتیمۆلۆژی وشەی: (فرات) و (دجلة) بکات. دەگوترێت: هەردوو وشەکە لە (فرەهات) و (دەچڵە) هاتوون. دکتۆر

جەمال نەبەز لە (ل١٣٨)ی (وشەنامەکی...) دەربارەی ئیتیمۆلۆژی (فرات) دەنووسێت: دوور نییە وشەکە یۆنانی بێ و لە (پارا - بۆتامیا)وە هاتبێ، کە مانای دەوروبەری ڕووبار دەگەیەنێت."

لە پرسی ناوی: (نەهاوەند و هەمەدان - همذان - و ئەصفەهان - اصبهان) عەرەبایەتی لە کوێیە؟ (نوح) پێغەمبەر، چەندان ساڵ پێش پرۆسەی (فتوحات) هەبووە، هەروەها ڕەگی هەبوونی ناوی نەوەکانی لە کوردستان، چ لە ڕووی ئایینەوە، چ لە ڕووی شوێنەوارەوە، شتی حاشا هەڵنەگرن، ئەمەو دەوترێ: شاری ( شرناخ ) لە شاری (نووح)ەوە هاتووە .

لە (ل٩٨-٩٩) دەنووسێت: "ناوی شاری (حولوان) لە ناوی (حلوان بن عمران الحاف) هاتبێت ...چ پەیوەندی بەعەرەبکردنەوە هەیە، تۆ بەپێی تایتلی نامەکەت، باسی بەعەرەبکردن لە نێوان ساڵی (١٦-٢٣٢)ی کۆچییە، کەچی (حلوان بن عمران) لە سەردەمی ساسانی ژیاوە !!!

لە (ل٩٩) دەردەکەوێت، کە خاوەنی ماستەرنامەکە، تەواو لە ستراتیژیەتی بە عەرەبکردن نەگەیشتووە. بەعەرەبکردن واتای: گۆڕینی دیمۆگرافیای ناوچە، ئەویش بەراگواستنی خەڵکە ڕەسەنەکەی و جێگیرکردنی مرۆڤی عەرەب .

دکتۆر سلێمان عبدالله، (ل٤) و دکتۆر حمید عبدالله لە (ل٣٣-٣٤) ی ماستەرنامەکەی، بە جیا قسە لە سەر بەرهەمی بە عەرەبکردن دەکەن، کە ناوچەکە شوناسی ڕەسەنی خۆی لە دەستبدات. "دکتۆر حەمید لە (ل٢٣-٢٧) باسی مێژوو دەسەڵاتدارێتی کەرکوك دەکات، وەك: (گوتی، ئاشووری، مادەکان، هەخامەنشینەکان، مەکدۆنی، ساسانی، ئیسلامی ... مەغۆلی)، هەتا سەردەمی مەغۆلی بە ناوی: (ئارابخا) و (کرخێنی) ناسراو بوو، دوایی (١٢٥٨-١٣٢٢) بووە (کەرکوك) ."

کەرکوك و موصل، دووچاری بەعەرەبکردن بوونە، چونکە خەریکە شوناسی کوردی خۆیان لە دەست دەدەن، بەڵام وەرگێڕانی ناوی گوندێك لە (هەشتایین) بۆ (الثمانین)، واتای بەعەرەبکردن نادات، چونکە لەوانەیە ئەو ناوە، خۆی فارسی بێ، چۆن کوردیە؟ ماجید مەردۆخی لە (ل١٤٣٠-١٤٣١) باس لەوە

دەکات، کە وشەی وەك :(هەزار، هەشت، هەشتا) چۆن کوردینە، ئەوهاش فارسین.

"گوند و شاری کوردی، بەشێك بوونە لە ئیمپراتۆریەتی ساسانی، یا رۆمی، بۆیە تەواو رێی تێدەچێ، ساسانییەکان ناوی (هەشتایین) وەك ناوێکی فارسی هێشتبێتەوە!

لە (ل١٠٠) باسی (سەرێ کانی) دەکات، کە ناسیۆنالیزمی عەرەبی بۆ (رأس العين) تەرجەمەی کردووە ! ئەم شارە پێشتر، چەند ناوێکی هەبووە، ئازاد دیرکی لە (ل١٧٦) باسی ناوە کۆنەکانی دەکات : (واشو کانی، سی کانی، غوزانا، جوزانا، تیودو سیولیوس، رش عینو، عین وردە،)٠

ناسیۆنالیزمی عەرەبی سوریاش لە دوای (١٩٦٠) وە کردیە (رأس العين)، چۆن (کۆبانێ)ی کردە (عين العرب)؟!! کوردیش پێی دەڵێ: (سەرێ کانی) ! ئەو تەعریبکردنە، چ پەیوەندی بە فتوحاتی ئیسلامیەوەیە؟

(نەوکرد) لە سەردەمی ئەمەوی بووە، بۆیە قسەی لەبارەوە ناکەم. هەر لە (ل١٠٠) نووسەر تەواوی ماستەرنامەکەی خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە، چونکە دەنووسێت: "هەندێك لە ناوی ناوچە کوردییەکان وەك خۆیان مانەوە، وەکو: (زۆزان، سبسر، شارەزوور،... خەلەکان، حصن کیفا).

(سیپان بنگلی)(٢٠٠٥) لە کتێبێکی (٢٨٢) لاپەڕەییدا، ماستەرنامەیەك لە سەر سەد ساڵی نێوان (٦٠٠-٧٠٠) ی کۆچی دەربارەی (حصن کیفا) دەنووسێت. لە (ل٤٣)دا لە سەرچاوە عەرەبیەکان دوو ڕای جیاواز لە بارەی فەتحکردنی ئەو قەڵایە لە لایەن موسڵمانانەوە دەگوازێتەوە، بەڵام چ ساڵی (١٩)ی کۆچی بێت، یا (٢٠) هەردووکی لە ماوەی حوکمی خەلیفە عومەر (١٣-٢٤)ی کۆچی بووە .

(عەیازی کوڕی غەنەم) بۆ ئەوەی هەردوو بەرەی عیراق و شام بەیەکەوە ببەستێتەوە، لە سەر فەرمانی سوپاسالاری سوپای فەتحی ئیسلامی لە شام، (ئەبا عوبێدەی جەڕاح) هەریەکە لە شاری: (ئامەد و میافارقین و حصن کیفا

و نصێبین و تور عابدین و ماردین و فردی و بازبدی) فەت حکرد.
ئیدارەی ناوچەکە .

دکتۆر عبدالله غەفور لە کتێبێکی زیاد لە (٧٠٠) لاپەڕە گوند و شارەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەکات لە سەرژمێری (١٩٩٦)، لە زۆربەی گوندەکاندا وشەی - ئاوا: ئاوەدانی کوردی تەرجەمەی - ئاباد-ی فارسی کراوە، هەروەها زۆربەی ناوە کوردییەکان بە فارسی کراون.
بۆ نموونە: ئەستانی کوردستان - سنە لە (ل٣٣٨-٣٣٩) (سیلاو) کراوەتە: (سیلاب) ، (ئاوباریك) کراوەتە: (اب باریك) ، (ئاشە جۆ) کراوەتە: (اسیاب جوب) ، (قوڕ و چا)، کراوەتە: (قوری چا) ، هەروەها هەتا ناوی گوندی کوردی لە ئەستانی کوردستان بە شیعە کراوە، وەك ناوی گوندی: (نەجەف ئاوا) !

**هەبوونی عەرەب لە کوردستان :**

ئەو دەمەی، دەمی ئیسلامی عەقائیدی بوو، هاتنی سەحابە بە خۆ ماڵەوە بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلام بوو بە: (کورد و فارس) .
لێرەدا سەر و بۆر و کەسرە بۆ قورئان داندرا، هەتا نەتەوە غەیرە-عەرەب بە دروستی قورئان بخوێننەوە. (زالم بن عمرو بن سفیان الدؤلي الكناني)، (١٦ ك. -٦٩ ك)، یەکەم کەس بووە سینتاکسی عەرەبی داناوە، ئەو زاتە تابعییە، بە فەرمانی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) خاڵی لە سەر پیتی قورئان داناوە، چونکە لە سەردەمی خیلافەتی (عەلی)، زۆربەی کورد و فارس هاتبوونە ناو ئیسلام، بۆیە دەبوو پەیامی قورئان بگەیەندرێتە نەتەوەی غەیرە عەرەب . لەو پرۆسەیەدا، گەورەترین زانا لە نێو کورد و فارس دروست بوون. ڕەحیم ئەحمەد ئەمین ناچارە لە (ل١٤)ی ماستەرنامەکەی، لە (ئیبن خەلدون) و (حاجی خەلیفە) بگوازێتەوە: ئەوەی تێبینی دەکرێ، کە (ئیبن خەلدون) و (حاجی خلیفە) پێ دادەگرن لە سەر ئەوەی، ئەو زانایانەی لە ڕەگەزدا ئەعجەم - نا عەرەب -ن لە ڕووی بەکارهێنانی زمانی زانستیانەوە عەرەب بوون .
یەشار کەمال لە ڕووی بەکارهێنانی زمانی ئەدەبیەوە، تورکنووس بوو، سەلیم

بەرەکات، عەرەبینووس بوو،بۆ دەربارەی ئەوانە، چ ناوترێت، چونکە سیکیولەر بوون ؟!

( لە بابەتی شرۆڤەکردنی ماستەرنامە بە درێژی دێمە سەر ئەو باسە).

عەرەبی سەردەمی خیلافەتی ڕاشدی، بۆ گەیاندنی پەیامی خودا بوو، بەڵام هەر لە سەردەمی: (ئەمەوی) و عەباسی و دەوڵەتی نەتەوە)دا، نیشتەجێکردنی عەرەب هەر لە کوردستان نەبوو، بەڵکو باشوور و ناوەندی عیراقی گرتەوە . لە پاشان ئەو پرۆسەیە تورکمانیشی گرتەوە.

دکتۆر کەمال مەزهەر لە (ل٨٣-٩٤) ی کتێبی: (كركوك و توابعها...) باسی گواستنەوەی عەرەب و تورك بۆ کوردستان دەکات .

(تورك) لە سەردەمی: (ئەمەوی) و (عەباسیدا)، بووە ژمارەیەك لە کێشەکان، بۆیە لە کێشەکانی دەوڵەتی عەباسی، حزووری تورك لە هاوکێشەکەدا، بۆ پشتگیری لایەك بووە، دژی لایەکەی تر .

دکتۆر مەزهەر لە (ئیبن خردازبە) لە (المسالك و الممالك) دەڵێت : "ان والي خراسان عبدالله بن طاهر كان يرسل الى العراق الفي تركي سنويا من مختلف مدن تركستان ، وذلك تنفيذا للاوامر الصادرة اليه من الخليفة."

کەواتە: هەژموونی (تورك) لە هاوکێشەکانی دەوڵەتدا، بۆ یەکلاکردنەوەی پرسەکان بوو .ئەوەتە دکتۆر مەزهەر لە (العقد الفريد) دەگوازێتەوە: ان هارون الرشيد ادخل التركمان في جيشه و حرسه الخاص . و كان معظم حرس المأمون منهم ايضا ، كما جند المعتصم جيشا منهم ، اسكنهم في سامراء سنة ٢٢١ للهجرة -٨٣٦-للميلاد- ، و في عدد من المواقع الستراتيجية .تعزز هذا النمط من وجود التركمان في العصر البويهي -اواسط القرن العاشر حتى اواسط القرن الحادي عشر للميلاد- ، فقد كان غالب جنود الدولَة البويهية من الديلم و الترك ."

# ئایا بە ڕاستی
# شارەکانی ئەقلیم جیبال
# بە ناوی کوردی بوون ؟

## شوناسی کوردی چەند شارێك لای گەڕیدە موسلمـــانەکان:

مێژووی دەرکەوتنی بیرۆکەی گەڕیدەبوون لە نێو موسڵماناندا، زۆر لە دوای دەرکەوتنی ئیسلام بووە . چەند شارێك لە مێژووی سیاسی کورددا جێگەی مشتومڕ و نکۆلیکردن بووە لای نەتەوەکانی دراوسێ .

کەرکوك یەکێ لەو شارانەیە، کە عەرەب و تورکمان بە هی خۆیان دەزانن. کەرکوك لە سەردەمی (ئەتابکی) لە ماوەی (١١٢٨) هەتا (١٢٣٣) بووە بەشێك لە ئیمارەتی هەولێر، پاش مردنی (موزەفەر کەوکبی)، باشووری کوردستان بووە دوو ویلایەت لە (١٢) ولایەتەکەی عیراق - (ل٢٤).

هەروەها لە دوای داگیرکردنی بەغدا، ناوی کەرکوك دەرکەوت، بە کورتی: لە ماوەی حوکمی ئیسلامی، لەگەڵ هەولێر ناوی هاتووە، نەك ناوی کەرکوك بە تەنیا، هەر لەو ڕوانگەوەشەوە، جیوگرافیناسی موسڵمانی ئەوسا، ئاماژەیان پێنەکردووە .

دکتۆر کەمال مەزهەر لە (ل١٨)ی (کرکوك و توابعها...) دەنووسێت : ((کەرکوك لە سەدەی چواردە بە ناوی: (کەرخینی) ناسرابوو . (قەلقەشندی) سەدەی (پازدە) لە (ئیبن فەزلەلای عومری) دەگوازێتەوە، کە وڵاتی: (کەرخینی) و (داقوق) تایفەیەکی لێیە بە ناوی: (کورد)، کە ژمارەیان لە

سەرەوەی (٧٠٠) کەسەوەیە و ئەمیری خۆیان هەیە.."٠

ئیبن بەتوتە لە (سەفەرنامەکە)یدا، جگە لە باسکردنی وڵاتی کورد و داب و نەریتی کوردان، گەواهیدانی کوردیبوونی شاری: (کەرکوك و موصڵ و ماردین و شەنگال) دەدا . بەلازری جیوگرافیناس لە (ل١٨٢) کتێبی (فتوح البلدان) دەربارەی شارێکی وەك: (موصڵ) دەنووسێت : "شاری موصڵ لە سەدەی (پازدەهەمدا) شارێکی سەرجەم کوردنشین بووە و، تەنیا چەند هۆزێکی عەرەب لە دەورویەرەکەی هەبوونە ."

هەر قەلقەشەندی ناوی شاری: (موصڵ و خانەقین و کەرخینی - کەرکوك) وەك وڵاتی کوردان هێناوە.

# ئەنجامگیریی

پاش توێژینەوە و وردبوونەوە لە پرسی (فتوحات) بە گشتی، لە بەشەکانی کوردستان بە تایبەتی، ئامانجگەلێکمان پێکاوە، لەوانە:

## ئامانجەکانی توێژینەوەکە:

١- فتوحاتی ئیسلامی بە میکانیزمی هێز دروستبوو، وەك بەرگریەك لە ئەمنی دینی دەوڵەت، هەروەها فتوحاتی هەرێمە کوردییەکان تەحصیل حاصل بوو، ئەگەرنا خەلیفە عومەر بە دەقی: (واقدی و طبری و ئیبن ئەسیر ..) لەگەڵ فتوحاتی: ئەقلیم جیبال( کوردستان ) دانەبوو٠

٢- ماهیەتی ئایەتی: (لا اکراه فی الدین) سەپاندنی عەقیدەی ئیسلامی نییە، بەڵکو خودی ئایەتەکە دینی تر دەخوێنێتەوە، ئەوەی بزرە لە هاوکێشەکە، شوناسی پەروەرگاری (الله) یە، ئیسلام ویستی (الله) بە دینەکان بناسێنێ، نەك خۆی بسەپێنێ، ڕەوشی فرە دینی کوردستان، هەر لە سەرەتای ئاشنابوونی کورد بە ئیسلام باشترین بەڵگەیە٠

٣- کورد لە (٥٤٩ پ.م) هەتا (٦٥١) میلادی شوناسی قەومی خۆی لە نێوان: (فارس و یۆنانی و پارس ( ئەشکانی )) ونکرد، ئیسلام بوو ئەو شوناسە کوردیەی بۆ زیندووکردەوە و هەر ئەویش بوو، ( کورد )ی وەك (کورد ) بە جیهان ناساند، تەرجەمەکردنی کتێبەکەی (ئەردەشێر) لای (بەلازری)، بەڵگەیەکی حاشاهەنەگرە .

٤- کوردستان لە ماوەی ئەو (١٣٠٠) ساڵەی پێش ئیسلام، (٦) هەرێم بوو، کوردەکەی، (زەردەشتی) و (مانی) و (جولەکە) و (مەسیحی) بوو، ئیسلام نەك هەر وڵاتەکەی "وڵاتی کوردان"، کردەوە یەك، بەڵکو زۆربەشی کردە خاوەن یەك دین.

**هەروەها لە بارەی گریمانەکانی توێژینەوەکە :**

٥- گوتاری قورئان وەك دوا تێکستی ئاسمان و، ڕەوشی داگیرکراوی وڵاتی کوردان، وەیکرد کورد لە زۆربەی شوێنەکان بە صوڵح و ئاشتی موسڵمان ببێت، بۆیە پاش ڕوخانی دەسەڵاتی عەبباسی، کورد وازی لە ئیسلام نەهێنا، چونکە ستەمی زۆری دیتبوو، لەوانە: ستەمی ساسانی .

٦- عالەمیبوونی قورئان و عەولەمەبوونی بێ سڕینەوە و تواندنەوە، وەیکردووە ڕقی لە نەتەوەی تر نەبێتەوە، چونکە ئەو پێشتر، بە پرۆسەی تواندنەوە داچوو بوو .

٧- دەرکەوت بەشێك لە کوردەکانی قەڵەمڕەوی ساسانی، لە هەردوو شاری: (جەلەولا) و (نەهاوەند)، بەرگریەکی سەرسەختانەیە لە زەردەشتیەت کردووە، هەرچی کوردەکانی بندەستی ڕۆمی بوون، زۆربەی هەرەزۆری، بە صوڵح و ئاشتی تەسلیم بوون، بە جۆرێك بستەخاکێك لە هەرێمی (جەزیرە) نەما لە خەلیفایەتی (عومەری کوڕی خەتاب) (١٣-٢٤) بە صوڵح و ئاشتی فەتح نەکرێت .

٨- لە پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامی، ئایەتی نەتەوەی جیا و زمان جیایی وەك دوو ئایەتی قورئان بە کردەوە کران، بەڵام ئەو دوو ئایەتە لە سەردەمی ناسیۆنالیستی عەرەبی تەواو ژێر پێیخران .

٩- هیچ ئایەت و فەرموودەیەك نیە، بڵێن: کورد، با بە زمانی خۆی نەنووسێت، بەڵکو ئەوە کەمتەرخەمی ڕۆشنبیری کورد بووە، نەك قورئان . گوناهی

قورئان چییە، (ئیبن خەلەکان و شارەزووری...)بە زمانی عەرەبی کتێبەکانیان نووسیوە، شەرەفخانی بدلیسیش لە سەدەی (شازدە) (شەرەفنامە)ی بە فارسی نووسیوە!!

لەلایەکی دی، ئەو پرسە پەیوەندی بەهەژموونی دەوڵەتدارییەوەیە، وەیە نەك ناسیۆنالیزکاری و دینداری، ئەگەر وا نەبوایە، "فارسی" و "عوسمانی" بە چ ئایەتێك لە وڵاتی موسڵمان نشین بوونە زمانی دەوڵەت، چونکە ئەوان هیچ جیاوازیان لەگەڵ" کوردی نییە.

١٠- هەر ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسەکان بوون لە ڕێگای بڵاوکردنەوەی چەندان گومان، گومانیان لای ڕۆناکبیری کورد دروستکرد،ئەگەرنا بیانووی موسڵمانبوونی کورد لە بیانووی موسڵمانبوونی عەرەب زۆر بەهێزتر بوو، کورد (١٣٠٠) ساڵ بوو خۆی و خاکی داگیرکراو بوو، کەچی عەرەب دەسەڵاتی خۆی هەبوو لە مەککەدا!

١١- وروژاندنی پرسی بەشەڕ موسڵمانبوونی کورد، گرەوێکە لە سەر ئەسپی تۆپیو دەکرێت، چونکە لەلایەك کورد داگیرکراو بوو، بۆیە کورد دەوڵەتی نەبوو، تا بەرگری لێ بکات، لە زۆربەی هەردوو کوردستانی: (ساسانی) و (ڕۆمی)، کورد بە ئاشتی، یا صوڵح موسڵمان بوو، لە لایەکی دی ئەوە عەرەب بوو شەڕی: (بەدر و ئوحد و خەندەق و ...)ی لە دژی پێغەمبەر کرد.

١٢- سنوور و ناوی: (عێراقی عەجەمی و ئەقلیم جیبال و ئەقلیمی جزیرە و زۆزان و ئەرمینیا) لای مێژوونووس و جیۆگرافیناسە موسڵمانەکان وەك یەك نیین . لە بەری ساسانی، شارەکانی عیراقی عەجەمی و بەشێك لە شارەکانی ئەقلیم (جزیرە) پێش ئەقلیم جیبال ڕزگار کران، هەروەها لە بەری کوردستانی (ڕۆم)یش، شارەکانی ڕۆژئاوای کوردستان لە (شام) پێش شارەکانی ئەوبەری باکوور ڕزگار کران .

١٣- زۆربەی شارەکانی کوردستان لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامی، هەڵگری شوناسی کوردی نەبوون، بەڵکو هەڵگری ناوی: (ئاشووری و یۆنانی و ئەشکانی و ساسانی) بوون، بۆیە، یا ناوە کوردییەکەی بۆ گەڕاوەتەوە یا لێنراوە، یا لەو (٤-٥) زمانەی پێشوو کراون بە عەرەبی، نەك بەعەرەبکراون !

١٤- تەعریب بە واتای: بەعەرەبکردنی خورتی، تەواو پێچەوانەی دەقی قورئانە، چونکە لەو پرۆسەیەدا سڕینەوەی شوناس و کەلتوور هەستپێدەکرێت، ئەمەش دژ بە ئایەتی جیاوازی نەتەوە و (زمان)ە، هەروەها لەو ئایاتانەی باسی "لسانی عەرەبی" دەکرێت، مەبەستی قورئان زمانی دەقی قورئانە، نەك نەتەوەی عەرەب.

١٥- چەندان کتێب لای ڕۆژهەڵاتناس و سیکیولەری کوردی نووسراون، بەڵام لە بەردەم نەشتەر و پرانسیپەکانی ڕەخنەی ( ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلام)، وەك هەوری پایز و بەفری بەهار لە هاویندا هەم پەرشبوونەتەوە هەم توانەتەوە.

# سەرچاوەکان

١- فائزة محمد عزت، الكرد في اقليم الجزيرة و شهرزور في صدر الاسلام ١٦ﻫ ١٣٢ﻫ/٦٣٧-٧٤٩م، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين ١٩٩٢.
٢- فرست مرعي اسماعيل، الكرد مصادر و معالم تاريخهم في صدر الاسلام مرحلة الفتوحات، ١٦ﻫ-٢١ﻫ، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب جامعة الخرطوم ١٩٩٧.
٣- الامارات الاسلامية في بلاد الكرد في العصر العباسى الثانى ٣٥٠-٥١١ﻫ رسالة دكتورا غير منشورة كلية الاداب جامعة صفاء ٢٠٠٠ .
٤- حسام الدين على غالب، الكرد في الدينور و شهرزور رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٧٥.
٥- كلثومة جميل عبدالواحيد، الحياة الدينية و الاجتماعية و الاقتصادية لبلاد الكرد في عهد الساسانيين (٢٢٤-٦٣٠)م، كلية الاداب جامعة صلاح الدين- اربيل ٢٠٠٢.

**گۆڤـــار و ڕۆژنـــامەکان:**

١- سەلام، ئایا ڕاستە ئیسلام کوردستانی داگیرکردووە؟! گۆڤاری ئیسلام ژ(٢-٣) (هەولێر ١٩٩٣)
٢- ئارام عبدالسلام، ڕەوشی کورد پێش ئیسلام، ڕۆژنامەی دەنگی غەریبان ژمارە (١) (لەندەن: ٢٠٠٢)
٣- فوئاد ڕەشید، ئامادەبوونی ناونیشان لە پرۆسەی نووسیندا، ڕامان، ژ(٦٨) ٢٠٠٢.

**سەرچاوە عەرەبیەکان:**

١- القرآن الكريم.

٢- ابن الاثير، الكامل في التاريخ، دار الفكر، (بيروت:١٩٧٨)

٣- الاصطخري، المسالك و الممالك، دار العلم، (سوريا:١٩٦١)

٤- البلاذري، فتوح البلدان، دار الكتب العلمية، (بيروت:١٩٧٨)

٥- ابن حوقل، صورة الارض، مكتبة الحياة، (بيروت:١٩٧٩)

٦- الطبري، تاريخ الامم و الملوك، منشورات مؤسسة الاعلمى للمطبوعات (بيروت:١٩٩٨)

٧- ابوالفداء، كتاب تقويم البلدان، دار الطباعة السلطانية، (ثارس١٨٥٠)

٨- ابن الفقيه، مختصر كتاب البلدان، دار احياء التراث العربي، (بيروت:١٩٨٨)

٩- قدامة بن جعفر، الخراج و الصناعة الكتابة،(بغداد ١٩٧٩)

١٠- ابن كثير، البداية و النهاية، دار احياء التراث العربي (بيروت: ١٩٩٧)

١١- المقدسي، احسن التقاسيم، دار احياء التراث العربي (بيروت:١٩٨٧)

١٢- ياقوت الحموي، معجم البلدان، دار صادر، (بيروت: ١٩٧٧)

١٣- بروكلمان، كارل، تاريخ الشعوب الاسلامية، دار العلم، (بيروت:١٩٨١)

١٤- كمال أحمد عادل، الطريق إلى المدائن، دار النفائس، (بيروت:١٩٧٢).

١٥- سقوط المدائن و نهاية الدولة الساسانية، دار النفائس، (بيروت:١٩٨١).

١٦- محب الله ن، موقع الاكراد و كردستان تاريخيا و جغرافيا و حضاريا، (١٩٩١)

١٧- مصطفى، عبدالله، امجاد الاكراد، (اربيل:٢٠٠٢)

١٨- هاجاني، حازم، صفحات من تاريخ الكرد و كردستان، (اربيل:٢٠٠٢)

# پێڕستەوشە

ئ

ا



ب



پ

د



ر



ز



س

## ش

ف



ق



ك

گ



ل



م

# ناوەڕۆك

بەشی دووەم :



بەشی سێیەم

بەشی چوارەم

بەشی پێنجەم

بەشی شەشەم

# کوردستانی ساسانی و رۆمی

## لە سەردەمی پێغەمبەرو خەلیفەکانی ڕاشیدین دا

ئەم کتێبە، هەر تەنیا گێڕانەوە نیە، بەڵکو توێژینەوەیەکی مێژوویی و شرۆڤە کردنیشە بە پێوەری قورئان

نزیکەی بە قەد سەدەیەك دەبێت، گەر زیاتر نەبێ قەڵەمداری کورد قسە لە سەر پرۆسەی فتوحات دەکات و دەکات . ئەو قسەکردنە هەندێك جار بە ئاقار و تخوبی دەقی قورئانیش دادەچێت !لە دوای ڕاپەڕین ئەو تەوژمە هەر لە دەرەوە نەمایەوە، بەڵکو سنوری زانکۆشی بڕی بە تایبەتی لە ژێر ئیدارەی کوردی، فتوحات بووە بابەتی چەند ماستەرنامەیەك.

بەندە لە ساڵی ١٩٩٣ بە وتارێك دەرگای ڕەخنەی (ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلامی)-م کردەوە هەتا ٢٠٠٣ شتێکم لەسەر ئەو بابەتەوە نەنووسی هەتا لەو ساڵەوە بە کتێبێك هاتمەوە مەیدانەکە، هەندێ مامۆستا لە پێش و پاشی منەوە لەو ڕەخنانەی لە فتوحات دەگیرا بە جواب هاتن بەتایبەتی مامۆستا حەسەن مەحمود و فازل قەرەداغی و کەسانی دی...، بەجۆرێك چەندان کتێبیان لەسەر ڕەخنەی (ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلامی) بڵاوکردەوە بەتایبەتی کتێبی (کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی) ی مامۆستا حەسەن پرۆسەی ڕەخنەی (ڕەخنەی فتوحاتی ئیسلامی)بە کورد ئاشناتر کرد.



نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی ٣٠ مەتری - تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice
11,000 دینار